ناوی کتێب: کۆمار
نووسینی: ئەفلاتوون
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: د. محەمەد کەمال
بابەت: فەلسەفە
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: بەختیار ئەورەحمان
هەڵەچنی: سارا عەبدوڵڵا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٤٠٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: (١٠٣٤)ی ٢٠٠٩
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان -سلێمانی

www.serdam.net
www.serdam.info
www.serdam.org

سەرچاوە:
Plato, «Republic», in PLATO : COMPLETE WORKS, translated by G. M. A. Grube, rer. C. D. C. Reeve, edited by John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Lndiana : Lndianapolis, 1997.

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

ئـەفـلاتـوون تــەواوکــەری ســەرەتـایـە. هـایدیگـەر١ ئـەفـلاتـوون خوێندکاری سـوکـرات و مامۆستای ئەرستۆ بـووە. بـیروبـاوەڕە فەلسەفیەکانی لەنێو سیستەمێکی فەلسەفیدا، کە ئەمڕۆ بە فەلسەفەی ئەفلاتوون یان ئەفلاتوونی نـاوزەد کـراوە، دامــەزراوە. ئەفلاتوون لە تەمەنی لاوێتیدا سوکراتی ناسیوە و کەوتۆتە ژێر کاریگەرێتیی بـیرکـردنـەوەی ئـەو فـەیلـەسـووفـە. کاتێک سـوکـرات بـە فەرمانی دەوڵـەت دەکوژرێت، ئەفلاتوون تەمەنی بیست و نۆ ساڵان دەبێت.

ئەفلاتوون لە خێزانێکی ناودار و دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵاتی ڕامیاری لە ساڵی (٤٢٨)ی پێش زایینی لەدایک بـووە. باوکی، کە نـاوی (ئەریستۆن) بـووە، دەگەڕێتەوە بۆ سەر بنەچەی پاشاکانی ئەسینا. دایکی ئەفلاتوون، (پێریسیتۆن)، خوشکی (چارمەدیس)ی پاشای (ئۆلیگارک)ی بـووە، کە پێش جەنگی پیلۆپۆنیس (٤٠٤ پ ز) فەرمانڕەوایی کـردووە. هەروەها ئەفلاتوون دوو برای بەناوی (ئـەدیـمـەنـتـۆس) و (گـلاوکـۆن) و خوشکێکی (پـۆتـۆن) هـەبـووە٢. ئەفلاتوون منداڵ بووە باوکی مردووە. دایکی شووی کردۆتەوە بە (پیریلامیس)، کە لە سەردەمی (پیریکلیین)دا دەسەڵاتێکی ڕامیاریی گەورەی هەبووە.

ئەفلاتوون، لە تەمەنی لاوێتیدا ویستویەتی لە دەسەڵاتی ڕامیاری نزیک بێتەوە. بێگومان ئەم کارەش لەبەر دەسەڵات و ڕۆڵی خێزانەکەی ئاسان بووە، تەنانەت خزمەکانی هانیان داوە ڕوو لە ژیانی ڕامیاری بکات.

بەڵام لەگەڵ کوشتنی مامۆستا و هاوڕێکەیدا (سوکرات) بە دەستی ئەو دەسەڵاتەی خزمەکانی ئەفلاتوون بەشدارییان تێدا کردووە نائومێد دەبێت، لەگەڵ خوێندکارەکانی دیکەی سوکراتدا لە ترسی زیندانیکردن لەلایەن دەوڵـەتـەوە ڕووی کردۆتە میگارا و بۆ ماوەیەکی کورت لـەوێ ژیـاوە. دوایـی بۆ ئیتالیا و میسر چووە و لە ساڵی (٣٨٨ پ ز) بۆ ئەسینا گەڕاوەتەوە. فێرگەیەکی بەناوی ئەکادیمیا لەو شارەدا دامەزراندووە. دامەزراندنی ئەکادیمیا دەستکەوتێکی گەورە بووە بۆ ئەفلاتوون. لەهەمانکاتدا ئەکادیمیا بۆ خوێندنی فەلسەفە و زانستەکان لە مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوادا یەکەم خوێندنگایە. ئەم خوێندنگایە لەنێو باخچەیەکدا، کە بۆ ڕێزلێنان لە (ئەکادیمۆس)ی قارەمانی نێو ئەفسانەی یۆنان دروست کرابوو دامەزراو لەسەر ناوی قارەمانەکەش بە ئەکادیمیا ناوزەد کرا. ئەمڕۆ زاراوەی ئەکادیمیا و خوێندنی ئەکادیمی بۆ قۆناغی فێربوونی باڵا لە زانکۆکاندا بەکار دێت.

ئـەفـلاتـوون لـەگـەڵ دامـەزرانـدنـی ئەکادیمیادا ژیـانـی خـۆی بۆ وانەگوتنەوە و نووسین تەرخان کرد. نزیکەی چل ساڵ ئەکادیمیای بەڕێوە برد. لە ساڵی (٣٦٧ پ ز)، ئەو کاتەی ئەفلاتوون تەمەنی شەست ساڵان بوو (دیۆنسیس)ی یەکەم لە شاری (سیراکوس) مرد، کوڕەکەی بەناوی (دیۆنسیسی دووەم) کرا بە جێگر و سەرۆکی شارەکە.

دیـۆنـسـیـسـی دووەم لاوێـکـی نـەخـوێـنـدەوار و گـەمـژە بـوو. داوا لـە ئـەفـلاتـوون دەکـرێـت ببێت بـە فـێـرکـەری و ئـەویـش داواکارییەکەی پەسەند دەکات. بۆ ئەو مەبەستە ئەفلاتوون بۆ شاری (سیراکۆس) لە (سیسلی) ئیتاڵیا دەڕوات٣. گوایە ئەفلاتوون ویستویەتی فەلسەفە ڕامیارییەکەی خـۆی بخاتەگەر و بـە پـەروەردەکـردنـی دیۆنسیس ئەو دەوڵەتە دابمەزرێنێت، کە بە بۆچوونی ئەو بەختەوەری و دادوەری بۆ کۆمەڵ مسۆگەر دەکـات. لە سـەرەتـاوە پلانەکەی ئەفلاتوون بەرێکی بەڕێوە چووە و پاشا لاوەکە زۆر لە ئەفلاتوونی مامۆستایەوە نزیک بووە. پاش چەند مانگێک ئەم پەیوەندییە شێواوە و ئەفلاتوون بۆ ئەسینا گەڕاوەتەوە، بەڵام دیۆنسیس پەیوەندییەکەی خۆی نەپچڕاندوە و بـەردەوام بە نامە پەیوەندی بە ئەفلاتوونەوە کردوە. لەبارەی خوێندن و فێربوونەوە ئاگاداری کردووە. لە ساڵی

(٣٦١)دا ئەفلاتوون جارێکی دیکە بۆ سیراکۆس ڕۆیشتووە و نزیکەی ساڵێک لەوێ ماوەتەوە. ئەم جارەیان پەیوەندیی نێوان ئەفلاتوون و دیۆنسیس بەتەواوی دەشێوێت. دیۆنسیس ئەفلاتوون دەکات بە کۆیلە و لە بازاڕ دەیفرۆشێت. (ئەرگیتاس) کۆنە هاوڕێی ئەفلاتوون بەم کارە دەزانێ و ئەفلاتوون لە کۆیلەیی ڕزگار دەکات و لە ساڵی (٣٦٠)دا بۆ ئەسینای دەنێرێتەوە.٤ لەو کاتەوە ئەفلاتوون لە ئەکادیمیا دەمێنێتەوە و ئەسینا بەجێ ناهێڵێت.

لە ساڵی (٣٨٤ پ ز) دا لە تەمەنی هاشتا و هەشت ساڵیدا ئەو کاتەی لەسەر دوا دایەلۆگ بەناوی (یاساکان) کار دەکات دەمرێت. ئەفلاتوون لە شێوەی دایەلۆگدا، کە گفتوگۆیە لەنێوان چەند کەسێکدا، نووسیویەتی. بێجگە لە دایەلۆگی یاساکان، کە درێژترین و دوا نووسراوی ئەفلاتوونە، سوکرات پاڵەوانی هەموو دایەلۆگەکانە. هەروەها ئەفلاتوون یەکێکە لەو نووسەرانەی سەردەمی یۆنانی کۆن، کە هەموو بەرهەمەکانی (٤٦ دایەلۆگ) و (١٣ نامە)ی بە دەستی ئێمە گەیشتوون و نەفەوتاون. ڕەسەنیەتی دایەلۆگەکانیش سەلمێنراون، بەڵام بێجگە لە نامەی حەوتەم مێژوونووسانی فەلسەفە گومان لە ڕەسەنیەتی نامەکانی دیکەی ئەفلاتوون دەکەن. لەو باوەڕەدان ئەفلاتوون ئەو نامانەی نەنووسیوە. سوکراتیش دوو ڕۆڵی سەرەکی لە سەرجەمی دایەلۆگەکاندا هەیە؛ لەنێو ئەو دایەلۆگانەی لە سەرەتای ژیانی فەلسەفی و نووسینی ئەفلاتووندا نووسراون سوکرات لە گفتوگۆکاندا بۆچوونە فەلسەفیەکانی خۆی دەردەبڕێت. ڕۆڵی سوکرات، بەو جۆرەی ئەفلاتوون نووسیویەتی، گێڕانەوە و دەربڕینی بیرکردنەوەی سوکرات خۆیەتی و بە بۆچوونی فەلسەفی ئەفلاتوون دانانرێت. لە دایەلۆگەکانی دواییدا ئەفلاتوون سوکراتی وەکو پاڵەوانی ڕووداو و گێڕانەوەی بەسەرهات داناوە. لە زمانی سوکراتەوە بۆچوونە فەلسەفیەکانی خۆی دەربڕیوە. دایەلۆگەکانیش گەورە و بچووکن. دایەلۆگی کۆمار یەکێکە لە دایەلۆگە گەورەکان و سەردەمی پیری ئەفلاتوون و قۆناغی ناوەندی نووسینەوە، بەڵام بەشی یەکەمی کۆماری پێش ئەم قۆناغە نووسیوە و دوایی بە دەسکارییەوە خستویێتیە سەر بەشەکانی دیکەی ئەم دایەلۆگە. لەم دایەلۆگەدا، کە بە مشتومڕ لەسەر

دادوەریی دەستپێدەکات، ئەفلاتوون توانیویەتی فەلسەفەی پەروەردە، ڕامیاری و ئەپستمۆلۆجی خۆی بە خوێنەر بناسێنێت. لەم دایەلۆگەدا سوکرات لەگەڵ دوو برای ئەفلاتووندا (ئەدیمەنتۆس و گلاوکۆن) لەسەر کێشەی دادوەری دەکەوێتە گفتوگۆ. لەوێوە (ئەفلاتوون لەسەر زاری سوکرات) باسی دادوەری و نـادادوەری، جۆرەکانی ڕژێمی ڕامیاری و ڕۆڵی فێربوون و پەروەردە بۆ سەقامگیرکردنی دادوەری و فەرمانڕەواییکردنی فەیلەسووفەکان و گەلێک کێشەی گرنگی دیکە دەکات. دایەلۆگی کۆمار، کە یەکێکە لە گرنگترین نووسراوی ئەفلاتوون بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕاوە. منیش بەپێویستم زانی خوێنەری کورد ئەم دایەلۆگەی بە زمانی کوردی لەبەردەستدا بێت و سودی لێ وەرگرێت. ئەم دایەلۆگەش لە زمانی ئینگلیزییەوە لە وەرگێڕاوەکەی (گروبە و ریڤ)ەوە وەرم گرتووە، لەگەڵ وەرگێڕاوەکانی (بنیامین جۆویت) و (ئار. ئی. ئالن)یشدا بەراوردم کردوە تاکو لە واتا و مەبەستی ئەفلاتوون باشتر تێبگەین. من پەراوێزەکانم بۆ ئەم وەرگێڕاوە داناوە و لە پەرتووکە ئینگلیزییەکەدا نییە. لە هەندێک شوێندا بۆئەوەی لە زمان و مەبەستی ئەفلاتوون نزیکتر ببینەوە، بە پێویستم زانیوە دێڕێک یان چەند وشەیەک بخەمە سەر وەرگێڕاوەکە، کە لە دایەلۆگەکەدا دەرنەبڕاون. بۆئەوەی خوێنەر بزانێت ئەو دێڕ و وشانە لە دایەلۆگەکەدا نین و وەرگێر خۆی دایناون لەنێو ئەم جۆرە کەوانەیەدا (.....) دامناون.

لە کۆتاییدا حەز دەکـەم سوپاسی (تابان کەمال) بکەم، کە بۆ ئامادەکردنی ڕەشنووسەکە بۆ لەچاپدان ئەرکی کێشا. سوپاسی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەکەم، کە ئەم وەرگێڕاوەیان خستە بەر ڕۆشنایی بوون و بۆیان لەچاپ دام.

د. محەمەد کەمال
زانکۆی مالبۆرن
٢٠٠٨



دوێنێ لەگەڵ (گلاوکۆن)ی کوڕی ئەریستۆن بۆ پیرایۆس ڕۆیشتم. نیازی نوێژکردنم بۆ ئەو خاتوو خواوەندەی ئەو شارە هەبوو. هەروەها حەزم کرد یادکردنەوەی خەڵکی بۆ ئەو خوایە ببینم، چونکە بۆ یەکەمجار ساز دەکرا ٥. بە بۆچوونی من یادکردنەوەکە و کەژاوەکەش لەلایەن دانیشتووانی ئەو شارەوە و تراشینیەنەکان (شوێنکەوتووانی ئەو خاتوو خوایە) نایاب بوو.

پاش بینینی کەژاوەکە و نوێژکردن بەرەو شاری ئەسینا گەڕاینەوە. پۆلیمارکۆس لە دوورەوە ئێمەی بینی و کۆیلەکەی نارد بەدواماندا. کۆیلەکە لە پشتەوە جلەکەی گرتم و گوتی: پۆلیمارکۆس دەیەوێت چاوەڕوانی بن. ئاوڕم دایەوە و پرسیم: کوا پۆلیمارکۆس؟ گوتی: بەڕێوەیە بۆ لای ئێوە دێ، تکایە چاوەڕوانی بن. گلاوکۆن وەڵامی دایەوە و گوتی: باشە، چاوەڕێی دەکەین. پۆلیمارکۆس گەیشتە لامان. ئەدیمەنتۆس برای گلاوکۆن و نیکراتۆسی کوڕی نیسیاس و چەند کەسێکی دیکەی لەگەڵدا بوو. دەردەکەوت ئەوانیش بۆ بینینی کەژاوەکە ڕۆیشتبن. پۆلیمارکۆس گوتی: وا دیارە بۆ ئەسینا دەگەڕێنەوە.

منیش گوتم بە ڕێگاکەدا وا دیارە. ئەو گوتی: دەزانیت ئێمە چەند کەسین؟ بەڵێ دەزانم.

کەوابوو، بیسەلمێنە لە ئێمە بەهێزتریت، یان دەبێت نەڕۆیت و لەلامان بمێنیتەوە. ئایا ڕێگەچارەیەکی دیکە هەیە ڕازیت بکەین تاکو برۆین؟چۆن ڕازیمان دەکەیت ئەگەر گوێت لێ نەگرین؟ گلاوکۆن گوتی: بێگومان وایە.

کەوابوو، گوێ ناگرین. ئەدیمەنتۆس گوتی: دەزانیت ئەمشەو پێشبڕکێی مەشخەڵهەڵگرتن بە سواری ئەسپەوە بۆ یادکردنەوەی خاتوو خواوەند ساز دەکرێت؟ من گوتم: لەسەر پشتی ئەسپ؟ ئەمە شتێکی نوێیە. بەڕاست ! لەسەر ئەسپ پێشبڕکێ دەکەن؟ بەڵێ، شەوەکە بۆ ئەو

کایەیە دانراوە. پاش نانخواردنی ئێوارە دەڕۆین پێشبڕکێکە دەبینین. لەوێ لاوەکان لە دەورمان کۆدەبنەوە و باس دەکەین. لەبەرئەوە مەڕۆ لێرە بمێنەرەوە.

گلاوکۆن گوتی: لەوە دەچێت بمێنینەوە. منیش گوتم: مادامەکی وا بیر دەکەیتەوە دەمێنینەوە.

بۆ ماڵی پۆلیمارکۆس ڕۆیشتین. هەردوو براکەی پۆلیمارکۆس (لیسیاس و ئێتیدمۆس)، تراسیماکۆسی شاری چالسیدۆن و چارمەنتیدسی شاری پەیانیا و کلیتۆفانی کوڕی ئەرستۆنیمۆس لەوێ بوون. هەروەها سیفالۆسی باوکی پۆلیماکۆسیش لەوێ بوو. پاش ماوەیەکی زۆر بینیمەوە، پیر ببوو. پاش قوربانیدان بۆ خوا، لەنێو حەوشەکەدا لەسەر کورسیەک دانیشتبوو، سەرینێکیشیان خستبووە پشت سەری. ڕیزێک کورسی بە خڕی لە دەوریا دانرابوون. ئێمەش لەسەریان دانیشتین.

سیفالۆس منی بینی و بەخێراتنی کردم و گوتی: سوکرات، تۆ زوو زوو سەردانی پیرایۆس ناکەیت تاکو بتبینین- ئەگەر بمتوانیایە بە پێ بۆ ئەسینا بێم، نەمدەهێشت تۆ بۆ ئێرە بێیت. من بۆ لای تۆ دەهاتم. بەڵام، وەکو دەمبینیت، پێویستە تۆ بۆ ئێرە بێیت. باش دەزانیت چەند حەزم بۆ چێژ و خۆشی لەش کەم بێتەوە ئەوەندەش ئارەزووم بۆ گفتوگۆ و باسکردن زیاد دەکات. بە قسەم بکە و لەگەڵ ئەم لاوانەدا بمێنەرەوە و بەردەوامیش، وەکو چۆن بۆ لای هاوڕێ و خزمەکانت دەڕۆیت سەردانی ئێمەش بکە.

گوتم: سیفالۆس، بێگومان وا دەکەم. لەگەڵ کەسانی بەتەمەن حەزم لە گفتوگۆیە. پێویستە لەبارەی ئەو ڕێگایەی بڕیویانەو ئێمەش دەیگرینە بەر پرسیاریان لێ بکەین. دەبێت بزانین ڕێگایەکی سەختە یان ئاسان. حەزدەکەم بیروباوەڕی تۆ لەبارەی ئەو ڕێگایەوە بزانم، چونکە تۆ بە قۆناغێک گەیشتوویت، کە شاعیرەکان ناوی دەنێن (پێش دەرگای تەمەنی پیری). ئایا تەمەنێکی سەختە؟ چی لەبارەیەوە دەڵێیت؟٦. بە خوا، سوکرات بەڕاستی پێت دەڵێم چۆن بیری لێ دەکەمەوە. ئێمە چەند کەسێکی هاوتەمەنین، وەکو دەڵێن (ئەوانەی لە یەکدی دەچن خوا کۆیان دەکاتەوە) پێکەوە دادەنیشن٧. زۆربەمان گلەیی لە کەمبوونەوەی

چێژە خۆشەکان دەکەین، یادی سێکس و خواردنەوە و ئاهەنگێڕانی ڕۆژانی لاوێتی دەکەینەوە. هەندێکجاریش لەم بارودۆخەی ئێستامان تورە دەبین. هەندێک گلەیی بە سەرچاوەی گەلێک خراپە دادەنێن، بەلام ئەوان ئاماژە بۆ هۆیە ڕاستەقینەکە ناکەن. ئەگەر پیری هۆ بووایە، دەبوو منیش وەکو ئەوان تووشی ئەو ناخۆشییانە ببوومایە. من ئامادەی ئەو کۆڕە بووم، کە یەکێک پرسیاری لە سۆفۆکلس کردو گوتی٨: ئێستا لەگەڵ سێکسدا چۆنیت؟ دەتوانیت لەگەڵ ژندا بخەویت؟ ئەویش لە وەلامدا گوتی: «خۆشحالم لەوەی، وەکو چۆن کۆیلەیەک لەژێر دەستی خاوەنێکی زۆردار ڕادەکات، من ڕزگارم بووە». هەستم دەکرد ئەو ڕاست دەکات و لەوە زۆرتر یەخەمان ناگرێ. سۆفۆکلیس گوتەنی لەو خاوەن کۆیلە زۆردارە ڕزگارمان بووە. سەبارەت بە مامەڵەکردنی کەسوکاریش لەگەڵ پیرێکدا پەیوەندی بە تەمەنەکەوە نییە. دەکەوێتە سەر چۆنیەتی ژیان.

ئەگەر ڕێگەیەکی مامناوەندی لە لاوێتی و پیریشدا بگریت تووشی کێشەکان نابیت. حەزم لە قسەکانی بوو. ویستم زۆرترم بۆ باس بکات. گوتم، زۆر کەس لەگەڵتا هاوڕا نییە. لەوانەیە وا بۆی بچن تۆ لەبەرئەوەی دەوڵەمەندیت لەگەڵ پیریدا کێشەت نەبێت. دروستە، ئەوان هاوڕا نین. تاڕادەیەکیش بۆچوونەکەیان ڕاستە. وەلامدانەوەکەی تیمستۆکلس بۆ ئەمە لەبارە. دانیشتوویەکی شاری سێریفیوس بەتووندی ڕەخنەی لێ گرت و گوتی، کە ناوداریێتی ئەو بۆ شارەکەی دەگەڕێتەوە. لە وەلامدانەوەکەیدا گوتی، ئەگەر خەلکی شاری سێریفیان و ئەسیناش بووایە، مەرج نەدەبوو ناودار بێت. ئەم نموونەیە بۆ ئەوانەش دەگونجێت، کە پیرن و هەژارن و ژیانێکی ناخۆشیان هەیە. ئەگەر مرۆڤێکی چاک هەژار بێت پیرێتی لا ئاسان نییە، بەلام پیرێکی خراپ هەرچەندە دەوڵەمەندیش بێت، ئاسودە نییە.

منیش پرسیم: سیفالۆس، تۆ ئەم دەوڵەتەت چۆن پەیدا کرد؟ بۆت بەجێماوە یان خۆت پەیدات کردووە؟ تۆ دەپرسیت من چیم بۆ خۆم دروست کردوە؟ من وەکو پارەدارێک دەکەومە نێوان باوکم و باپیرمەوە. باپیرم بەقەد من پارەی هەبوو، بەلام هەوڵی دەدا زۆرتری بکات. باوکم، کە ناوی (لیسانیاس) بوو، پارەکەی باپیرمی خوارد و

له ئێستای من کەمتری هەبوو. منیش بەختەوەرم بەوەی، کە ئەو سامانەی هەمە و بە زیادەوە بۆ کوڕەکانی جێ دەهێڵم.

من بۆیە پرسیارەکەم لێ کردیت، چونکە دەردەکەوێت پارەت زۆر خۆش ناوێت. ئەوانەی پارەشیان نییە وەکو تۆن. ئەوانەی پارەیان پەیداکردووە لەوانەی نیانە زۆرتر حەزیان لە پارەیە. ئەوان وەکو ئەو شاعیرانە، یان باوکانە، شیعر و منداڵەکانیان خۆش دەوێت. لەبەرئەوە نییە، کە پارە سوودبەخشە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵدانیان بۆ دروستکردنەکەی. ئەمەش لە توانای بەهاوڕێبوونیان کەم دەکاتەوە. بێجگە لە پارە نازانن قسە لەسەر شتێکی دیکە بکەن. ئەوە ڕاستە.

بێگومان ڕاستە، بەڵام چاکترین شت چیە، کە لە ڕێگەی دەوڵەمەندییەوە دەستت کەوتووە؟ئەوەی باسی دەکەم زۆر کەس ڕازی ناکات. وەکو تۆش، ئەی سوکرات، دەزانیت کەسێک لە کۆتایی ژیان نزیک دەبێتەوە ترس لەلای سەرهەڵدەدات. لە زۆر شت دەترسێت، کە لە پێشتر لێی نەدەترسا. ئەو چیرۆکانەی لەبارەی (هادیس)ەوە دەمانبیستن٩ کە چۆن زۆردارەکان لە ژیانی پاش مردندا سزا دەدرێن. ئێستا لەبەر پیری و نزیکبوونەوە لە مەرگ دێنە بەرچاو و ترس دروست دەکەن. لەوە دەترسیت کارێکی خراپ یان زۆرداریت کردبێت. گوایە ئەوانەی لەم ژیانەدا زۆردارن (پاش مردن) بە ترسێکی زۆرەوە بەئاگا دێنەوە. لەو منداڵانە دەچن چاوەڕوانی ڕووداوێکی ناخۆش دەکەن. ئەوانەی دەزانن لەم ژیانەدا زۆردار نەبوون بە هیواوە دەژین. ئەو هیوایە وەکو (پیندار) دەڵێت، دەبێت بە برینپێچی تەمەنی پیری:

لەنێو دڵدا هیوای شیرین، برینپێچ و هاوڕێی تەمەنی پیرییە. هیوا، کەشتیەوانی هۆشی گۆڕاوی مرۆڤە تەمەنکورتەکانە١٠. چەند بە جوانی باسی دەکات. بە بۆچوونی من پارەو سامان لەم پەیوەندییەدا، نەک بۆ هەموو کەسێک، تەنیا بۆ مرۆڤی خاوەن ڕێز بەنرخن. پارەو سامان دەتوانن لە فێڵی خەڵکی ڕزگارمان بکەن، یان لە ترس بمانپارێزن. بەو پارەیە قوربانی بۆ خوا دەکەین و یارمەتی کەسێک دەدەین. گەلێک سوودی دیکەیان هەیە، بەڵام سوود لەپێناوی سوودگەیاندندا باشترینە.

ئەی سیفالیۆس هەستێکی جوانت هەیە، بەڵام باسی دادپەروەریت

کرد. ئایا دادوەری ئەوەیە، کە قەرزەکانت بەبێ مەرج بدەیتەوە؟ یان ئەم کارە هەندێکجار ڕەوایەو جاری دیکەش ڕەوا نییە؟ مەبەستم لەو کارە، بۆ نموونە، ئەوەیە، کە ئەگەر مرۆڤێک چەکێکی لای هاوڕێکەی دانابێت و ئێستا ئەو مرۆڤە شێت بێت بچێت داوای چەکەکەی لە هاوڕێکەی بکاتەوە. ئەگەر هاوڕێکەی چەکەکەی نەداتێ کارێکی ناڕەوای کردووە و نابێت کەسیش حوکم بەسەر باری هۆشەکی کەسێکی دیکەدا بدات.

بەڵێ وایە.

کەوابوو، پێناسەی دادوەری.. گوتنی ڕاستی و قەرزدانەوە نییە.

پۆلیمارکۆس گوتی: «بەدڵنیاییەوە سوکرات. ئەمە وایە ئەگەر باوەڕ بە سیمۆنیدس بکەین». ١١

سیفالۆس گوتی: «من دەڕۆم بەلای قوربانیەکەوە و تۆش لە گفتوگۆکەتدا بەردەوام بە». ئینجا پۆلیمارکۆس گوتی: «دەتوانم بۆ هەموو کارێک ببم بە جێگرت؟» سیفالۆس بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: «بێگومان تۆ جێگری منیت». ڕۆی بەلای قوربانیەکەوە. منیش گوتم: «ئێستا بۆ گفتوگۆکەمان جێگری (باوکتیت). پێمان بڵێ بۆچوونەکەی سیمۆندیس لەسەر دادوەری چیە؟ کە تۆ بە دروستی دادەنێیت».

بە بیروڕای من بۆچوونەکەی جوانە، کە دەڵێت هەرکەسە ئەوەی بدرێتێ، کە بەماڵی خۆی دادەنێت. باشە، من گومانم لە بۆچوونەکەی سێمۆندیس نییە، چونکە زاناو خواناسە، بەڵام ئەو گوتەیەی چ واتەیەک دەبەخشێت؟ لەوانەیە تۆ بزانیت، بەڵام من تێنەگەیشتووم. هەڵبەتە مەبەستی ئەوە نییە، کە لە پێشتر خۆمان ئاماژەمان بۆ کرد و گوتمان قەرزەکە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە و گرنگ نییە خاوەن قەرزەکە لە کاتی گەڕانەوەی قەرزەکەدا شێتیش بێت.

ئەو قەرزە ماڵی خاوەنەکەیەتی، ئایا ئەمە وایە؟

بەڵێ.

بەڵام لەبەرئەوەی شێتە نابێت قەرزەکەی بدەینەوە؟ ڕاستە. کەوابوو، مەبەستی سیمۆندیس لەوێدا، کە دادوەری لە گەڕانەوەی قەرزەکەدا بێت جیاوازە. بێگومان، بە خوا لە شتێکی جیاواز دەچێت. مەبەستی ئەوەیە، کە هاوڕێ دەبێت چاکە لەگەڵ هاوڕێدا بکات و

هەرگیز ئازاری نەدات.
من لە تۆ تێدەگەم. ئەگەر دوو هاوڕێ قەرزاری یەکدی بن گەڕانەوەی قەرزەکە بە زێڕیش بێت لەبەرئەوەی زیان بە هاوڕێکەی دەگەیەنێت نابێت بیداتەوە. ئایا ئەمە مەبەستی سیمۆندیسە؟
بەڵێ.
ئەی دەبێت قەرزەکە بە دوژمنیش بدرێتەوە؟
بەڵێ. دەبێت قەرزەکە بدرێتەوە، بەڵام بە بۆچوونی منیش ئەوەی دوژمنەکانمان هەیانە خراپە.
کەوابوو، سیمۆندیس، وەکو شاعیرێک قسە دەکات و گوتەکەی مەتەڵە.
دادوەری بۆ ئەو گەڕانەوەی قەرزەکەیە بۆ خاوەنەکەی.
بە بۆچوونی تۆ چ واتایەکی دیکەی هەیە؟ تۆ چۆن بیری لێ دەکەیتەوە؟ ئەگەر یەکێک بپرسێت: ئەی سیمۆندیس، چ شتێک هەیە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە یان ئەو هونەر و زانینەی، ناوی دەنێین پزیشکی بە کێ بدرێت؟ ئاشکرایە، دەرمان و خواردنەوە بە لەش دەدرێن. ئەی هونەری چێشتلێنان بۆ کێیە و چ دەدات؟ تامی خۆش بە چێشتەکە دەدات.
باشە، ئێستا ئەوەی بە دادوەری ناوزەدمان کرد چ دەداو بۆ کێیە؟
ئەگەر پەیڕەوی وەڵامی پێشوو بکەین، ئەی سوکرات، دادوەری سوودی بۆ هاوڕێکانمان و زیانی بۆ دوژمنەکانمان هەیە. کەوابوو بە بۆچوونی سیمۆندیس، چاکەکردن لەگەڵ هاوڕێکانمان و خراپەکردن لەگەڵ دوژمندا دادوەرییە. بڕوام وایە.
کێ هەیە لە حاڵەتی نەخۆشیدا لەگەڵ هاوڕێدا چاکەکەر و لەگەڵ دوژمندا خراپەکەر بێت؟ پزیشک.
ئایا بە چ کردەوەیەک دادوەرێک سوود بە هاوڕێ و زیان بە دوژمن دەگەیەنێت؟
لە جەنگ و بەرەکردنەوەدا. باشە، ئێستا، ئەی پۆلیمارکۆس، پزیشک بۆ ئەوانەی نەخۆش نین هیچ سوودێکی نییە.
دروستە.
کەشتیەوانیش سوودی بۆ ئەو کەسانە نییە، کە بەنێو دەریادا

ناگوزەرێن. بەڵێ.

دادوەر بۆ ئەوانەی لە جەنگدا نین بێ سوودە؟ نا، لەو باوەڕەدا نیم.

کەوابوو، (بە بۆچوونی تۆ) دادوەری لە کاتی ئاشتیشدا سوودبەخشە؟

بەڵێ. هەروەها کشتوکاڵکردنیش؟

بەڵێ. بۆ بەرهەمهێنان؟ بەڵێ. هەروەها، کەوشدروستکردنیش؟

بەڵێ. چونکە، پێویستیت بە کەوشە؟ بە دڵنیاییەوە.

باشە، کەوابوو، دادوەری بۆ وەدەستهێنان سوودبەخشەو لە کاتی ئاشتیشدا بەکاردێت؟ بەڵێنیش، ئەی سوکرات.

مەبەستت بەڵێنی هاوکاریکردنە؟ مەبەستم هاوکاریکردنە.

کەسێک یاری (دامە)مان لەگەڵدا بکات هاوکارێکی چاک و سوودبەخشە. ئایا لەبەرئەوەیە ئەو کەسە دادوەرە، یان یاریزانە؟١٢، چونکە یاریزانە.

ئایا لە دانانی خشت و بەرددا کەسێکی دادوەر چاکترە، یان وەستایەکی خانوودروستکردن هاوکارمان بێت؟

وەستا.

لە چ جۆرە هاوکاریکردنێکدا دادوەرێک لە وەستایەکی خانوو، یان گیتارزانێک چاکترە؟ ئایا چاکی گیتارزانەکە لەوەدا نییە، کە لە دادوەرەکە باشتر گیتار لێدەدات؟

وا بۆی دەچم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پارەدا ئەمە دروست بێت.

هەڵبەتە، ئەی پۆلیمارکوس بۆ پارە وایە، چونکە کاتێک بمانەوێت ئەسپ بکڕین کەسێک لە بەخێوکردنی ئەسپ بزانێت ببێت بە هاوکارمان سوودی زۆرترە، وانیە؟

وادیارە. کەسێکیش بیەوێت بەلەمێک بکڕێت چاکترە هاوکارەکەی وەستای بەلەم دروستکردن یان کەشتیەوان بێت؟

گونجاوترە.

ئەی لە مامەڵەکردن لەگەڵ زێڕ و زیودا، ئایا کەسێکی دادوەر لە کەسێکی دیکە سوودبەخشترە؟

بەڵێ سوکرات، کاتێک (زێڕ و زیوەکەی) لەلا دادەنێن. مەبەست ئەوەیە، کە کاتێک پێویستیمان بە (زێڕ و زیو) نییەو هەڵیان دەگرین؟ ئەمە ڕاستە. کەوابوو، کاتێک پارەمان خەرج نەکرد، دادوەری (بۆ

هەڵگرتنی پارەکە) پێویستە؟
بەڵێ، دەترسم وابێت.
کاتێکیش پێویستمان بە مقەستێکی (پەرژین) بڕین نییە هەڵی دەگرین و بەکاری ناهێنین. دادوەریش بۆ تاکە کەس و هاوکارەکەشی بەسوودە. کارامەیی پەرژین بڕینەکەشە سوودمان پێدەگەیەنێت بەڵێ؟
دادوەری بەسوود نییە ئەگەر شتەکان بەکاربهێنن و بەسوودە، کە هەڵیان دەگرین؟ وا دیارە بەمجۆرە بێت.
لەم حاڵەتەدا دادوەری لەبەرئەوەی لەوێدا سوودبەخشە کاتێک شتەکان سوودیان لێ وەرناگیرێت و (هەڵگیراون)، ئەوەندە بەنرخ نییە، بەڵام تەماشای ئەم خاڵە بکە، (کە باسی دەکەم) ئایا کەسێک مستی باش بکوتێ، هەر ئەو کەسە نییە لە یاری شەڕەمستدا بتوانێت (خۆی لە مستی ئەوەی بەرانبەری) بپارێزێت؟
بەدڵنیاییەوە. ئەوەی خۆی لە نەخۆشی بپارێزێت بەبێئەوەی بزانێت (خاوەنی تەندروستیە)؟ بۆ من وا دیارە.
پاسەوانی چاکیش دەتوانێت پیلان و چەکی دوژمن بدزێت؟ بەدڵنیاییەوە.
کەوابوو، پاسەوانی چاک دزێکی چاکە.
لەوانەیە.
کەسێک لە پارەهەڵگرتندا زیرەک بێت لە دزیکردنیشدا زیرەکە.
بەگوێرەی گفتوگۆکەمان دەبێت وابێت.
کەسێکی دادوەر، کەوابوو دزە. تۆ ئەم بیرۆکەیەشت لە هۆمیرۆسەوە وەرگرتووە، کە بە بۆچوونی ئەو ئاوتۆلیکۆسی باپیری ئۆدیسۆس لە درۆکردن و دزیندا لە هەموو کەسێک زیرەکتر بوو١٣.
بەدیدی تۆ و هۆمیرۆس و سیمۆندیس، دادوەری جۆرێکە لە هونەری دزیکردن، سوودگەیاندن بە هاوڕێ و زیانبەخشین بە دوژمن.
ئایا مەبەستت ئەمەیە؟
نا، بە خوا، ئەو مەبەستەم نییە. من نازانم چ مەبەستێکم هەیە، بەڵام هێشتا سوودگەیاندن بە هاوڕێ و زیانیش بە دوژمن بە دادوەری دادەنێم.
مەبەستت لە هاوڕێ ئەو کەسەیە، کە بۆ (ئێمە) چاک و سوودبەخشە،

یان (بۆ هەموو کەسێک) وایە؟ بێگومان، تۆ ئەو کەسەت خۆش دەوێت، کە چاک و سوودبەخشە و رقت لە کەسێکیشە خراپ و زیانبەخش بێت، بەڵام دڵنیام خەڵکی لەم بارەیەوە هەندێکجار تووشی هەڵە دەبن. زۆر کەس بە چاک و سوودبەخش دەبینن، کە وانین. هەمان هەڵەش لە ناسینی دوژمندا دەکەن.

بەڵێ وا دەکەن.

ئایا ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کەسی چاک بە دوژمن و خراپیش بە هاورێی خۆیان دابنێن؟

دروستە.

کەوابوو، بەگوێرەی بۆچوونەکەت خراپەکاری لەگەڵ ئەوانەی نا-دادوەری ناکەن، دادوەرییە.

نا، سوکرات، بەهیچ جۆرێک ئەو مەبەستەم نییە. لەوانەیە باسکردنەکەم خراپ بێت.

کەوابوو، (بە بۆچوونی تۆ) دادوەری لەوەدایە بۆ ئەوانەی دادوەر نین زیانبەخش و بۆ دادوەرەکانیش سوودبەخش بین.

بەڕای من، ئەم شێوە دەربڕینە باشترە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، پۆلیمارکۆس، کە ئەو کەسانەی بە هەڵە حوکم بەسەر هاوڕێیەکدا دەدەن و زیانی پێدەگەیەنن، یان دوژمنێک بە هاوڕێ دەبینن و دەبن بە سوودبەخش و کارێکی دادوەرانە دەکەن.

ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی سیمۆندیسەوەیە.

بەڵێ وایە. بەڵام با پێناسەکەمان بگۆڕین، چونکە واتای هاوڕێ و دوژمنمان بەتەواوی ڕوون نەکردەوە.

چۆن پێناسەیان بکەین؟ ئێمە گوتمان هاوڕێ کەسێکی سوودبەخشە؟

ئێستا چۆن ئەم (پێناسەیە) بگۆڕین؟

کەسێک سوودبەخش بێت و ئێستاش سوود بگەیەنێت بە هاوڕێ دادەنرێت! کەسێکیش سوودبەخش بێت و (ئێستا) سوودبەخش نەبێت هاوڕێ نییە. بەمجۆرەش وا بیر لە دوژمن دەکرێتەوە. بەگوێرەی ئەم پێناسەیە، کەسێکی چاک هاوڕێ و خراپیش دوژمنە. بەڵێ.

هەروەها، تۆ دەتەوێت واتایەکی دیکەی دادوەری بخەینە سەر

پێناسەکەمان، کە گوتمان دادوەری چاکەکردنە لەگەڵ هاوڕێ و خراپەکردنیشە لەگەڵ دوژمندا. تۆ دەتەوێ لەوە زۆرتر بڵێیت، کە گوایە دادوەری ئەوەیە، چاکە لەگەڵ هاوڕێی چاکدا بکەیت و خراپەش بەرانبەر دوژمنی خراپ بکەیت؟ دروستە، بۆ من وا دەردەکەوێت.

ئایا کاری دادوەرێک ئەوەیە زیان بە هەموو کەسێک بگەیەنێت؟ بەدڵنیاییەوە، دەبێت زیان بە کەسانی خراپ و دوژمنەکان بگەیەنێت. ئەسپ بە ئازاردان باش دەبێت یان خراپ؟ خراپ. ئایا ئەوە چاکە، کە سەگ یان ئەسپ باشتر دەکات؟ ئەوە چاکە.

کاتێک سەگێک ئازار دەدرێت هارتر نابێت؟ ئەم ئازاردانە بۆ سەگ باشە و بۆ ئەسپ باش نییە؟

بەڵێ، پێویستە وابێت. ئایا خراپ نییە مرۆڤ ئازار بدرێت؟

بەدڵنیاییەوە.

ئایا بۆ مرۆڤ دادوەری چاکە نییە؟

بەڵێ، چاکەیە. کەوابوو، ئەوانەی ئازار دەدرێن زۆرتر نادادوەرن؟ وا دیارە. ئایا مۆسیقازانەکان کەسانی مۆسیقانەزان بە مۆسیقالێدان دەکەن بە مۆسیقازان؟

ناتوانن.

یان سوارچاکەکان بە هونەری ئەسپسواری خەڵکی لە ئەسپسواری دوور دەخەنەوە؟

نەخێر.

باشە، ئایا ئەوانەی دادوەرن دەتوانن بە دادوەری خەڵکی بکەن بە نادادوەر؟

ناتوانن.

ئایا گەرما شتە دژەکەی بەرانبەری سارد ناکات؟

بەڵێ.

یان وشکانی شتە دژەکەی بەرانبەری تەڕ دەکات؟

بەدڵنیاییەوە.

ئایا کاری چاکە زیانگەیاندن بە دژەکەی نییە؟وا دیارە.

هەروەها، دادوەر کەسێکی چاکەکەرە؟بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، ئەی پۆلیمارکۆس، نابێت دادوەر ئازاری هاوڕێ یان

کەسێکی دیکە بدات. ئازاردان کاری دژەکەی یان کەسێکە، کە دادوەر نییە.
بە بیروڕای من، سوکرات، ئەمە بەتەواوی دروستە.
ئەگەر کەسێک بڵێت دادوەری لەوێدایە قەرزەکەی بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە و بۆ دوژمن زیانبەخش و بۆ هاوڕێش سوودبەخش بێت زانا نییە و ئەوەی باسی دەکات ڕاست نییە، چونکە وا دەرکەوت، کە دادوەر ئازاری هیچ کەسێک نادات.
من لەگەڵتا هاوڕام
من و تۆ دەبێت دژی ئەوانە ڕاوەستین، کە لەو باوەڕەدان سیمۆندیس و بیاس و پیتاکۆس یان زاناکانی دیکە بەمجۆرە (واتای دادوەرییان) ڕوون کردۆتەوە.
من لەم جەنگەدا هاوکاری تۆم. ئایا دەزانی کێ دەڵێت دادوەری ئەوەیە، کە بۆ هاوڕێکانت سوودبەخش و دوژمنەکانت زیانبەخش بێت؟
کێ؟
وابزانم گوتەی (پێریاندەر، پێردیکاس، زێرزێکس)، یان (ئیسمیناس)ی شاری (کۆرینتە)یە یان گوتەی چەند دەوڵەمەندێکی دیکەیە، کە خۆیان بە خاوەن دەسەڵات دادەنێن١٤.
بەتەواوی دروستە. باشە، ئەگەر دادوەری و دادوەر ئەم واتایانەیان نەبێت، کە ئەوان باسی دەکەن ئایا چ واتایەکیان هەیە؟ کاتێک لەم مشتومڕەدا بووین، تراسیماکۆس چەند جارێک هەوڵیدا بەشداری بکات، بەڵام ئەوانەی نزیکی دانیشتبوون
دەیانویست لە ئاکامی گفتوگۆکەمان بگەن ڕێگەیان نەدا بەشداری بکات. پاش ئەوەی من لە قسەکردن وەستام خۆی پێ نەگیرا و بە پەرۆشەوە ویستی خۆی بخاتە نێو باسەکەوە. من و پۆلیمارکۆس ترساین لەوەی بە بۆڵەوە خۆی هاویشتە ناو مشتومڕەکەمانەوە. گوتی، سوکرات، ئێوە هەردووکتان، چ بێ مانابیەکتانە؟ بۆچی وەکو گەمژەیەک ڕێگا بە کەسێکی دیکە دەدەیت؟ ئەگەر بتەوێت لە واتای دادوەری تێبگەیت پرسیار مەکە و وەڵامەکەشی ڕەت مەکەوە. تۆ دەزانیت پرسیارکردن لە وەڵامدانەوە ئاسانترە. وەڵامی پرسیارەکەت

بـدەرەوە و واتـای دادوەریـمـان بۆ ڕوون بکـەوە. مەڵێ دادوەری سوودگەیاندن و دەستکەوت و قازانجە. دەمەوێت واتاکەی بەئاشکرا باس بکەیت. بە ناماقوڵیەکەی تۆ ڕازی نیم.

وشەکانی (تراسیماکۆس) ڕایان چڵەکاندم و لە تێڕوانینەکانی ترسام. ئەگەر لە پێشتر دەموچاوە مۆنەکەیم نەدیبایە من بەو (هەڵوێستەی) لاڵ دەبووم. لە یەکەم ساتی مشتومڕەکەمانەوە، کە تەماشام دەکرد دەمزانی پەستە. بۆیە بە سوکە لەرزینێکەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: تراسیماکۆس پێویست ناکات خۆت توڕە بکەیت. من و پۆلیمارکۆس بە مەبەستەوە خۆمان بەو هەڵەیە نەگەیاندووە. ئەگەر بەدوای زێڕدا بگەڕێین بە مەبەستەوە ڕێگە بۆ یەکدی خۆش ناکەین. پێناسەکردنی دادوەریش لە زێڕ بەنرخترە. وا تێمەگە مەبەستمان سەرلێشێواندن و خۆونکردن بێت، چونکە دۆزینەوەی کارێکی ئاسان نییە. لەبەرئەمە پێویستە کەسێکی زیرەکی وەکو تۆ لەگەڵ ئێمەدا ئـەوەنـدە ڕەق نەبێت.

پاش ئەم قسانەم بە دەنگێکی بەرز و گاڵتەکردنەوە پێکەنی. گوتی، سوکرات بە هیراکلیس سوێند دەخۆم گاڵتەم لەگەڵدا کردیت١٥. من پێش مشتومڕەکەتان گوتم، کە تۆ وەڵامی پرسیارەکان نادەیتەوە و گاڵتەش بە وەڵامەکانی ئەوان دەکەیت، چونکە تۆ کەسێکی زیرەکیت. تۆ لە پێشتر دەزانی، کە پرسیار لەبارەی ژمارە دوانزەوە لە کەسێک بگەیت و هەمان کات دەڵێیت پێم مەڵێ، کە دوو جار شەش، سێ جار چوار، شەش جار دوو یان چوار جار سێ دەکاتە دوانزە، چونکە بەم ناماقوڵییە ڕازی نابم و کەس ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکە بەمجۆرە بۆ ئامادە بکات. ئەگەر بڵێیت، تراسیماکۆس مەبەستت چیە؟ ئایا من وەڵامم نەداویتەوە؟ من سەرم دەسوڕمێت. ئایا هیچ شتێکی دیکە لە ڕاستی بەولاوە هەیە من بۆتانی باس بکەم؟ ئایا تۆ چ وەڵامێکت پێیە؟ باشە، تۆ وا دەزانیت ئەم دوو شتە وەکو یەکن؟

بۆچی لە یەکدی ناچن؟ ئەگەر لە یەکدیش نەچن بۆ ئەو کەسەی پرسیارەکەی لێ دەکەیت لە یەکدی دەچـن. ئایا دەتوانین ڕێگە لە وەڵامدانەوەکەی بگرین؟ ئایا تۆ یەکێک لەو وەڵامانەمان دەدەیتێ، کە ڕێگەی دەربڕینیان لێ گیراوە؟

بۆ من جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەو وەڵامە بدەم بەمەرجێک بە ڕاستی دابنێم.
تۆ چی دەڵێیت ئەگەر وەڵامێکی باشتر لە وەڵامەکانی پێشووت بدەمێ؟ چ سزایەکت بدەم؟ چ سزایەک لەوە باشترە کەسێکی نەزان شتێک لە کەسێکەوە فێر بێت، کە دەزانێت؟ تۆ سەیریت، بێجگە لە فێربوون دەمەوێت سزایەکی دیکەت بۆ دابنێم.
ئەگەر پارەم دەست کەوت دەتدەمێ. گلاوکۆن گوتی: «هەندێک پارەی هەیە». تراسیماکۆسیش گوتی: «ئەگەر کێشەکە پارە بێت، ئێمە پارە بۆ سوکرات کۆدەکەینەوە».
من دەزانم شێوەی گفتوگۆی سوکرات چۆنە. ئەو وەڵامی پرسیارەکان ناداتەوە و وەڵامی بەرانبەرەکەشی ڕەت دەکاتەوە.
منیش گوتم: کەسێک وەڵامەکە نەزانێت، یان لەو باوەڕەدا نەبێت، کە وەڵامەکە نازانێت، زانایەکیش ڕێگەی پێ نەدات بیروڕای خۆی دەربڕێت، چۆن دەتوانێت وەڵام بداتەوە؟
تۆ باشتر وەڵام دەدەیتەوە، چونکە خۆت بە زانا دادەنێیت. کەوابوو، ئەم چاکەیەم لەگەڵدا بکە و گلاوکۆن و ئەوانی دیکە لە فێربوون بێبەش مەکە. گلاوکۆن و ئەوانەی دانیشتبوون داوایان لێ کرد وەڵامەکەی دەربڕێت. وا دەردەکەوت تراسیماکۆس لەو باوەڕەدا بێت وەڵامێکی ڕاستی پێیەو سەرنجی ئەوان ڕادەکێشێت. خۆی بە سەرکەوتوو دەبینی و زۆری لە من دەکرد وەڵامەکەمی بدەمێ. بەهەرحاڵ، لە کۆتاییدا ڕازی بوو بەوەی وەڵام بداتەوە و گوتی: «ئێوە سوکراتتان لایە. ئەم زانایە بەبێ ئەوەی لەبەرچاوی بێت لە خەڵکەوە فێر دەبێت و ئامادەش نییە کەس فێر بکات».
ئەوە ڕاستە، من لە خەڵکەوە فێر دەبم، بەڵام لەوەدا، کە دەڵێیت لەبەرچاوی نییە، ڕاست ناکەیت. من سوپاسی خۆم دەردەبڕم و لەبەرئەوەی پارەم نییە ناتوانم خەڵاتیان بکەم. تۆ نازانی چەند خۆشحاڵ دەبم، کە کەسێک باش قسە دەکات و وەڵامێکی چاکم دەداتەوە. کەوابوو، گوێ بگرە، من دەڵێم دادوەری سوودی لایەنی بەهێز (یان لایەنی هێزدارەکانە). بۆچی سوپاسم ناکەیت؟ تۆ خۆت لە سوپاسکردنەکە دەدزیتەوە.

من پێویستە لە وەڵامەکەت تێبگەم، چونکە نازانم مەبەستت چیە. بە بیروڕای تۆ دادپەروەری سوودی لایەنی بەهێزە. ئەی تراسیماکۆس، مەبەستت چیە؟ دڵنیام، کە وەڵامەکەت ئەم مەبەستەی نییە، کە (پۆلیدامۆس) (پاڵەوانی زۆرانبازی) لە ئێمە بەهێزترە، یان خواردنی گۆشتی گا بۆ ئەو سوودبەخشە، چونکە بەهێزی دەکات، لەبەرئەمە ئەو خواردنە سوودبەخش و دادوەرییە و بۆ ئێمەش، کە لە ئەو کەمتر بەهێزین دادوەری نییە؟ سوکرات، تۆ تووشی قێزدانەوەم دەکەیت. لە شوێنێکدا وەڵام و گفتوگۆکەم ڕادەگریت، کە گەورەترین زیانم پێ دەگەیەنێت.

نەخێر وانیە. ڕوونی بکەوە چ مەبەستێکت هەیە؟ نابینیت هەندێک لە شارەکان پاشایەکی زۆرداری هەیە و ئەوانی دیکە ڕژێمێکی دیموکراسی یان ئەریستۆکراتیان تیا سەقامگیر بووە؟

بەڵێ، هەڵبەتە. هێزی دەستەڵاتدار بەگوێرەی شارەکان دەگۆڕێت.

بەدڵنیاییەوە. هەر یەکێک لە دەسەڵاتدارەکانیش یاسا بۆ بەرژەوەندیی خۆی دادەنێت. دەسەڵاتدارێکی دیموکراتی یاسای دیموکراتیانە و زۆردارێکیش زۆرداری دادەنێت. بانگەشەی ئەوەش دەکەن، کە ئەمە بۆ سەقامگیرکردنی دادوەرییە و سزای ئەوانەش دەدەن دژیان ڕادەوەستن. ئەمە لە هەموو شارەکاندا واتای دادوەرییە، کە بەرژەوەندی و سوودی دەسەڵاتمەداری تێدایە. لەبەرئەوەی یاسا دامەزراوەکەش بەهێزترە، هەموو ئەوانەی بە دروستی بیر دەکەنەوە بەو باوەرە دەگەن، کە دادوەری لە هەموو شوێنێک بەمجۆرە بێت سوودو بەرژەوەندیی ئەوانەی تێدایە، کە بەهێزن و خاوەنی دەسەڵاتن.

ئێستا من لە تۆ تێدەگەم، بەڵام لە وەڵامدا تۆ ئەی تراسیماکۆس گوتت، کە دادپەروەری لە سوودگەیاندایە و ڕێگەش لە من دەگرێت هەمان بۆچوونم هەبێت. دروستە، تۆ تەنیا وشەی (بەهێزتر)ت بۆ پێناسەکە زیاد کردوە. تۆ وا دەزانیت ئەو زیادکردنە بێ بایەخە؟

هێشتا نازانین چ بایەخێکی هەیە، بەڵام پێویستە لە ڕاستی پێناسەکە بکۆڵینەوە. من لەگەڵتا هاوڕام، کە دادوەری جۆرێک لە سوودگەیاندن بێت، بەڵام تۆ (بۆ بەهێزتر)ت زیاد کردوە. من نازانم مەبەست چیە؟! پێویستە تەماشای بکەین.

تەماشای دەکەین. ئەی تۆ ملکەچکردن بۆ خاوەن دەسەڵات بە دادوەری دانانێیت؟ بەڵێ، من دایدەنێم.

ئایا دەسەڵاتدارانی شارەکە پاکن و گەندەڵی ناکەن! یان تووشی هەڵەو گەندەڵی دەبن؟ کەوابوو، لە سەقامگیرکردنی یاساکاندا هەندێکجار ڕاست و جاری دیکەش ڕاست نین. بەڵێ وایە. هەروەها سەقامگیرکردنی یاساکەش ڕاستە ئەگەر لە بەرژەوەندی و سوودی خاوەن دەسەڵاتەکە بێت، بەپێچەوانەشەوە ڕاست نییە. ئایا ئەمە مەبەستتە؟ بەڵێ. دادپەروەرییش لەوێدایە، کە خەڵکی ملکەچی یاساکان بن؟ هەڵبەتە. کەوابوو. بەگوێرەی بۆچوونەکەت، دادوەری تەنیا لەوەدا نییە کەسێک بۆ سوود و بەرژەوەندی لایەنی بەهێزتر کار بکات. بەپێچەوانەشەوە لەوەشدایە، کە دژی ئەو سوود و بەرژەوەندییە کارێک بەئاکام دەگەیەنێت.

تۆ چی دەڵێیت؟ من وەکو تۆ قسە دەکەم. با بەتەواوی لە کێشەکە بکۆڵینەوە. تۆ ناڵێیت یان ڕێنەکەوتین لەسەر ئەو خاڵەی، کە هەندێک جار دەسەڵاتدارەکان بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵات و یاساکانیان بەسەر خەڵکدا تووشی هەڵە دەبن و هاوکات بۆئەوەی دادوەریش بەرقەرار بێت خەڵکی پێویستە پەیڕەوی یاساکان بکەن؟ لەسەر ئەمە ڕێنەکەوتین؟

وابزانم ڕێکەوتین.

لێرەدا، پێویستە بەو جۆرەش بیر لە کێشەکە بکەیتەوە، کە ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی دادوەریش لەوەدایە تۆ دژی بەرژەوەندی و سوودی دەسەڵاتدارەکان هەستیت. هەروەها تۆ دەڵێیت، دادوەری لە ملکەچی خەڵکیدایە بۆ فەرمان و یاساکان. تۆ، تراسیماکۆس، زۆر زیرەکیت، ئەی ئەمە ئەوەش ناگەیەنێت، کە دادوەری بەپێچەوانەی ئەوەوە بێت تۆ باسی دەکەیت، چونکە ئەوانەی لاواز و بێ دەسەڵاتن داوایان لێ دەکرێت بۆ بەرژەوەندی و سوودی خاوەن دەسەڵات و بەهێزترەکان هەوڵ نەدەن؟ پۆلیمارکۆس گوتی: بە خوا، سوکرات بۆچوونەکەت دروستە.

کلیتۆفان لەولاوە هەڵیدا و گوتی، بێگومان دروست دەبێت ئەگەر تۆ بەو جۆرە گەواهی بدەیت.

پۆلیمارکۆس وەڵامی دایەوە: کێ پێویستی بە گەوایە؟ تراسیماکۆس ڕازییە بەوەی هەندێکجار دەسەڵاتدارەکان فەرمانێک دەردەکەن، کە زیانی خۆیانی تێدا بێت. ئەمەش لە چاوی کەسانی دیکەدا (لەوانەیە) دادوەری بێت.

ئەمەش، ئەی پۆلیمارکۆس، لەبەرئەوەیە، تراسیماکۆس لەو باوەڕەدایە دادپەروەری لە ملکەچکردن بۆ فەرمانی دەسەڵاتدارەکانە. هەروەها، ئەی کلیتۆفان، دەڵێیت دادوەری سوودگەیاندنە بەوانەی بەهێزترن. لەسەر ئەم دوو بنەمایەوە بەو باوەڕەش ڕازی بوویت، کە هەندێکجار بەهێزەکان جۆرە فەرمانێک بە کەمهێزەکانی ژێردەسەڵاتی خۆیان دەدەن لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتەکەیان نییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی لە بەرژەوەندیی بەهێزەکاندایە لەوە زۆرتر دادوەرانە نییە، کە لە بەرژەوەندیی بەهێزەکاندا نییە.

کلیتۆفان وەڵامی دایەوە و گوتی: سوودی ئەوانەی بەهێزن ئەوەیە، کە ئەو بەهێزانە بە بڕوای خۆیان بە سوودی دادەنێن. ئەمەیە کەسانی لاواز و کەمهێز دەبێت پەیڕەوی بکەن. ئەمە بەڕای ئەو (ترسیماکۆس) دادوەرییە. پۆلیماکۆس گوتی: ئەمە ئەو واتایە نابەخشێت.

من گوتم، ئەی پۆلیمارکۆس، ئەوە هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت. ئەگەر تراسیماکۆس بەم جۆرەش بۆ کێشەکە بچێت ئێمە ڕازین. تراسیماکۆس، تۆ پێم بڵێ مەبەستت لە دادوەری ئەوەیە، کە بەهێزەکان بە سوودی خۆیانی دادەنێن، ئەنجا گرنگ نییە لەڕاستیدا ئەوە بۆ سوودی ئەوانە یان نا؟ هەرگیز نا. تۆ لەو بـاوەڕەدای من کەسێکی بەهێز لە کاتی هەڵەکردندا بە بەهێز دابنێم؟

من وا تێگەیشتم، چونکە بەڕای تۆ دەسەڵاتدارەکان هەڵە دەکەن.

تۆ، سوکرات، وا تێدەگەیت، چونکە گەواهێکی چاک نیت. کەسێک بە هەڵە چارەسەری نەخۆشێک بکات بە پزیشکی دادەنێیت؟ یان کەسێک لە ژمێریاریدا هەڵە بکات لە کاتی هەڵەکردنەکەدا بە ژمێریار دادەنرێت؟ وابزانم لە وەڵامدا دەڵێیت، پزیشکەکە یان ژمێریارەکە هەڵەی کرد، بەڵام هەر یەکێک لەمانە لە (چوارچێوەی) پیشەکەیاندا چاوەڕوانی هەڵەیان لێ ناکرێت. نەزانین تووشی هەڵەیان دەکات. لە کاتی هەڵەکردنەکەدا کەسێکی لێزان نییە. لێزان و دەسەڵاتدار لە کاتی سەقامگیرکردنی

یاسادا هەڵە ناکەن. لەم ڕووەوە دەبێت تۆ لە وەڵامەکەم تێبگەیت، بەڵام وەڵامی تەواوم ئەمەیە. کەسێکی دەسەڵاتدار، بەو دەسەڵاتەوە بمێنێتەوە هەرگیز هەڵە ناکات و بەبێ هەڵە ئەو یاسایانە سەقامگیر دەکات، کە لە بەرژەوەندیی ئەودایە و ژێردەستەکەشی پەیڕەوی دەکات. کەوابوو، بەو جۆرەی لە سەرەتاوە باسم کرد، دادوەری سوود و بەرژەوەندیی کەسانی بەهێزترە.

باشە، ترسیماکۆس، تۆ وا دەزانیت من گەواهێکی خراپم؟

بەڵێ، بەدڵنیاییەوە وایە.

وادەزانیت من بۆئەوەی ئازارت بدەم پرسیارم لێ کردیت؟ باش دەزانـم. ئەمەش هیچ سوودێکی بۆ تۆ نییە. تۆ ناتوانیت فێڵم لێ بکەیت. لەبەرئەوە ئازارم نادەیت و نامبەزێنیت. من ئەوە ناکەم، ئەی تراسیماکۆس. بۆئەوەی ئەوەش ڕوونەدات دەمەوێت بە ڕوونی پێم بڵێی مەبەستت لەو پێناسەیەدا دەسەڵاتدارە، یان کەسانی بەهێزتر؟ سـوودی چ لایەنێک بۆ ئەوانەی لاوازن دادوەرییـە، ئایا دادوەری لەوەدایە سوود بەو کەسانە بگەیەنێت، کە بەهێزترن؟ مەبەستم لە دەسەڵاتدار فەرمانڕەوایە. ئێستا دەست بکەرەوە و ئازارم بدە ئەگەر دەتوانیت.

ئایا تۆ لەو باوەڕەدای من ئەوەندە شێت بم شێر کەوڵ بکەم، یان دژی تۆ ببم بە گەواهێکی درۆزن؟

تۆ ئێستا هەر هەوڵت دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوویت.

بەسە. پێم بڵێ: بەو واتایەی تۆ.. پزیشک ئەو کەسەیە پارە پەیدا دەکات یان چارەی نەخۆش دەکات؟ کێ بەڕاستی پزیشکە ؟

ئەو کەسەی چارەی نەخۆش دەکات. ئەی کێ کەشتیەوانە؟ ئایا بەو واتایەی تۆ کەشتیەوان فەرمانبەری ئەوانەی نێو کەشتیەکەیە یان کەشتیەوانە؟ فەرمانبەری ئەوانەی نێو کەشتیەکەیە. نابێت وا بیربکەینەوە لەبەرئەوەی کەشتیەکە بەڕێ دەکات بە کەشتیەوانی دابنێین، چونکە کەشتیەوان و فەرمانڕەوایی ئەو لەسەر کەشتیەکە ئەو ناوەی پێ دەبەخشێت.

ئەوە ڕاستە.

ئایا لێرەدا هیچ شتێک هەیە لە سوود و قازانجی ئەوانەی سەر کەشتیەکە بێت؟ بەدڵنیاییەوە.

ئایا ئەو هونەرەی (کەشتیەوانەکە هەیەتی) لە سوود و قازانجی ئەواندا نییە؟ بەڵێ. لە سوود و قازانجی ئەواندایە.

ئەی سوود بۆ هونەرەکە (هونەری کەشتیەوانی) لەوەدا نییە، کە لە هەموو لایەنێکەوە پڕ و تەواو بێت؟ تۆ چ پرسیارێکم لێ دەکەیت؟ ئەگەر پرسیارم لەبارەی لەشمانەوە لێ بکەیت و بڵێیت، ئایا لەشمان پڕ و تەواون، یان پێویستیان بە پڕی و تەواوی هەیە، وەڵامت دەدەمەوە و دەڵێم: بەدڵنیاییەوە پێویستمان بەو تەواوبوونە هەیە. لەبەر ناتەواوی لەشمان هونەری پزیشکی هاتۆتە کایەوە. هونەری پزیشکی پێش خرا تاکو سوود بە لەش بگەیەنێت. ئایا بەڕای تۆ ئەم بۆچوونەم دروستە یان نا؟

تۆ ڕاست دەکەیت.

ئێستا، ئایا هونەری پزیشکی ناتەواوە؟ ئایا ئەم هونەرە، وەکو چۆن چاو پێویستی بە ڕووناکی زیاترە بۆئەوەی شتەکان ببینێت، گوێ پێویستی بە دەنگە، پێویستی بە بەرەوپێشەوەچوون نییە؟ ئەم پێویستیەش شتێکی لەکۆتایی بەدەر نییە؟ ئایا هەر جۆرێک لە هونەر دەیەوێت خۆی تەواو بکات؟ یان پێویستی بە هیچ جۆرە هونەرێکی دیکە نییە؟ ئایا ئەمە لەبەرئەوەیە، کە هەموو هونەرەکان پڕ و تەواون و کەموکورتیان تێدا نییە و بێ هەڵەن؟ ئایا بۆ هونەرێک ڕەوایە تەنیا شوێن سوودو قازانجی خۆی بکەوێت؟ ئەنجا لەبەرئەوەی ڕاستە بێ هەڵەیە؟ بیر لەم پرسیارانە بکەرەوە و پێم بڵێ وایە یان نا؟

وا دەردەکەوێت وابێت.

پزیشکی سوودی خۆی ناوێت، دەیەوێت سوود بە لەش بگەیەنێت.

بەڵێ.

ئەسپ بەخێوکردن سوودی بۆ خۆی نییە و سوودی ئەسپی دەوێت.

بێگومان هیچ هونەرێک بیر لە سوودی خۆی ناکاتەوە.

وادیارە. ئێستا، ئەی تراسیماکۆس، هونەرەکان لەو شتانە بەهێزترن و دەسەڵاتیشیان زۆرترە، کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات؟ تراسیماکۆس

بە نابەدڵییەوە لەگەڵیا هاوڕا بوو.
هیچ جۆرە زانستێک (زانینێک) شوێن سوود و قازانجی خۆی ناکەوێت. سوودی ئەوەی دەوێت، کە لە خۆی لاوازترە. ئەویش ئەو بابەتەیە، کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. (تراسیماکۆس) ویستی ئەم سەرەنجامەی (سوکرات) ڕەت بکاتەوە، بەڵام دوایی ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی و گوتی: بەدڵنیاییەوە.
کەوابوو پزیشکێک (لە پیشەکەی خۆیدا) سوود و قازانجی خۆی ناوێت و دەیەوێت سوود بە نەخۆشەکەی بگەیەنێت. لەسەر ئەوەش ڕێکەوتین، کە پزیشک چارەکەری لەشەو پارە پەیدا ناکات. ئایا لەسەر ئەمە ڕێنەکەوتین؟
بەڵێ.
کەوابوو، کەشتیەوانیش بەو واتایە فەرمانڕەوای کەسانی ژێردەستە و کەشتیەوان نییە؟
لەسەر ئەمەش ڕێکەوتین.
ئایا ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە کەشتیەوانەکە سوود و قازانجی خۆی ناوێ و بیر لە سوودی ئەوانەی سەر کەشتیەکە دەکاتەوە؟
بە نابەدڵییەوە (تراسیماکۆس) گوتی وایە.
کەوابوو، ئەی تراسیماکۆس، هیچ دەسەڵاتدارێک نییە بیر لە سوود و قازانجی ئەوانەی ژێر دەسەڵاتی نەکاتەوە. ئەو بە هەر کارێک هەستێت بۆ بەرژەوەندیی کەسانی ژێردەستیەتی.
لەم خاڵەدا گەیشتینە ئەو باوەڕەی پێناسەکەی (تراسیماکۆس) بۆ دادوەری دژی بۆچوونەکەی ڕاوەستا. لەبری وەڵامدانەوەش گوتی: «سوکرات پێم بڵێ تۆ خزمەتکارت هەیە؟» مەبەستت چیە؟ باشتر نییە لەبری ئەم جۆرە پرسیارکردنە وەڵامم بدەیتەوە؟ چونکە (خزمەتکارەکەت) ڕێگەت دەدات بە لووتی چڵماوییەوە بسوڕێیتەوە و بۆت پاک ناکاتەوە.
بۆچی؟
تۆ جیاوازیی نێوان شوان و مەڕ نازانیت. ئەوەی من نایزانم چیە؟ تۆ وا بیر دەکەیتەوە شوان و گاوان چاکە بۆ مەڕ و مانگاکانیان

دەخـــوازن. بـۆ ئـەمـەش قـەڵـەویـان دەكـــەن و بـیـر لـە ســـوود و بەرژەوەندیی خۆیان ناكەنەوە. لەسەروو ئەمەشەوە، بە بۆچوونی تۆ، دەسەڵاتدارەكانی شار، ئەوانەی پڕ بە واتاكە دەسەڵاتدارن، یان دەسەڵاتدارێكی ڕاستەقینەن كەسانی ژێردەستە بە مەڕ و مانگا دانانێن و بەجۆریكی دیكە دەیانبینن و شەوو ڕۆژیش بیر لە بەرژەوەندیی خۆیان دەكەنەوە. تۆ زۆر دووریت لەوەی بتوانیت لە واتای دادوەری و دادوەر، یان نـادادوەری تێبگەیت. تۆ نازانیت دادوەری چاكەیە ئەوەی دەیكات سوودی بۆ لایەنی بەهێزتر تێدایە و زیانیش بەوانە دەگەیەنێت ملكەچ و خزمەتكارن. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە نادادوەرییە و ئەو كەسانە بەختەوەر دەكات، كە ژێردەستە و ملكەچن، سوود و قازانجی بۆ لایەنە بەهێزەكەی تێدا نییە. تۆش ئەی سوكراتی ساویلكە، بەمجۆرە لە كێشەكە تێبگە: دادوەر دەستكەوتی كەمتری لە نادادوەر هەیە. یەكەم، لە كۆتایی هەموو بەڵین و ڕێكەوتنێكدا، دادوەرێك كەمتری لە نادادوەرێك بەركەوتووە. دووەم، لەنێو شاردا دادوەرێك زۆرتر لە نادادوەرێك باج (بە دەوڵەت) دەدات. لە گەڕانەوەی پارەش، لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ خەڵكی دادوەر هیچی بەرناكەوێت، ئەوەی نـادادوەرە بەشێكی زۆر دەبات. لە كۆتاییشدا، كاتێك هەردووكیان لە فەرمانگایەكدا فەرمانڕەوایی دەكەن ژیانی تایبەتی دادوەرەكە تێك دەچێت، چونكە بە كاركردنەوە سەری قاڵە، سوودی تایبەتی لە كاركردنەكە وەرناگرێت. لەبەرئەوەی كاری ناڕەواش ناكات كەسوكاری، یان ئەوانەی داوای كاری ناڕەوای لێ دەكەن لەگەڵیا كۆك نین و گلەیی لێ دەكەن. ژیانی نادادوەرەكەش بەپێچەوانەوە (ناشێوێت). لێرەدا دووبارەی دەكەمەوە: كەسێك خاوەنی دەسەڵات و هێزێكی گەورە لەوانی دیكە دەباتەوە. ئەگەر دەتەوێت بزانیت كەسێكی دادوەر، چ سوود و قازانجێك بە خۆی دەگەیەنێت، بیر لەم كەسە بكەوە. هەروەها بەئاسانی لە واتای تەواوی نـادادوەری تێدەگەیت و دەزانیت ئەوە چیە، كە نادادوەرێك دەكات بە بەختەوەرترین و سەرپێچیكارەكانیش بە كڵۆڵ و بەدبەخت. ئەمە زۆردارییە، كە بەزۆر موڵكی ئەوانی دیكە داگیر دەكات، گرنگ نییە ئەو موڵكە ماڵی كەسێك بێت یان دەوڵەت، وردەوردە هەمووی بۆ خۆی دەبات. ئەگەر كەسێك بە كارێكی نادادوەرانەی بچووكیش هەستێت

سزا دەدرێت و ناوی دزی- پەرستگاکان، بارمتەچی، دزی منداڵان یان جەردەی لێ دەنرێت و بە تاوانبار دادەنرێت. دەسەڵاتدارێکیش موڵکی هاوڵاتیەکان داگیر دەکات و دەیانچەوسێنێتەوە، لەبری تاوانبارکردنی بە بەختەوەر و خواناس نەک لەلایەن هاوڵاتیەکانەوە، بەڵکو ئەوانەی دەشزانن، کە زۆرداره دادەنرێت. ئەوانەی نارەزاییان بەرانبەر نادادوەری هەیە، لەبەرئەوەیە، کە پێوەی دەناڵێنەوە نەک نەیکەن. لەبەرئەمە، سوکرات، ئەگەر نادادوەری بەم ڕادە گەورەیە ببیسترێت لە دادوەری بەهێزتر و ئازادتر و شارەزاترە. لە خاڵی یەکەمیشدا باسم کرد، کە دادوەری لەوەدایە سوود بە لایەنی بەهێزتر بگەیەنێت و نادادوەریش سوود و بەرژەوەندیی خۆی دەوێت.

پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە بە درێژی، تراسیماکۆس، وەکو چۆن کەسێک لە خۆشتن دەبێتەوە، ویستی بڕوات. ئەوانەی دانیشتبوون ڕێگەیان نەدا و زۆریان لێ کرد بمێنێتەوە. منیش داوام لێ کرد نەڕوات. گوتم: پاش ئەم گوتارە، ئەی تراسیماکۆس، بەبێئەوەی بیسەلمێنیت ڕاست دەکەیت یان نا چۆن دەڕۆیت؟ تۆ وادەزانیت باسکردن لەسەر نرخی ژیان و سوودوەرگرتن لە ژیان بۆ هەریەکێک لە ئێمە کێشەیەکی گەورە نییە؟ تراسیماکۆس گوتی: «من بەو جۆرە دێمە بەرچاوت؟؟» بە هەر جۆرێک بێت تۆ بایەخ بە ئێمە نادەیت، گرنگ نییە بۆ تۆ ئێمە بە چ جۆرێک دەژین، باش یان خراپ.

تۆ ئێمە بە نەزان دادەنێیت. هەوڵ بدە فێرمان بکە، کارێکی چاکە خێرخوازی کۆمەڵێک کەسانی وەکو ئێمە بیت. بەش بە حاڵی خۆم، بە ڕوونکردنەوەکەت ڕازی نیم. لەو باوەڕەدا نیم، نادادوەری سوودی لە دادوەری زۆرتر بێت، کە هیچ سنوورێکی بۆ دانەنێیت. با بڵێین کەسێکی زۆردار ئەوەندە دەسەڵاتی هەیە بە فڕوفێڵ یان شەڕەنگیزی نادادوەرییەکەی خۆی سەقامگیر دەکات. هێشتا من ناگەیەنێتە ئەو باوەڕەی نادادوەری سوودی لە دادوەری زۆرتر بێت. دڵنیام لەم دانیشتنەدا کەسێکی دیکەش هەیە بەمجۆرە بیر لە کێشەکە دەکاتەوە و لەگەڵ مندا هاوڕایە. کەوابوو، بیسەلمێنە ئێمە لە دانانی دادوەری لە پلەیەکی بەرزتر لە نادادوەری بۆ ژیانمان هەڵەین.

من چۆن بیسەلمێنم ئەگەر ئێوە بەم بۆچوونەی من ڕازی نەبن؟

چی دیکه ڕوون بکەمەوە؟ دەبێت بەڵگەکەم هەڵگرم و بیرژێنمە نێو دەروونتانەوە؟ خوا نەکات! ئەو کارە مەکە! بەڵام جارێ لەسەر بیروڕاکەی خۆت بە. ئەگەر گۆڕیت فێڵمان لێ مەکە. تۆ، تراسیماکۆس، لە پێشتر لە پێناسکردنی پزیشکدا بە واتای خۆی- کە بەردەوام بێت لەسەر چاکردنەوەی (نەخۆشیەکان) ئامادە نەبوویت. تۆ لەو باوەڕەدایت شوان بۆ داوەتکردن مەڕەکانی قەڵەو بکات، یا دەیەوێت لە فرۆشتندا پارەی چاک بکەن. شوانی، کار و مەبەستی دیاریکراوی خۆی هەیە، کە لە هونەری شوانیدایە، بۆیە بە پێویستم زانی (لە گفتوگۆکەی پێشوودا) لەگەڵتا هاوڕا بم. لەسەر ئەو خاڵە ڕێکەوتین، کە هەموو دەسەڵاتێک لە فەرمانڕەواییەکەدا بەرژەوەندیی ئەوەی دەوێت، کە فەرمانڕەوایی دەکات. ئایا تۆ لەو باوەڕەدای فەرمانبەری شارەکان، ئەوانەی بەڕاستی فەرمانبەرن بە حەز و ئیرادەی خۆیان فەرمانڕەوایی دەکەن؟ بەخوا، بەو جۆرە بیر ناکەمەوە، من دەزانم.

بەڵام، ئەی تراسیماکۆس، تۆ لەو باوەڕەدا نیت لە جۆرەکانی دیکەی فەرمانبەریدا کەس لەپێناوی فەرمانبەرێتیدا فەرمانبەر نییە. لەبەر مووچەکەیە و لەو باوەڕەشدان، کە ئەوان خزمەتی خەڵکی دەکەن؟ ئایا جیاوازی لەنێوان کارمەندەکاندا نییە؟ تکایە تاکو بگەینە ئاکام دژی باوەڕەکەی خۆت مەدوێ.

بەڵێ، جیاوازییان لەنێواندایە.

هەر یەکێکیش لە هونەری کارکردن سوودی جیاوازمان پێ دەگەیەنێت. بۆ نموونە، پزیشک تەندروستیمان دەداتێ، کەشتیەوانیش بە سەلامەتی گەشتەکەمان بۆ بەڕێ دەکات. ئەوانی دیکەش سوودی جیاوازیان هەیە؟

بێگومان.

کارکردنیش، وەکو پیشە مووچەمان دەداتێ، چونکە بۆ مووچە پەیداکردنە؟ یان پزیشکی و کەشتیەوانی وەکو یەکدی دەبینیت؟ تەنانەت ئەگەر بڵێیت، کەشتیەوان تەندروستی باشە، چونکە گەشتوگوزاری نێو دەریا سوودی بۆ تەندروستی هەیە، هێشتا ناتوانیت کەشتیەوانی و پزیشکی بە یەک جۆر هونەر دابنێیت؟

بێگومان ناتوانین.

ئەگەر کەسێک بە مووچەدەستکەوتنیش تەندروستیەکەی چاک بێتەوە، ناتوانیت کارکردنەکەی بۆ مووچەپەیداکردن بە هونەری پزیشکی دابنێیت؟

نا.

کەوابوو، لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەوین، کە هەر یەکێک لەو هونەرانە سوودی خۆی هەیە؟

بەڵێ، وایە.

ئەگەر هەموو ئەو خاوەن کارانە پێکەوە سوود وەرگرن، پێویستە سوودوەرگرتنە هاوبەشەکەیان لەو کارە زیادەوە هاتبێت، کە هەموویان کردوویانە؟

وادیــارە. دەبێت پرسیار سـەبـارەت بە کـارە زیـادەکـە بکەین. ئـەو کـارەی مووچە بۆ کارمەندەکان پەیدا دەکـات، ئایا هونەری مووچەپەیداکردنە؟

بەنابەدڵییەوە، تراسیماکۆس ڕازی بوو.

کەوابوو، ئەم سوودوەرگرتنە، یان مووچەوەرگرتن لە ئاکامی هونەرەکەیانەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو ئەگەر بەوردی تەماشا بکەین پزیشکی تەندروستی دروست دەکات و کارکردن بۆ مووچەش مووچە پەیدا دەکات، خانووسازی خانوو دروست دەکات... هتد. هەر یەکێک لـەم هونەرانە سـوود و کـاری تایبەتی خـۆی هەیە. ئەگەر مووچە نەدرێت، هیچ سوودێکی دیکە هەیە لە کارکردنەکەدا بە کارمەند بگات؟ وا دەردەکەوێت نەبێت.

ئەگەر بەخۆڕایش کار بکات، سوود دەگەیەنێت؟

بەڵێ، وابزانـم وایـە. کـەوابـوو، تراسیماکۆس، ئێستا ئاشکرایە، هیچ کارمەندێک یان فەرمانبەرێک سـوود بە خۆی ناگەیەنێت. بۆ بەرژەوەندیی بەرانبەرەکەی، یان لایەنە لاوازەکە، نەک بەهێزترەکە کار دەکات. کەمێک لە پێشتر گوتم، کەس بە حەز و ئیرادەی خۆی نابێت بە فەرمانبەر تاکو گێرەو کێشەی خەڵکی چارەسەر بکات. هەر یەکێک لە فەرمانبەران داوای مووچە بەرانبەر کارکردنەکەیان دەکەن، بەڵام داوای چاکترین شت بۆ خۆی ناکات و دەیەوێت بەرانبەرەکەی ڕازی بکات. بۆیە پێویستە مووچە لە شێوەی پارە و ڕێزلێنان بدەین

بەو کەسەی فەرمانبەرەو لە سەرپێچیکردنیشا سزا بدرێت.

گلاوکۆن گوتی: «سوکرات چ مەبەستێکت هەیە؟ من دوو شێوەی مووچەکە دەزانم، بەڵام تێناگەم سزادان چۆنە و بۆچی بە مووچەی دادەنێیت». تۆ لە مووچەی ئەو کەسە چاکانە تێناگەیت، کە دەیانەوێت بە چاکی فەرمانڕەوایی بکەن و بە خواستی خۆیان بەو کارە هەڵدەسن؟ تۆ نازانی (ئەم جۆرە کەسە چاکانە) ڕقیان لە ناوداری و پارەیە؟

دەزانم.

کەسێکی چاک بۆ پارە و ناوداری فەرمانڕەوایی ناکات. نایەوێت بەئاشکرا پارە وەرگرێت و بە مووچەخۆر ناوزەد بکرێت. بۆئەوەی بە دز دانەنرێت لەژێریشەوە پارە نابات. بۆ ناوداریێتیش هەوڵ نادات، چونکە حەز لە ناوداریێتی ناکات. ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە ئارەزووی فەرمانڕەواییان کرد، دەبێت جۆرێک لە پاداشت و سزادانیان بۆ دابنرێت. ئێستا، گەورەترین سزادانیش بۆ ئەوانەی نایانەوێت فەرمانڕەوایی بکەن چوونە ژێر دەسەڵاتی فەرمانبەرێکە، کە لە ئەوان خراپتر فەرمانڕەوایی دەکات. بە بۆچوونی من، ترس لەم ژێردەستەییە هانی کەسانی خاوەن ڕێز دەدات ببن بە فەرمانبەر. ئەوان بۆ خۆشی خۆیان نابن بە فەرمانبەر، چونکە فەرمانرەوایی کارێکی چاکە. بڕیاردانەکەیان لەو پێویستیەوە سەرهەڵدەدات، کە نایانەوێت کەسانێک لەوان کەمتر ئەو دەسەڵاتەیان هەبێت. لە شاری کەسە چاکەکاندا، وەکو ئێستا چۆن خەڵکی لەسەر گرتنی دەسەڵات لەگەڵ یەکدا جەنگیانە، لەسەر وازهێنان لە دەسەڵاتیش دەبێت بە مشتومڕ. لەوێدا ئاشکرا دیارە ئەوەی خاوەن دەسەڵاتە و فەرمانڕەوایی دەکات سوودی خۆی ناوێت و بیر لە بەرژەوەندی ژێردەستەکانی دەکاتەوە. هەر کەسێک ئەم ڕاستیە بناسێت کەسانی دیکە سوودی پێ دەگەیەنن و خۆی تووشی ئەو گرفتە ناکات بۆ ئەوان سوودبەخش بێت. لەبەر ئەمە، بەهیچ جۆرێک لەو خاڵەدا، کە دادوەری سوودگەیاندن بە لایەنە بەهێزترەکە بێت لەگەڵ تراسیماکۆسدا هاوڕا نیم. دوایی جارێکی دیکەش دەگەڕێمەوە سەری و باسی دەکەم. خاڵەکەی دیکەی تراسیماکۆس، گوایە ژیانی کەسێکی نادادوەر لە ژیانی دادوەرێک باشترە (خۆشترە) دەبێت بە بایەخەوە تەماشای بکرێت. ئەی گلاوکۆن، تۆ چ جۆرە ژیانێکیان هەڵدەبژێریت؟

بۆچوونی کێت بەلاوە ڕاستە؟
به بیروڕای من ژیانی دادوەرێک سوودبەخشترە.
تۆ ئەو چاکانەی ژیانی نادادوەرێکت لەیادە تراسیماکۆس بۆی باس کردین؟
بەڵێ، بەڵام ڕازی نەبووم. دەبێت هەوڵ بدەین بە بیروباوەڕەکەمان ڕازی بێت. پێویستە نادروستی بۆچوونەکەی بسەلمێنین؟
بەڵێ، پێویستە. ئەگەر ئێمەش وەکو ئەو، ئەو شتە چاکانە ڕیز بکەین، کە لە ژیانی دادوەردا هەن پێویستمان بە حەکەمێک دەبێت تەماشای هەردوو لیستەکە بکات و بڕیار لەسەر باشی یەکێکیان بدات. ئەگەر لە وەڵامی پرسیارەکەش بکۆڵینەوە و بگەینە ئاکامێک، کە هەمووومان پەسەندی دەکەین، ئەوا ئێمە دەبین بە توێژەرو حەکەمیش.
بێگومان.
منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: «چ ڕێگەیەکت لا باشترە؟»
دووەمیان. منیش گوتم: «تراسیماکۆس وەرە. لە سەرەتاوە وەڵاممان بدەوە. تۆ دەڵێیت، نادادوەری تەواو لە دادوەری تەواو سوود بەخشترە
بەڵێ، ئەوە ڕای منەو هۆکەشم بۆ ڕوون کردنەوە.
باشە، چ لەبارەی ئەمەوە دەڵێیت؟ تۆ دەتوانیت یەکێکیان بە چاکە و ئەوی دیکە بە خراپە دابنێیت؟
بەڵێ. مەبەستت ئەوەیە، کە دادوەری چاکە و نادادوەری خراپەیە؟
نەخێر ئەو واتایە نابەخشێت. من دەڵێم نادادوەری سوودی زیاترە. مەبەستت بەتەواوی چیە؟ ئەوەی دەیڵێم بەپێچەوانەی گوتەکەی تۆوەیە.
ئایا مەبەستت ئەوەیە، کە دادوەری خراپە؟
نەخێر، ژیریی و سادەییە. ئەی بۆ تۆ نادادوەری دڵڕەشییە؟ نەخێر، حوکمدانیکی چاکە. کەوابوو، تۆ تراسیماکۆس، کەسانی نادادوەر بە ژیرتر و چاک دادەنێیت؟ بەڵێ، ئەوانەی بەتەواوی نادادوەرن، ئەوانەی شارەکە و دانیشتووانی شارەکەش دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. ئەی تۆ وا دەزانیت من باسی گیرفانبڕێک دەکەم؟ ئەی ئەم جۆرە کارە خراپەش سوودبەخش نییە ئەگەر (گیرفانبڕەکە نەگیرێت؟) هەرچەندە

پێویست ناکات ئەم بەراوردە بکەین.
من لە تۆ تێدەگەم. بەڵام، لەوە سەرم دەسوڕمێت، کە تۆ نادادوەری بە چاکەو زانایی دادەنێیت، بەپێچەوانەشەوە دەڕوانیتە دادوەری.
بەڵێ، بۆچوونەکەم بەم جۆرەیە.
تۆ کێشەکە دژوارتر دەکەیت. تێناگەم چ مەبەستێکت هەیە! ئەگەر بڵێیت نادادوەری سوودبەخشە و هاوکات خراپیشە یان شەرمەزارییە لەگەڵتا ڕێدەکەوم و ئەو کاتە بەئاسایی مشتومڕمان لەسەر دەکرد، بەڵام ئێستا تۆ لەو باوەڕەدایت نادادوەری شتێکی چاکە و زاناییشی دەخەیتەسەر.
تۆ چاک لە بۆچوونەکەم تێگەیشتوویت.
ئێستا باوەڕ دەکەم ئەی تراسیماکۆس، کە گاڵتە ناکەیت و بۆچوونەکەت بە ڕاست دادەنێیت.
چی بۆ تۆ دەگۆڕێت ئەگەر باوەڕ بە ڕاستی بۆچوونەکەم بکەم یان نا؟ ئەمە بۆچوونی منە و تۆش دەتوانیت ڕەتی بدەیتەوە. هیچ ناگۆڕێت، بەڵام وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەوە: تۆ لەو باوەڕەدایت دادوەرێک بیەوێت فەرمان بەسەر دادوەرێکی دیکەدا بدات؟ نەخێر، لەوێدا (دادوەری یەکەم) ڕێز و پاکی خۆی دەدۆڕێنێت. یان فەرمان بەسەر کەسێکدا بدات، کە کارێکی دادوەرانە دەکات؟ نەخێر، ئەوەش ناکات. ئایا لەو باوەڕەدایە، کە بۆی هەیە فەرمان بەسەر کەسێکی نادادوەردا بدات و ئەو کارەش بە دادوەری دابنێت؟ دەیەوێت ئەم کارە بکات و خۆی بە خاوەن مافیش دادەنێت، بەڵام ناتوانێت.
پرسیارەکەم، ئەوە نەبوو. دەمەوێت بزانم نادادوەرێک دەیەوێت فەرمانڕەوایی نادادوەرێکی دیکە بێت و ئەمەش بە مافی خۆی دابنێت؟
ئەو دەیەوێت.
ئەی لەبارەی نادادوەرەکەوە؟ بە ڕەوای دەبینێت فەرمانڕەوایی کەسێکی دادوەر، یان ئەو کەسە بکات، کە کارێکی دادوەرانە دەکات؟
بێگومان، دەیەوێت. ئەو فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر هەموو کەسێکدا بە ڕەوا دەبینێت.
ئایا نادادوەرێک فەرمانڕەوایی بەسەر نادادوەرێکی دیکەدا یان کەسێک بە کارێکی نادادوەرانە هەستێت دەکات؟ ئایا هەوڵ دەدات

گەورەترین دەستمایەی هەبێت؟ ئەوە دەکات. کەوابوو، با بڵێین دادوەرێک فەرمانڕەوایی کەسێکی وەکو خۆی ناکات. تەنیا نادادوەر دەیەوێت ئەوانەی وەکو خۆی نین بخاتە ژێر دەسەڵاتیەوە.

چاک بۆ کێشەکە چوویت. نادادوەریش کەسێکی چاک و ژیرترە لە دادوەر؟

چاک بۆ ئەم خاڵەش چوویت. کەوابوو کەسانی نادادوەر ژیرتر و چاکترن؟ وانیە؟

بەڵێ وایە. چۆن وەکو ئەوان دەبێت؟ باشە، هەر کەسێک لەوان (نادادوەرەکان)، خەسڵەتی ئەوانەشیان هەیە، کە لەو دەچن. بێگومان.

باشە، تراسیماکۆس، تۆ کەسێکی مۆسیقازان لە مۆسیقانەزانێک جیا دەکەیتەوە؟

بەڵێ. کێ لەم دووانە لە مۆسیقادا لەوی دیکە ژیرترە؟ مۆسیقازانەکە ژیرە و ئەوی دیکە نا. لەو شتانەش چاک دەزانێت، کە تیایاندا ژیرە و خراپیشە لەوانەدا، کە تیایاندا ژیر نییە؟

بەڵێ. ئەمە بۆ پزیشکیش دەبێت؟ بەڵێ.

دەتوانین بڵێین مۆسیقازانێک لە کۆککردنی ژێی گیتارەکەدا و توندکردنەوەیان دەیەوێت لە مۆسیقازانێکی دیکە بباتەوە و خۆی بە باشتر دابنێت؟وا ناڵێم. بەڵام، ئەو دەیەوێت لەوانە بەرێتەوە، کە مۆسیقازان نین؟ بەڵێ وایە.

لەبارەی پزیشکەکەوە چ دەڵێیت؟ ئەو لە دانانی پارێز بۆ نەخۆشەکەی هەوڵ نادات لە پزیشکێکی دیکە باشتر بێت؟ بێگومان وانیە. بەڵام، دەیەوێت لەوانە بەرێتەوە، کە پزیشک نین؟ بەڵێ.

تۆ لەو باوەڕەدایت لە هەموو جۆری زانین، یان نەزانیندا زانا دەیەوێت لە نەزان بەرێتەوە، یان لەوان باشتر لە کێشەیەک بدوێت و وەکو نەزانەکان بۆ کێشەکە نەڕوات؟ دەشێ بەو جۆرە بێت تۆ باسی دەکەیت. ئەی لەبارەی نەزانەوە، چ دەڵێیت؟ هەوڵ دەدات لە زاناو نەزانێکی دیکەش باشتر بێت؟ لەوانەیە. ئایا زانا کەسێکی ژیرە؟

لەگەڵتا هاوڕام. ژیریش کەسێکی چاکە؟

بەڵێ. کەوابوو، کەسێکی ژیر و چاک نایەوێت لەوانە بەرێتەوە و دەسەڵات بەسەر ئەوانەدا بسەپێنێت، کە لە خۆی دەچن. ئەو بەرانبەر

ئەو کەسانە دەسـەڵات بەکاردەهێنێت، کە لەو ناچن. دەردەکەوێت بەمجۆرە بێت. بەڵام کەسێکی نەزان دەیەوێت لە زانایەک و نەزانێکیش بەرێتەوە. دەردەکەوێت بەمجۆرە بێت.
ئێستا، تراسیماکۆس، گەیشتووینەتە ئەو باوەڕەی کەسێکی نادادوەر دەیەوێت دەسەڵاتی بەسەر دادوەرو نادادوەریشدا هەبێت؟ ئایا تۆ بڕوات بەمە نییە؟ بەڵێ، بڕوام وایە. دادوەریش دەیەوێت دەسەڵاتی بەسەر نادادوەردا هەبێت؟
بەڵێ.
کەوابوو، دادوەر کەسێکی ژیر و چاکە، نادادوەریش وەکو کەسە نەزانەکە خراپە. وادیارە.
لەسەر ئەوەش ڕێکەوتین هەر یەکێک لەوان خەسڵەتی ئەو کەسەشی تێدایە، کە لە خۆی دەچێت.

بەڵێ، ڕێکەوتین. کەوابوو، دەرکـەوت، کە دادوەر ژیر و چاکە، نـادادوەریش نـەزان و خراپە. تراسیماکۆس، بەئاسانی لەسەر ئەم خاڵانە ڕێکەوت. لەبەرئەوەی هاوینیش بوو ئارەقی زۆری دەردەدا. لەپڕدا بینیم تراسیماکۆس ڕووی سورهەڵگەڕا. گوتم، پاش ڕێکەوتنمان لەسەر ئەو خاڵەی دادوەری چاکە و زانایی بێت و نادادوەریش خراپە و نەزانین دەڵێم، باشە با ئەمە وا بێت. هاوکات گوتمان نادادوەری بەهێز نییە، یان تۆ ئەمەت بیر ناکەوێتەوە؟
لەبیرمە، بەڵام لەسەر ئەم خاڵە لەگەڵتا هاوڕا نیم. دەتوانم بە درێژی لەسەری بدوێم. من ئەو کارە ناکەم، چونکە تۆ تاوانبارم دەکەی بەوەی وتـارت بۆ بخوێنمەوە. لەبەرئەمە ڕێگەم بدە بۆچوونەکەم ڕوون بکەمەوە، یان پرسیاری خۆت بکە و منیش دەڵێم، «باشە» و وەکو ژنە پیرەکان بۆڵە ناکەم. تۆ دژی بۆچوونەکەی خۆت مەدوێ.
مادامەکی ڕێگەی قسەکردنم نادەیت بە دڵی تۆ وەڵامی پرسیارەکەت دەدەمەوە.
تۆ داوای چ دەکەیت؟
هیچ، بەخوا تۆ چ دەخوازی، من ئەوە دەکەم.
پرسیاری خۆت بکە.

من هەمان پرسیاری پێشوو دەکەم تاکو بە ڕێکوپێکی مشتومرەکەمان سەبارەت بە دادوەری و نادادوەری بخەینەگەر و لەوێوە دەستمان پێکرد، کە نادادوەری لە دادوەری بەهێزتر بێت. ئێستا ئەگەر دادوەری بە چاکە و زانایی دابنێین دەردەکەوێت، کە لە نادادوەری بەهێزتر بێت، چونکە نادادوەری نەزانینە. هەروەها، تراسیماکۆس، من ئەم کێشەیە بەگشتی و بێ سنوور باس ناکەم. ئایا تۆ لەو باوەڕەدای کە داگیرکردن و چەوساندنەوەی دانیشتووانی شارێک لەلایەن شارێکی دیکەوە نادادوەرانە و زۆرداری بێت؟١٦ هەڵبەتە. ئەمە کاری باشترین شارە، بەتایبەتی ئەو شارەی نادادوەری بەتەواوی تیایدا سەقامگیر بووە. تێدەگەم، کە ئەمە بۆچوونی تۆیە، بەڵام ئەو خاڵەی دەمەوێت لێی بکۆڵمەوە ئەمەیە:

ئەو شارەی دەبێت بە خاوەنی دەسەڵات، بەهێزترە لەوی دیکە دەتوانێت بەبێ دادوەری، یان پێویستی شارەکە بۆ دادوەری ئەو دەسەڵاتە پەیدا بکات؟ بەگوێرەی بۆچوونەکەی تۆ، کە دادوەری ژیری و چاکەیە، بێگومان پێویستی بە دادوەری هەیە. بە بۆچوونی منیش (ئەو شارە) پێویستی بە نادادوەری و زۆرداریيە.

تۆ، تراسیماکۆس، سەرنجم ڕادەکێشیت. تۆ وەڵامی چاکیش دەدەیتەوە. دەمەوێت دڵت خۆش بکەم.

تۆ لەوەدا شارەزایت. زۆرتر دڵخۆشم بکە و وەڵامی ئەم پرسیارەشم بدەوە: تۆ لەو باوەڕەدایت شارێک، لەشکرێک، دەستەو تاقمێکی دزو چەتە، یان خێڵێک مەبەستیان زۆرداری بێت. ئەگەر دژی یەکدی بن ئەو زۆرداریيە وەدەست بهێنن، یان زۆرداری لەگەڵ یەکدیا بکەن؟

بێگومان نا.

ئەگەر بەرانبەر یەکدی زۆردار نەبن؟ دەستکەوتی زۆرتریان دەبێت؟

بێگومان.

نادادوەری، ئەی تراسیماکۆس، دەبێتە هۆی جەنگی ناوخۆ، ڕق و کینە و دادوەریش هاوڕێیەتی و هاوئامانج دادەمەزرێنێت. ئایا وانیە؟ بۆئەوەی دژی تۆ نەوەستم، دەڵێم وایە.

تۆ باش لەگەڵما دەڕۆیت. پێم بڵێ: ئەگەر نادادوەری لە هەر شوێنێکدا بێت ڕق و کینە بڕوێنێت، ئایا لەنێو کۆیلە و مرۆڤە ئازادەکانیشدا نابێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕق و کینە؟ جەنگی ناوخۆ دروست ناکات؟ نابێتە هۆی ڕووخاندنی مەبەست و ئومێدی هاوبەشی خەڵکی؟
بەدڵنیاییەوە.

ئایا جیاوازیی لەنێوان دوو کەسدا پەیدا ناکات و نایانکات بە دوژمن؟ دەیانکات بە دوژمن. ئەگەر نادادوەری لەنێو تاکە کەسیدا بڕوێت و سەرهەڵدات، دەسەڵاتەکەی بۆ دروستکردنی دووبەرەکی ون ناکات؟

با بەو جۆرە بێت.

دەردەکەوێت، نادادوەری بەهێز بێت یەکەم، بۆ تێکشکاندنی یەکێتیی شارێک، خێزانێک یان لەشکرێک، چونکە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی جەنگی ناوخۆ و جیاوازییەکان. دووەم، هەر یەکێک لەم دەزگایانە دەکات بە دوژمنی خۆی و ئەوی دژیشی ڕادەوەستێت، بۆ نموونە دادوەری، وانیە بەدڵنیاییەوە.

تەنانەت لە تاکە کەسیشدا هەمان کاریگەریتی هەیە. یەکەم، ڕێگەی دەستکەوتەکانی دەبەستێت، چونکە ئەو کەسە لەنێو جەنگی ناوخۆدایە و دووەمیش دەیکات بە دوژمنی خۆی و ئەوانەی باوەڕیان بە دادوەری هەیە. ئایا ئەم کاریگەریتییەی نییە؟

بەڵێ. ئەنجا خواکانیش دادوەرن؟ با بڵێین دادوەرن.

کەوابوو، نادادوەرێک دوژمن و دادوەریش هاوڕێی خواکانە.

بەبێ ترس وشەکانی خۆت بڕازێنەوە بۆئەوەی ئەوانەی لە دەورمان دانیشتوون ڕقیان لێم نەبێت من دژت ناوەستم.

وەرە، مێزی وشەکانم بە وەڵامەکەت بڕازێنەوە. ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕەی کەسانی دادوەر ژیرترو خاوەن توانا بن، نادادوەرەکانیش بەمجۆرە نین تەنانەت پێکەوە ناژین و هەمیشە دەستەو یەخەی یەکدی ڕادەوەستن. هاوکات لەنێویاندا جۆرێک دادوەری هەیە، کە ڕێگەیان پێ نادات ئەوەی لەگەڵ خەڵکیدا دەیکەن لەگەڵ یەکدیدا نەیکەن. ئەمەش بووە بناغەی دەستکەوتەکانیان. لە سەقامگیرکردنی زۆردارییەکەیاندا،

نیوە گەندەڵ بوون، (چونکە ئەوانەی بەتەواوی خراپ و نادادوەرن، هیچ دەستکەوتێکیان نابێت).
ئەمە ئەو خاڵانە بوو ڕوونمان کردنەوە. ئێستاش پێویستە لەو خاڵە بکۆڵینەوە، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ئەویش ئەوەیە کەسانی دادوەر بەختەوەرترن و باشتر لە کەسانی نادادوەر دەژین. وابزانم ئاشکرایە، کە دەبێت وابێت، بەڵام ئەم باسە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زۆرتر هەیە، چونکە گرنگە و پەیوەندی بە چۆنیەتی ژیانمانەوە هەیە. فەرموو تۆ پێشکەوە بکەوینە گەڕان بەدوایدا.
من پێش دەکـەوم. پێم بڵێ، تۆ بڕوات بە شتێک هەیە، کە پێی دەوترێت کارکردنی ئەسپ؟
بەڵێ.
ئایا پێناسەکەشی نەبەستراوە بە شێوەی کارکردنی ئەسپەوە؟ یان بە باشترین شێوەی بەکارهێنانەکەوە؟
لە مەبەستت تێناگەم.
با بەجۆرێکی دیکە بۆت باس بکەم: دەتوانین بێجگە لە چاومان (ئەندامێکی دیکەی لەش) بۆ بینین بەکاربهێنین؟
بێگومان نەخێر. یان بێجگە لە گوێ شتێکی دیکە بۆ بیستن بەکار بهێنین؟
نەخێر.
کەوابوو، دروستە بڵێین بینین و بیستن کارکردنی چاو و گوێن؟
بەدڵنیاییەوە.
لەبارەی ئەم خاڵەوە چ دەڵێیت؟ دەتوانیت خەنجەر، مقەست یان هەر شتێکی تیژ بۆ بڕینەوەی دارمێوێک بەکاربهێنیت؟ بێگومان.
ئایا باشتر نییە بۆ بڕینەوەی دارمێوەکە ئەو مقەستە بەکاربهێنیت، کە بۆ بڕینی مێو دروست کراوە؟ بەڵێ باشترە.
پێویست دەکات بڕینەوە بە کارکردنی مقەستەکە دابنێین؟
ئێستا، لەوانەیە لە مەبەستی پرسیارەکەی پێشووم تێبگەیت، کە گوتم هەر شتە شێوەی کارکردنی خۆی هەیە، کە تایبەتە بەو شتەوە و لەو شێوەی کارکردنەدا لە شتەکانی دیکە چاکترە.
تێدەگەم و لەو باوەڕەدام هەر شتە کارکردنی دیاریکراوی خۆی

هەیە.

باشە. هەر یەکێک لەو شتانەی بە کارکردنی خۆی هەڵدەستێت چاکە؟ با جارێکی دیکە بگەڕێینەوە سەر نموونەی (کارکردنی) چاو (بۆ بینین).

بەڵێ، وایە. کەوابوو، چاویش چاکەی هەیە؟ هەیەتی.

گوێکانمان کارکردنی خۆیان هەیە؟

بەڵی.

کەوابوو، گوێ چاکەی هەیە؟

هەیەتی.

هەموو شتەکانی دیکەش بەمجۆرە (خاوەنی چاکەن)؟

بەڵی.

ئایا چاوەکانمان کارەکانی خۆیان بە باشی دەبەن بەڕێوە، ئەگەر لە چاکە بێبەش بن و خراپ بن؟

چۆن دەتوانن، بەڕێوەی بەرن. تۆ مەبەستت ئەوە نییە، ئەگەر کوێر بن چۆن دەبینن؟

هەر جۆرە چاکەیەکیان هەبێت گرنگ نییە. من ئێستا باسی ئەوە ناکەم. مەبەستم ئەوەیە،

کە هەر شتێک مادامەکی شێوەی کارکردنی خۆی هەیە ئەگەر بەو کارە هەستێت چاکە و نەیتوانی خراپە.

بەڵێ، ئەوە ڕاستە.

ئەگەر گوێکانمان لەو چاکەیە بێبەش بن، کە هەیانە بە خراپی کارەکەیان بەڕێوە دەبەن.

نەخێر ئەمەش بۆ هەموو شتێکی دیکە دروستە؟

وادیارە. باشە، با بیر لەم کێشەیە بکەینەوە: ئایا دەروون جۆرە کارکردنێکی هەیە، کە هیچ شتێکی دیکە (بێجگە لە دەروون) ناتوانێت بیکات، بۆ نموونە نیگەرانبوون بۆ شتەکان، فەرمانڕەوایی و نواندن و گەلێک شتی دیکەش؟ ئایا ئەم کارکردنانە دەبن بە تایبەتمەندێتیی شتێکی دیکە؟

نەخێر.

ئەی لەبارەی ژیانەوە چ دەڵێیت؟ ئایا ژیان کاری دەروون نییە؟

بێگومان کاری دەروونە.
ئایا باوەڕمان بە چاکەی دەروون نییە؟
باوەڕمان هەیە.
ئایا، ئەی تراسیماکۆس، دەروون دەتوانێت بە چاکی کارەکانی خۆی بکات ئەگەر لەو چاکە تایبەتەی خۆی بێبەش بکرێت، یان ئەمە هەرگیز ڕوونادات؟
ئەمە ناگونجێت.
ئایا ئەمە نامانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی دەروونی خراپ بە خراپی فەرمانڕەوایی دەکات و ئاگای لە دەوروبەر دەبێت، دەروونی چاکیش بە چاکی؟
بەڵێ، دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕە.
ئێستا لەسەر ئەوە ڕێکەوتین، کە دادوەری بۆ دەروون چاکەیەو نادادوەریش خراپە؟
بەڵێ، ڕێکەوتین.
کەوابوو، بەو ئاکامە دەگەین، کە کەسێکی دادوەر یان دەروونێکی دادوەر باش و نادادوەریش خراپ دەژی.
بەگوێرەی بەڵگەکەت دەردەکەوێت ئاکامەکە دروست بێت. هەروەها، ئەوەی باش بژی بەختەوەرە و بەپێچەوانەشەوە ڕاستە.
بێگومان.
کەوابوو، دادوەر بەختەوەر و نادادوەریش کلۆڵە. با وابێت.
کەس کلۆڵ ناکات و بەختەوەری دەکات. بەدڵنیاییەوە. هەروەها، ئەی تراسیماکۆس، نادادوەری هەرگیز لە دادوەری بەسوودتر نییە.
با ئەمە، لەم جەژنەدا، بۆ باندیس خوانی ڕازاوەی تۆ بێت.

ئەی تراسیماکۆس، پاش ئەوەی لە توڕەبوونەوەکەت سارد بوویتەوە و بە نەرمی لەگەڵ مندا هەڵسوکەوتت کرد، خوانێکی ڕازاوەم بۆ خۆم دانەنا. هەست دەکەم وەکو زۆرخۆرێکیش پەلاماری هەموو شتێکی خۆشم داو تامم کردن. پێش وەڵامدانەوەی پرسیارەکەمان سەبارەت بە دادوەری لێکۆڵینەوەکەمان خۆی گەیاندە ئەو خاڵەی باسی خراپە و نەزانین یان چاکە و زانین بکەین. لەوێدا ئەو کێشەیە هاتە پێش،

که گوایە نادادوەری لە دادوەری بەسوودتر بێت. من نەمتوانی واز لە پرسیارەکەی پێشوو (سەبارەت بە واتای دادوەری) بهێنم. ئاکامی مشتومڕەکەمان، بە بیروڕای من، منی گەیاندە ئەو خاڵەی هیچ نەزانم. ئەگەر لە واتای دادوەری تێنەگەم ناتوانم بزانم چاکە هەیە یان نا؟ یاخود کەسێکی دادوەر بەختەوەرە یان کڵۆڵ؟





وا تێگەیشتین لێرەدا مشتومڕەکەمان تەواو بووبێت، بەڵام دەردەکەوێت ئەوەی باسم کرد سەرەتا بووبێت. گلاوکۆنیش نەبەردانە تراسیماکۆسی ڕەت دایەوە و بە سوکراتی گوت: ئایا تۆ ئێمەت گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی، دادوەری لە هەموو بارودۆخێکدا لە نادادوەری چاکتر بێت؟ ئایا دەتەوێت ئێمە ڕازی بکەیت؟

منیش گوتم دەمەوێت بەپێی توانا ڕازیتان بکەم.

باشە، تۆ ئەوەت نەکردووە. پێم بڵێ، لەو باوەڕەدای جۆرێک چاکە هەیە ئێمە پێشوازی لێ دەکەین، چونکە خۆی چاکەیە و لەبەرئەوە نییە ئاکامەکەیمان لا پەسەندە، بۆ نموونە خۆشی یان ئەو چێژانەی بێ زیانن و بێجگە لە خۆیان ئاکامێکی دیکەیان نییە؟

دڵنیام لەوەی هەیە.

ئایا چاکە هەیە ئێمە حەزی لێ بکەین، کە لە خۆیدا چاکەیە، هەروەها ئاکامێکی چاکیشی هەیە، بۆ نموونە، بینین یان تەندروستی چاک؟ ئێمە لەبەر ئەو دوو خەسڵەتەیە دەمانەوێن.

بەڵێ.

ئایا جۆری سێیەمی چاکە هەیە، وەکو وەرزش، دەرماندان بە نەخۆش، دەرمان خۆی و هەروەها پارە؟ ئەمانە وەکو ئەرکی گران دەبینرێن، بەڵام سوودیان بۆ ئێمە هەیە و ئێمەش لەبەرئەوە هەڵیان نابژێرین، کە خۆیان چاکن، بەڵکو بۆ پاداشت و دەستکەوتەکەمانن.

سێ جۆری هەیە، بەڵام چۆن باسی دەکەیت؟

تۆ دادوەری بە کامیان دادەنێیت؟

بەش بە حاڵی خۆم دەیخەمە ڕیزی باشترین چاکەکان و لەبەرئەوەی (دادوەری) لە خۆیدا چاکەیە و ئاکامی باشیشی هەیە دەبێت بە ڕێزەوە تەماشای بکرێت. ئەمە بۆچوونی هەموو کەسێک نییە. زۆر کەس لەوانەیە دادوەری بە ئەرکێکی گران دابنێن. ئەوانەی دەیانەوێت دادوەر بن مەبەستیان ناوداری و خەڵاتوەرگرتنە، کە لە ئاکامی دادوەرییەوە پەیدا دەبن. لەو باوەڕەشدان، کە لەبەرئەوەی ئەرکێکی گرانە دەبێت

وازی لێ بهێنرێت.
دەزانم، ئەوە بۆچوونی خەڵکیە بەگشتی.
تراسیماکۆس لەم بۆچوونەوە چەند ساتێک لەمەوبەر هەڵەی بەرانبەر واتای دادوەری کرد و بە شان و باڵی نادادوەرییدا هەڵی دا، بەڵام دەردەکەوێت من ئەو کەسە بم، کە خێرا فێر نابم. کەوابوو، وەرە، گوێ بگرە و بزانە گرفتەکەت چیە.
من وا بیردەکەمەوە، کە تراسیماکۆس پێش ئەوەی بە ئاکامی گفتوگۆکەی بگات کۆڵی دا. بۆچوونەکانی هەردووکتان منی ڕازی نەکردووە. دەمەوێت لە واتاکانی دادوەری و نادادوەری تێبگەم، بزانم هەر یەکێک لەو دووانە چ هێزێکیان لەنێو خۆیاندا و لەنێو دەروونی مرۆڤدا هەیە. من نامەوێت لێرەدا باس لە دەستکەوت و ئاکامەکانیان بکەم. ئەگەر تۆ ڕازی بیت بۆچوونەکەی تراسیماکۆس دووبارە دەکەمەوە.
یەکەم، باسی بۆچوونی زۆربەی کەسان لەسەر دادوەری و سەرچاوەکەی دەکەم.
دووەم، ئەوە ڕوون دەکەمەوە چۆن ئەوانەی دادوەری دەکەن خۆیان ئەو کارەیان هەڵنەبژاردووە و دادوەری بە پێویست نەک لەبەرئەوەی چاکە دادەنێن.
سێیەم، ئەوان هۆی تەواویان بۆ سەقامگیرکردنی دادوەری (بەم جۆرەی بیری لێ دەکەنەوە) بەدەستەوەیە، چونکە ژیانی نادادوەر وەکو دەڵێن باشترە لە ژیانی دادوەرەکان.
سوکرات، من باوەڕم بە ئەوان نییە. تێگەیشتنم بۆ ئەم کێشەیە ئاڵۆزە و کەسانی وەکو تراسیماکۆس ئەوەندە لەم باسە دواون لە ئاستیاندا کەڕ بووم. حەزدەکەم گوێ لەو کەسە بگرم، کە بەرگری لە دادوەری دەکات و دەیسەلمێنێت لە نادادوەری چاکتر بێت.
حەزدەکەم ئەوەش لە تۆ ببینم. لەبەرئەمە من بە درێژی بە شان و باڵی ژیانی نادادوەرانەدا هەڵدەدەم و ڕێگە بە تۆش دەدەم باسی دادوەری بکەیت و دژی نادادوەری بوەستیت.
دەمەوێت بزانم تۆ ئەم کارەت لا پەسەندە؟
من زۆر کات حەزم لەم جۆرە مشتومڕانەیە. ئەمە بێگومان کێشەیەکە

مشتومڕی لەسەر بکرێت. زۆر باشە. کەوابوو، لە خاڵی یەکەمەوە، سەبارەت بە واتای دادوەری و سەرچاوەکەی دەست پێدەکەین. گوایە هەستان بە کارێکی نادادوەرانە بە سروشت چاکە، بەڵام ئازارچێژتن بە نادادوەرییەوە خراپە. هەروەها ئەو ئازارچێژتنە سەر دەکا و چاکەکەش تێدەپەڕێنێت ئەگەر کەسێک نادادوەری بکات و ئازاریش بەهۆیەوە بچێژێت. ئەوەی تواناو دەسەڵاتی نادادوەری نەبێت خۆی لە ئازارچێژتنەکەشی دووردەخاتەوە. لەگەڵ کەسانی دیکەدا ڕێدەکەوێت و دەگاتە بەستنی پەیمان و دانانی یاسا و داواکارییە یاساییەکانیش بە دادوەری دادەنێ. بە بۆچوونی ئەو، ئەمە ناوەڕۆک و سەرچاوەی دادوەرییە. شتێکە لەنێوان چاکترین و خراپتریندا.

چاکترین شت لەوەدایە بەبێ ئازارچێژتن نادادوەر بێت. خراپترینیش ئەوەیە، کە ئازار بچێژێت و هاوکات نەتوانێت تۆڵەی خۆی بسەنێت. دادوەری دەکەوێتە نێوان ئەم دووانەوە. خەڵکی بەهای بۆ دادەنێن نەک لەبەرئەوەی چاکە، بەڵکو لەبەر بێ دەسەڵاتی خۆیانە. ئەوەی دەسەڵاتیشی هەبێت نادادوەری سەقامگیر بکات، لەگەڵ کەسانی دیکەدا بۆ دوورکەوتنەوە لە ئازارچێژتن ڕێناکەوێت. ئەم کارە بۆ ئەو گەمژەییە.

ئەمە ناوەڕۆک و سەرچاوەی دادوەرییە.

بەئاشکرا دەردەکەوێت ئەوانەی دادوەرن بەبێ خواستی خۆیان بەو کارە هەڵدەستن. هەروەها لەبەرئەوەشە، کە توانایان نییە کارێکی نادادوەرانە بکەن. ئەگەر ئازادی بدەین بەوانەی دادوەر و نادادوەرن بۆمان دەردەکەوێت حەز و ئارەزووەکانیان بە کوێ دەگەن. لەو حاڵەتەدا دادوەرێک بە دەستی خوێناوییەوە لەسەر ئەو ڕێگایە دەگرین، کە نادادوەرێکی پیا دەڕوات. ئەمەش پەیوەندی بەو حەز و ئارەزووەوە هەیە، کە هەموو کەسێک دەیەوێت لەوانی دیکە بەرێتەوە و زۆرتر دەستکەوتی هەبێت.

ئەمە بۆ هەموو کەسێک چاکەیەکی سروشتیە. بەڵام ئەو سروشتە، بە دانانی یاسا زۆری لێ کراوە، تەشەنەکردنەکەی سنوردار و ڕەوا بێت.

ئەو ئازادییەی باسم کرد، باشتر لە واتاکەی تێدەگەین، ئەگەر

دوو کەسە دادوەر و نادادوەرەکە هێزەکەی باپیری (گیگسی لیدیا)یان هەبێت١٧. ئەم چیرۆکەش بەمجۆرەیە:

گوایە ئەو شوانی یەکێک لە پاشاکانی لیدیا بووە. ڕۆژێک زریانێک هەڵدەکات و بوومەلەرزەش زەوی شەق دەکات، ئەویش کەلێنێکی گەورە بۆ خۆی و مەڕەکانی دەدۆزێتەوە و پەنای بۆ دەبات. گەورەیی کەلێنەکەی بەلاوە سەیر دەبێت و بەناویا دەگەڕێت. شتی سەیری تێدا دەدۆزێتەوە. لە هەموویان سەیرتر کونێک بوو لەنێو ئەسپێکی لە برۆنز دروستکراودا. ئەو کونە، وەکو پەنجەرەیەک بوو. کاتێک لەو کونەوە تەماشای ناوەوەی کرد لاشەیەکی گەورەی مردوویەکی بینی، کە بە ڕووتی دانرابوو. بێجگە لە موستیلەیەکی زێڕ لە پەنجەیدا هیچی بە لەشەوە نەبوو. موستیلەکەی لە پەنجە دەرهێناو کەلێنەکەی بەجێهێشت. مانگی جارێکیش دەبووایە سەبارەت بە مەڕومالاتەکە بۆ پاشا بدوایەو مستیلەکەشی لە پەنجە دەکرد. کاتێک لەنێو کەسەکانی دیکەدا لەلای پاشا دادەنیشت (یاری بە مستیلەکە دەکرد) و سەری مستیلەکەی وەردەگێڕا لەبەرچاوی دانیشتووانەکە ون دەبوو (کەس نەیدەتوانی ببینێت). کەسانی دەوروبەری باسیان دەکرد بەبێئەوەی بزانن لەگەڵیانا دانیشتووە. کاتێکیش مستیلەکەی بە دیوی خۆیدا وەرگێڕانەوە، دەبینرا. ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر بوو. بۆئەوەی لەمە دڵنیا بێت چەند جارێک تاقی کردەوە. پاش ئەمە بڕیاری دا سیخوڕی بۆ پاشا بکات. لە کۆشکی پاشا توانی ژنی پاشا هەڵفریوێنێ و لەگەڵیا پێکەوە پاشا بکوژن و خۆی بکات بە پاشا.

گریمان دوو مستیلەمان هەیە و لە پەنجەی دوو کەسدان، یەکێکیان دادوەر و ئەوەی دیکە نادادوەر. ئێستا هەر یەکێک لەم دووانە ئەوەندە پاک نەدەبوو تاکو دادوەری نەکات و خۆی لەماڵی کەسانی دیکەش دووربخاتەوە، لە کاتێکدا دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی لەنێو بازاڕ بخوات، خۆی بکات بە ماڵانداو سێکس لەگەڵ ئەوانەدا بکات حەزیان لێ دەکات، لەنێوان زیندانەکاندا بکوژێ و بە ئارەزووی خۆشی زیندانیەکان بەردات. بەمجۆرە ئەو کارانە بکات، کە لەنێو کۆمەڵدا بچێتە ڕیزی خواوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی دەیکات لە کاری نادادوەرەکەوە جیاواز نییە. هەردووکیان یەک ڕێگەیان گرتۆتەبەر. ئەمەش بۆ هەندێک بەڵگەیە

بۆ ئەو بۆچوونەی، کەس بە ئارەزووی خۆی دادوەر نییە و ناچار دەکرێت. کەس لەو باوەڕەدا نییە دادوەری چاک بێت ئەگەر پەیوەندی بە ژیانی تایبەتی تاکە کەسەوە هەبێت، چونکە ئەو تاکە لە هەر شوێنێکدا بیەوێت دادوەری دەکات. هەموو کەسێکیش لەو باوەڕەدایە، کە نادادوەری بۆ ئەو تاکە زۆرتر لە دادوەری سوودبەخشترە. ئەوانەی شوێن ئەم بۆچوونە دەکەون لەو باوەڕەدان ئەو کەسە ڕاستە. ئەوەی نەیەوێت نادادوەری بکات و ئەو هەلەشی بۆ هەڵکەوێت دەست لە ماڵ و سامانی کەسانی دیکە نەدات و بە کارێکی خراپی دابنێت، کۆمەڵ لە ترسی ئازارچێژتن بە نادادوەرییەوە ڕێزی لێ دەگرێت و بەباشی باسی دەکات.

ئەمە بۆ خاڵی دووەم بەسە. سەبارەت بە چۆنیەتی ژیانیشەوە لەوێدا دەتوانین حوکمێکی دروست بدەین، کە دادوەرترین لە نادادوەرترین کەس جیا بکەینەوە. ئەمەش لە بیرکردنەوەی مندا، جیاوازییەکەیانە.

ئێمە هیچ شتێک لە نادادوەری و دادوەری ڕووت ناکەینەوە. هەریەکێک لەنێو خۆیدا پڕ و تەواوە. یەکەم، پێوستە بزانین، کە نادادوەر، وەکو کارمەندێکی ژیر هەڵسوکەوت دەکات، بۆ نموونە، وەکو باشترین کەشتیەوان یان پزیشک دەزانێت چی بکات و چ شتێک کارەکەی لەوانی دیکە جیا دەکاتەوە. ئەگەر هەڵەیەکیش بکات هەوڵی ڕاستکردنەوەی دەدات. لەم ڕووەشەوە هەوڵدانی سەرکەوتووانەی نادادوەرێک پێویستە نەبینرێت ئەگەر ئەو کەسە نادادوەرترین بێت. ئەوەی گیرا بە نەشارەزا دادەنرێت. لە حاڵەتی نادادوەریشدا دەبێت بەبێئەوەی دادوەر بێت بە دادوەر دابنرێت. نادادوەرە تەواوەکەش دەبێت نادادوەری تەواوی پێ بدرێتو هیچی لێ ڕووت نەکرێتەوە. پێویستە ڕێگەشی بدرێتێ لە کاتێکدا گەورەترین نادادوەری دەکات هاوکات ناوداریێتی بۆ خۆی وەکو گەورەترین دادوەر پەیدا بکات. ئەگەر هەڵەیەکی کرد، یان خلیسکا دەبێت بتوانێت هەڵەکە ڕاست بکاتەوە. ئەگەر کارێکی نادادوەرانەی ئاشکرا بوو دەبێت، بتوانێت کەسانی دیکە ڕازی بکات یان هێز بەکاربهێنێت. لەو کاتەشدا دەبێت ئازا بێت و ئەوەندەش سامان و هاوڕێی هەبێت بەکاریان بهێنێت.

پاش گریمانەکەت بۆ ئەو کەسە باسی دادوەرێک دەکەین ، کە سادەو

چاکە، وەکو ئەسخیلۆس نایەوێت کەسانی دیکە باسی چاکییەکەی بکەن١٨. پێویستە ناوداریێتی ئەو کەسەش لابەرین، چونکە ناوداریێتی بۆ دادوەر ڕێزلێنان و خەڵات دەهێنێتە پێش. لەبەرئەمە دیار نابێت، کە ئەو کەسە لەپێناوی سەقامگیرکردنی دادوەریدا دادوەرە یان بۆ خەڵات و ڕێزلێنانە. هەرچەندە ئەو نادادوەری ناکات و بۆ ئەمەش ناودارترین کەسە، بەڵام پێویستە لە هەموو خەسڵەتەکانی دیکەی ڕووت بکەینەوە و بەرانبەر نادادوەرێک دایبنێین. ئەمەش لەبەردەم ئەو ئەزموونەدا ڕایدەگرێت، کە ڕێگەی نادات ناوداریێتی خراپ لە ئاستی دادوەرییدا دڵڕەقی بکات. هەروەها، تاکو ئەو ڕۆژەی دەمرێت با بەمجۆرە بژی و بەدرێژایی تەمەنیشی وا بیر لە خۆی بکاتەوە، کە دادوەر نییە. لێرەدا هەردوو لایەنەکە دەگەن بە ئەوپەری دادوەری و نادادوەری. ئێمە دەتوانین بیدۆزینەوە کێ لەم دووانە بەختەوەرترە.

گلاوکۆن لە وەڵامدا گوتی، هەوڵ دەدەم بەمجۆرەی باسم کردن لەبارەی ژیانیانەوە بدوێین.

ئەگەر باسەکەشم کاڵوکرچ بێت، ئەوان مشتومڕەکەیان لەسەر نادادوەرییە. بە دیدی ئەوان دادوەر نابەختەوەرە، بە قامچی لێدەدرێت، لەسەر کومبارێکی زبر بە زنجیر بەستراوەتەوە و چاوەکانیشی بە ئاگر کوێر دەکرێن. پاش ئەم ئەشکەنجەدانە لەشی کون دەکرێت. ئەنجا تێدەگات، ئەوانەی دادوەرن تووشی چ ناخۆشییەک دەبن و دادوەری ناکات.

بێگومان گوتەکەی ئەسخیلۆس باش جێگەی خۆی دەگرێت. گوایە ئەوانەی پشتگیری نادادوەری دەکەن دەڵێن نادادوەرێکی ڕاستەقینە ژیانی خۆی لەسەر بناغەی ڕاستی شتەکان دادەمەزرێنێت و بەگوێرەی بیروڕای (کەسانی دیکە) ناژی. نایەوێت کەسانی دیکە بە نادادوەرێکی ئاسایی دایبنێن و هەوڵ دەدات بەڕاستی نادادوەر بێت. لەو شوێنەدا شورا هەبێت.

کەلێنێکی گەورە لە بیرکردنەوەدا دەدۆزێتەوە. لەبەر ناوداریێتی، وەکو دادوەرێک فەرمانڕەوایی شارەکەی دەکات و بەئارەزووی خۆی ژن دەهێنێت و هاوسەر بۆ منداڵەکانی خۆی پەیدا دەکات، هاوکارو یاریدەدەر بۆ خۆی دەگرێت. لەم کارانەشدا سوود وەردەگرێت، بیر

له بەرژەوەندیی خۆی دەکاتەوە، چونکە لە ئاکامی زۆرداریيەکەی خۆی ناترسێت و سڵ ناکاتەوە. لە هەردوو لایەنەکانی ژیاندا، ژیانی تایبەتی خۆی و ژیانی گشتی، بیر لە سوودوەرگرتن دەکاتەوە و بەسەر دوژمنەکانیا زاڵ دەبێت. خێر بۆ خواکان دەکات و ئاگای لێیان دەبێت. خواکانیش زۆرتر ئاگای لێیان دەبێت. لەبەرئەمەشە، سوکرات کە دەوترێت خواکان و خەڵکی باشتر ئاگایان لە ژیانی نادادوەرەو خزمەتی دەکەن.

پاش ئەم گوتەیەی گلاوکۆن حەزم کرد وەڵامی بدەمەوە. ئەدیمەنتۆسی برای هەڵیدایە و گوتی: تۆ بڕواناکەی ئەم بۆچوونە گونجاو بێت؟

منیش گوتم، بۆچی نا؟

بەڵام گرنگترین خاڵ تاکو ئێستا باس نەکراوە. منیش لە وەڵامدا گوتم، باشە بەگوێرەی گوتەکەی (هۆمیرۆس) دەبێت برا لە پشتت بێت! ئەگەر گلاوکۆن شتێکی لەبیر چووبێت تۆ یارمەتی بدە و بۆی تەواوکە. باسەکە دەمی منی لە ئاستی دادوەرییدا بەستوە.

گوتی، ئەوەی تۆ دەیڵێیت بێ واتایە. من لێرەدا بەتەواوی هەموو لایەنەکانی بەڵگەکەی گلاوکۆنم لەسەر ئەو خاڵە ڕوون کردەوە، کە دەڵێت، دادوەری چاکە و نادادوەریش خراپ. باوکەکان یان ئەوانەی بەتەمەنن بە منداڵەکانیان و ئەوانەی لە خۆیان بچووکترن دەڵێن، کە پێویستە دادوەر بیت، چونکە ناودەرکردن، وەکو دادوەر بەرەو ئاکامی ئەو بیرۆکەیەت دەبات، کە کەسێک لە دەزگایەکی دەوڵەتدا لەنێو خێزاندا یان ئەو نموونانەی گلاوکۆن هێنانیەوە دادوەرانە هەڵسوکەوت دەکات. لە ڕازیکردنی خواکاندا باسی زۆر شتی چاک دەکات، کە بە دیدی هۆمیرۆس و هزیۆدیش خواکان بە خواناسێکی چاکی دادەنێن. هزیۆد دەڵێت، خوا داربەڕوو سەوز دەکات، بەڕوو بەسەر لقەکانیەوە گەورە دەبن، لەنێو قەدەکەشیا هەنگ کورە دەکات. هەروەها، خورییەکی زۆریش بە مەڕەکان دەدات. گەلێک شتی چاکی دیکەش بۆ دادوەر دانراوە و لەم بارەیەوە هۆمیرۆس دەڵێت: کاتێک پاشا خوا دەناسێت دادوەری بەرقەرار دەبێت و زەمینی ڕەشیش گەنم و جۆی بۆ دەگرێت و میوەی درەختەکانیش شۆر دەبنەوە. مەڕەکانی دەزێن و دەریاش

پڕ دەبێت لە ماسی.
موسایۆس و کوڕەکەی لەو باوەڕەدان خواکان شتی زۆرتر بە دادوەر دەدەن١٩ . لە چیرۆکەکانیاندا دادوەریان لە جیهانی هادیس (بەرزەخ) لەسەر دۆشەکێکی نەرم داناوەو چواردەوری کەسانی چاک و خواناسن و سەبەتە گوڵی بە دیاری دەدەنێ و پێکەوە دەخۆنەوە.
هەندێکی دیکە لەو باوەڕەدان خەڵاتی خواکان زۆرترە و خواناس ڕەگەزەکەی خۆی و منداڵی منداڵی ڕەت دەکات. بەمجۆرە بە باشی باسی دادوەری دەکەن. لە جیهانی بەرزەخدا نادادوەر و بێ بڕوا دەسوتێن. زۆریان لێ دەکرێت ئاو بە بێژنگ هەڵگرن. لە ژیاندا ناویان دەزڕێت و ئەو ئەشکەنجانەشیان دەدرێت، کە گلاوکۆن بۆ دادوەر باسی کردن. بەمجۆرە بە باشی باسی دادوەری و بە خراپەش باسی نادادوەری دەکرێت. بێجگە لەمەش، سوکرات، بیر لەم بەڵگەیە لەسەر دادوەری و نادادوەری بکەرەوە، کە هەندێک شاعیر و کەسانی دیکە شوێنی دەکەون. هەموو بە یەک دەنگ دەڵێن، دادوەری و مامناوەندێتی دوو شتی چاکن، بەڵام دژوار و کارێکی سەختن. هاوکات نادادوەری بەرەڵایی و ئاسان و خۆشە. تەنیا بە بۆچوونی هەندێک یان لە چەند یاسایەکدا شەرمەزارن. ئەوانەی لەم باوەڕەدان نادادوەری بە سوودمەندتر لە دادوەری دادەنێن. ڕێز لە کەسانی دەوڵەمەند و دڕندەش دەگرن. هەرچەندە دەزانن، کە کەسانی لاواز و هەژار چاکن، بەڵام بە کەمتر دایان دەنێن.
ئەوەی لەم بۆچوونەدا سەرنجڕاکێشە ئەو خاڵەیە، کە گوایە خواکان بەدبەختی و ژیانی ناخۆش بە کەسانی چاک دەدەن و کەسە خراپەکانیش بەختەوەر دەکەن. پیاوانی ئایینی و پێغەمبەرەکان زوو زوو لە دەرگای ماڵی دەوڵەمەندەکان دەدەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە پاڕانەوە و نوشتەکانیان دەسەڵاتی خوایەتیان تێدایە. ئەگەر دەوڵەمەندێک یان باوباپیری ئەو دەوڵەمەندە کارێکی نادادوەرانەی کردبێت بەو نەریتە (ئایینیە) چارەی بۆ دەدۆزنەوە. دەتوانن ڕێگەشی نیشان بدەن چۆن بە جادوو زیان بە دوژمنەکەی بگەیەنێت. شاعیرەکان باسی ئەمەش دەکەن و ئەم جۆرە مۆسیقایە بە گیتارەکەیان لێدەدەن:
خراپە سامانێکە ئاسان دەست دەکەوێت، شەقامەکەی ڕێکە و خۆی

دێتە سەر ڕێگات، بەڵام خواکان شیرینیان لەنێوان ئێمە و چاکەدا داناوە. هەروەها شەقامی (چاکەکردن) درێژ و لێژە و سەختە. هەندێک دەڵێن هۆمیرۆس لەو باوەڕەدا بووە، مرۆڤ کار بکاتە سەر خواکان، چونکە دەڵێت:

نوێژ و بەڵێن و قوربانی
خواکان دەهەژێنن
لە کاتی سەرپێچی و گوناهکردنیشا
خێر و بخورسووتاندن
نەخشە و پیلانەکانیان دەگۆڕن20.

باسی نووسراوەکانی موسایۆس و ئۆرفیۆس دەکەن21. گوایە نەوەکانی سولونە و موساس نەریتی ئایینیان (بۆ ڕازیکردنی خواکان) داناوە.

هەموو کەسێکیان گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی، کە نەریتە ئایینیەکەیان کەسانی نادادوەر لە گوناهەکانیان پاک دەکەنەوە و لە ئەشکەنجەی ڕۆژی دوایی (قیامەت) دەیانپارێزن و ئازار و ئەشکەنجەی زۆریش بۆ ئەوانەیە، کە خۆیان لە گوناهەکانیان پاک ناکەنەوە. سوکرات، ئایا ئەم هەموو باسانە لەبارەی خواکان و چاکە و خراپەوە کارێک دەکەنە سەر ژیانی لاوەکان؟ مەبەستم ئەو کەسانەیە، کە ژیرترن و بەئاسانی گۆڕانکاری لە بۆچوونەکانیاندا دروست دەکەن و هەوڵ دەدەن ڕێگای ژیانیان لەوێوە دیاری بکەن. کەسێکی لاو پرسیار دەکات و دەڵێت: "دەبێت بە دادوەری، یان فێڵبازی و خەڵەتاندن بژێوی خۆم مسۆگەر بکەم؟" لە وەڵامیشدا دەڵێت: «بەگوێرەی گەلێک لە گوتەکان ئەگەر من وەکو دادوەر نەبینرێم، دادوەری سوودی نییە. ناخۆشی و سزادانی ئەوانەش ئاشکرا دیارە، کە دادوەرن، بەڵام دەڵێن ئەو نادادوەرەی بژێویی خۆی مسۆگەر کردووە و بە دادوەریش ناسراوە، وەکو خوا دەژی». لێرەدا، ئەم بۆچوونانە بەسەر ڕاستیدا زاڵ دەبن. بڕیار لەسەر چۆنیەتی بەختەوەری دەدەن و زانایەکیش دەڵێت دەبێت ڕوو لەو جۆرە ژیانە بکەم.22 من دەبێت بە ڕوویەکی چاکی درۆوە ئەوانە هەڵخەڵەتێنم، کە لە دەورمن. ڕێوییە چڵێس و فێڵبازەکەی ئەرخیلۆخۆسیش بشارمەوە23، بەڵام دڵنیابە کەسێکیش هەیە، کە لەو

باوەڕەدایە ئاسان نییە خراپە تاکو سەر بشاریتەوە. بەهەرحاڵ، ئەگەر بتەوێت بەختەوەر بیت دەبێت یەکێک لەو ڕێگایانە بگریتە بەر. بۆئەوەی بەنهێنیش بمێنیتەوە کۆمەڵە و یانەی ڕامیاریی نهێنی دادەمەزرێنین. مامۆستای چاکیش هەن فێری کۆبوونەوە و یاسادانانمان بکەن. کەوابوو، بۆ ڕازیکردنی کەسانی دیکە لەلایەکەوە و زۆرلێکردنیان لەلاکەی دیکەوە بەئاسانی بەڕێوە دەچێت. چی بۆ خواکان بکەین؟ بێگومان، ناتوانین بەدزییەوە زوڵمیان لێ بکەین. ئەگەر خواکان نەبن، یان پێویستیان بە مرۆڤ نەبێت بۆچی خۆمانیان پێوە ماندوو بکەین؟ ئەگەر خواکان هەبن و مرۆڤیان بەلاوە گرنگ بێت ئێمە لە ڕێگەی شاعیرەکان و یاسادانەرانەوە هەموو شتێکیان لەبارەوە فێر دەبین. ئەوانیش (مەبەستی شاعیرەکان و یاسادانەکانە) هەر ئەو کەسانەن پێمان دەڵێن، خواکان بە قوربانیدان و نوێژکردن دڵخۆش دەبن. دەبێت باوەڕ بەم بۆچوونەشیان بکەین. ئەگەر باوەڕ بکەین (کە دەتوانین خواکان دڵخۆش بکەین) با نادادوەر بین و کەمێکیش لەوەی دەستمان دەکەوێت (بۆ خواکان) بکەین بە خێر. خەڵاتی دادوەریش لەوێدایە، کە خواکان سزات نادەن، بەڵام ئەگەر ئێمە نادادوەر بین بەروبوومی زوڵمکردنەکەمان و سەرپێچیکردنەکەمان دەست دەکەوێت و خێریش بۆ خواکان دەکەین تاکو دڵیان خۆش بێت و سزامان نەدەن.

ئایا لە جیهانی بەرزەخدا بۆ ئەو تاوانانەی لێرە کردومانە، سزای ئێمە و منداڵی منداڵیشمان نادرێت؟ هاوڕێم، لاوێک بەگوێرەی ئەو شتانەی بیری لێ دەکاتەوە، هەڵسوکەوت دەکات. لە شارە گەورەکاندا واباوە تەنانەت منداڵەکانی خواکانیش، کە دەبن بە پێغەمبەر و شاعیر ڕایدەگەیەنن «نەریتە شاراوەکانی ئایینەکان، لێبوردنی خواکان، خاوەنی هێز و دەسەڵاتی گەورەن».

بۆچی ئێمە دادوەری لە جێگەی نادادوەری هەڵبژێرین؟ هەندێک لە سەرچاوە پایەدارەکان لەگەڵ ئەوەدا هاوڕان، کە ئەگەر بە فڕوفێڵ نادادوەرییەکەمان سەقامگیر کرد ڕووی خۆمان دەرنەخەین خواکان و کەسانی دیکەش لەم ژیانە و دوای مردنیش لێمان ڕازی دەبن. لەم بۆچوونەوە، سوکرات پێم بڵێ، چۆن کەسێکی خاوەن دەسەڵات ئەنجامی دەسەڵاتەکەی بەهۆی زانینەوە، سامان، لەش یان خێزانەوە

بێت، کە گوێی لە ستایشکردنی دادوەری دەبێت، پێکەنینی نەیەت؟ ئەگەر کەسێک بیسەلمێنێت ئەم بۆچوونە نادروستە دادوەری-چاکتر نییە و زانیارییەکی لەباریشی سەبارەت بە دادوەری هەیە، بە دڵێکی گەورەو بەخشینەوە دەڕوانێتە نادادوەری. ئەو دەزانێت بێجگە لەوانەی گەیشتوونەتە پلەی خوایەتی قێز لە نادادوەری دەکەنەوە، یان ئەوانەی زانیارییەکی تەواویان لەبارەوە هەیە و خۆیانی لێ دەپارێزن. هەندێک دژی نادادوەری ڕادەوەستن. ئەم هەڵوێستەیان ئاشکرا بە نەبوونی دەسەڵاتەکەیانەوە بەستراوە، کە ناتوانن نادادوەرانە بەکاری بهێنن. هەرکەسێک لەوان دەسەڵاتی هەبێت، یەکەم کەس دەبێت بۆ سەقامگیرکردنی نادادوەرییەکەی و دەسەڵاتەی دەخاتەگەر. بێجگە لەم هۆیانە هیچی دیکە هانی من و گلاوکۆنی نەدا، کە بڵێین: «سوکرات، ئەوانەی لە کۆنەوە، لەو قارەمانانەوە، کە گوتەکانیان ماونەتەوە تاکو زانایانی ئەمڕۆ ستایشیان بۆ دادوەری کردووە و (بەچاکترینی دادەنێن) دژی خودی نادادوەری نەدواون، تەنیا باسی ئاکامەکانیان، وەکو ناوداریێتی، شەرەف، خەڵات، کردووە، کە خراپن. تەنانەت لەوە نەدواون، کە هەریەکێک لەم ئاکامانە چ زیانێکی دەروونی بەو کەسە نادادوەرە دەگەیەنێت. شیعرەکان و گوتەکانیان ڕوونیان نەکردۆتەوە یان خراپی نادادوەری بۆ دەروونی نادادوەرەکە ناسەلمێنن. باسی ناکەن چۆن دادوەری چاکترە. ئەگەر تۆ ئەم کێشەیەت بۆ ئێمە ڕوون بکردایەتەوە و بتسەلماندایە (کە دادوەری ئاکامێکی نالەباری بەسەر دەروونی تاکەوە هەیە)، ئێمەش لە ئاستی نادادوەرییەکدا خۆمان نەدەپاراست. دەمانتوانی ببین بە پاسەوانی (دەروونی) خۆمان و لەو خراپەیە دووردەکەوتینەوە. تراسیماکۆس، یان کەسێکی دیکە، دەتوانێت هەمان بۆچوونی ئێمەیان هەبێت. ئەی سوکرات، دەشێت زۆرتریش لەسەر کێشەکە بڕۆن. باسی دادوەری و نادادوەری بکەن، بەڵام من دەمەوێت ڕەتدانەوەکەی تۆ ببیستم، بۆیە هەموو توانای خۆم کۆدەکەمەوە و لەگەڵتا دەدوێم. لەبەرئەمە بەبێ سەلماندن دادوەری لە نادادوەری بە چاکتر دامەنێ. دەمەوێت ڕوونی بکەیتەوە هەر یەکێک لەو دووانە، چ کاریگەریێتیەکی بەسەر دەروونی بکەرەکەیەوە هەیە، کە دادوەری بە چاکە و نادادوەری بە خراپە دەردەخات؟ ئەگەر شوێن پێشنیارەکەی

گلاوکۆن بکەویت و ناوداریێتی ساختە بە دادوەری و نادادوەرییەوە بچەسپێنیت، ئێمە هان دەدەیت بە نهێنی کاری نادادوەرانە بکەین. لەم حاڵەتەدا بۆچوونەکەت لەوەی تراسیماکۆس جیا ناکەینەوە و دادوەری دەبێت بە سوود و قازانجی ئەوانەی بەهێزترن. نادادوەریش سوودگەیاندنە بە خودی بکەرەکە نەک کەسانی لاوازتر.

تۆ لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەویت، کە دادوەری یەکێکە لە چاکترین کردەوە. یەکێکە لەو کردەوانەی ئاکامی چاکیان لێ دەردەچێت. ئێمە لەبەر ئاکامەکەیان و هاوکات لەبەرئەوەش دەمانەوێت، کە شتێکە لە خودی خۆیدا چاکە. بۆ نموونە، ببینین، ببیستین، فێربوون، یان تەندروستی باش، ئەمانە ئەو شتە چاکانەن، کە تەنیا لەبەر بەروبووم و ئاکامەکانیان بە چاکیان دانانێین، بەڵکو خۆشیان چاکن. دادوەریش بخەرە ڕیزی ئەم چاکانەوە و خودی دادوەری و ئاکامەکەشی بۆ بکەرەکەی چاکە، نادادوەریش زیانبەخشە. تۆ لێرەدا بیر لە مووچە و ناوداریێتی مەکەوە.

ئەگەر کەسێکی دیکە ستایش بۆ دادوەری بکات و ڕەخنە لە نادادوەری بگرێت، بڵێ یەکەمیان مووچەی بەرز و دووەمیان زیانی لێوە دەردەچێت، ڕازی دەبم، بەڵام داوای سەلماندنی بۆچوونەکە لە تۆ دەکەم، چونکە هەموو ژیانت بۆ توێژینەوە تەرخان کردوە. کەوابوو، بەبێ سەلماندنی باسەکە لەسەر چاکەی دادوەری و خراپەی ناداوەری جێ مەهێڵە. کاریگەریێتی هەریەکێک لەوان بەسەر دەروونی بکەرەکەوە باس بکە. گرنگیش نییە بکەرەکەی بەدزی خواکان و کەسانی دیکەوە بەو کارە هەڵدەسێت، یان نا.

من گوتەکانی گلاوکۆن و ئەدیمەنتۆسم پەسەند دەکرد. لەم مشتومڕەدا زۆرتر دڵیان خۆش کردم و گوتم: ئێوە منداڵی باوکێکی مەزنن. خگلاوکۆنیش بۆ ستایشکردنی ئازایەتیەکەی لە جەنگی میگارادا نواندی نووسی، کوڕەکانی (ئەریستۆن) نەوەی ئەو مرۆڤە ناودارەن، کە لە خوا دەچێت بە دیدی من، ئەمە جوان بۆی چووە. لایەنێکی پیرۆزی پێداون تاکو ڕازی نەبن بەوەی نادادوەری لە دادوەری چاکتر دابنێن و بەناوی ئەویشەوە بەشداری گفتوگۆکە بکەن. دڵنیام لەوەی لە باسەکەی خۆشتاندا بەئەنجام نەگەیشتوون. ئەمەش لە شێوازی

ژیانتاندا دەردەکەوێت. چەند باوەڕتان پێ بکەم ئەوەندەش سەرم لێ دەشێوێ لەوەی بزانم چی بکەم. نازانم چۆن یارمەتیتان بدەم. بێگومان ناتوانم یارمەتیتان بدەم. ئەمەش بەڵگەکەیەتی. من لەو باوەڕەدا بووم گفتوگۆکەم لەگەڵ تراسیماکۆسدا ئەوەی ئاشکرا کرد، کە دادوەری لە نادادوەری چاکترە، بەڵام ئێوە ڕازی نین. لەلایەکی دیکەوە، ناتوانم داوای یارمەتی نەکەم. دەترسم بۆ کەسێک تاکو ئەو ساتەی هەناسە دەدات، توانای قسەکردنی هەیە بێ دەسەڵات دانیشێت و بەرگری لە دادوەری نەکات ئیماندارانە نەبێت، لە کاتێکدا دادوەری سزا دەدرێت. لەبەرئەمە من فریای دادوەری دەکەوم.

گلاوکۆن و ئەوانی دیکەش داوایان لێ کردم لە باسەکەمدا بەردەوام بم. واتای دادوەری و نادادوەرییان بەئاشکرا بۆ باس بکەم، ڕاستی و سوودی هەریەکێکیش لەوان بخەمە ڕوو. منیش ئەوەی لەبیرمدا بوو باسم کرد: لێکۆڵینەوەکەمان کارێکی ئاسان نییە. پێویستی بە ڕوانینی دوور هەیە. کەوابوو، مادامەکی ئێمە کەسانی ژیر نین، دەبێت ڕێچکەیەک بۆ لێکۆڵینەوەکە دیاری بکەین. ئەگەر (ڕوانینمان باش نەبێت) و داوامان لێ بکرێت لە دوورەوە چەند پیتێکی بچووک بخوێنینەوە، دوایی دەردەکەوێت ئێمە هەمان پیتمان بە گەورەیی لە شوێنی دیکەدا بینیوە. بە بڕوای من، لەم حاڵەتەدا، باشترە لەپێشدا پیتە گەورەکان ببینین، دوایی داوامان لێ بکرێت پیتە بچووکەکان بخوێنینەوە.

ئەدیمەنتۆس گوتی، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەم نموونەیە چ پەیوەندییەکی بە باسەکەمانەوە لەسەر دادوەری هەیە؟

ئێستا باسی دەکەم. ئێمە باسی دادوەری تاکە کەس و دادوەری شارمان نەکرد؟

شار لە تاکە کەس گەورەترە؟

بەڵێ گەورەترە.

هەڵبەتە شتێکی گەورە زۆرتر دادوەری تێدایە و باشتر دەتوانین لەبارەیەوە فێر بین. ئەگەر بتەوێت لەپێشدا هەوڵ دەدەین لە واتای دادوەری لە شارێکدا تێبگەین و ئەوسا باسی دادوەری تاکە کەس دەکەین و لێکچوونەکانیان ڕوون دەکەینەوە.

بە دیدی من ئەمە کارێکی باشە.

ئەگەر بڕوانینە شێوەی دامەزراندنی شارێک، ئایا سەرهەڵدانی دادوەری و نادادوەرییەکەشی نابینین؟ لەوانەیە وابێت.
کاتێک پرۆسەکە تەواو دەبێت ئومێدیشمان بۆ دۆزینەوەی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕاین سەرهەڵدەدات و ئاسانتر دەبێت؟
بێگومان.
دەست بە لێکۆڵینەوەکەمان بکەین؟ چونکە بە دیدی من کارێکی ئاسان نییە. تۆ جارێکی دیکە بیری لێ بکەرەوە.
ئەدیمەنتۆس گوتی، بیرمان لێ کردۆتەوە پێویست بە بیرکردنەوەی زۆرتر ناکات.
من لەو باوەڕەدام شارێک لەبەرئەوە دادەمەزرێت، چونکە کەس لە ئێمە خۆبژێو نییە و (بە تەنیا ناتوانێت بژی). پێویستمان بە زۆر شت هەیە. ئایا لەو باوەڕەدای هۆیەکی دیکە بۆ دامەزراندنی شارێک هەبێت؟
نەخێر.
لەبەرئەوە تاکەکان پێویستیان بە یەکدی هەیە. لە شوێنێکدا کۆدەبنەوە و پێکەوە دەژین، دەبن بە هاوسەر و یاریدەدەری یەکدی. ئەو شوێنە بە شار ناوزەد دەکرێت. وانیە؟
بەڵێ، وایە.
لەو باوەڕەشدان ئاڵوگۆڕکردنی شتەکانیان لەگەڵ یەکدیدا کارێکی چاکە؟
ڕاستە.
وەرە، با شارێک لەنێو بیرماندا دروست بکەین، کە لەسەر پێویستیەکانمان دایمەزرێنین.
باشە.
دڵنیام، کە یەکەم و گەورەترین پێویستی بۆ بەردەوامبوونی ژیان خۆراکە.
بەدڵنیاییەوە.
دووەم پێویستی خانوو، سێیەم جلوبەرگە.
ڕاستە.
چۆن شارێک ئەم پێویستیانە ئامادە دەکات؟ ئایا پێویست ناکات

کەسێک ببێت بە جووتیار و ئەوی دیکە بە وەستای خانوو و کەسێکی دیکەش تەونکەر؟ ئایا پێویستیمان بە پینەچی و پزیشکیش نابێت؟
باشە.
کەوابوو، چوار پێنج کەس بەلای کەمەوە بۆ دامەزراندنی شارێک پێویستە
وا دیارە.
لەبارەی ئەمەوە چی دەڵێیت؟ نابێت هەر یەکێک لەم کەسانە کارەکەی بۆ هەمووان بێت؟ بۆ نموونە، کشتوکاڵی جووتیار بۆ هەموو کەسێک نییە، کە لە ساڵێکدا چوار جار خۆراک دەهێنێتە بەرهەم؟ یان وەرزێک خەریکی کشتوکاڵە و سێ وەرزەکەی دیکە بۆ کاری جۆراوجۆر تەرخان دەکات؟ وەرزێک بۆ خانووسازی و وەرزێکی دیکە بۆ پێڵاودروستکردن و وەرزی چوارەمیش بۆ جلوبەرگدوورین دادەنێت؟ خۆی بە کەسەکانی دیکەوە (وەکو وەستای خانوو، پینەچی و تەونکەرەوە) نابەستێتەوە؟
ئەدیمەنتۆس لە وەڵامدا گوتی: بێگومان سوکرات شێوەی یەکەمی ژیان، کە باست کرد لەم شێوەیە ئاسانترە. شتێکی سەیریش نییە، کە بڵێم، ئێمە وەکو یەک پەیدا نەبووین و لە یەکدی ناچین. هەر یەکێک لە ئێمە بە سروشت لەوی دیکە جیاوازە. هەر تاکێک بۆ کارێکی تایبەت دانراوە. ئایا وانییە؟
بەڵێ، منیش لەو باوەڕەدام. دووەم، لەو باوەڕەدا نیت، کە تاکێک باشتر بە کارەکەی هەڵدەستێت ئەگەر خۆی بەجۆرێک لە پیشەکانەوە ماندوو بکات و هەموو جۆرە کارێک نەکات؟
باشترە یەک جۆر کاری هەبێت. ئاشکراشە و بە دیدی منیش ئەگەر کەسێک لە کاتی خۆیدا کارەکە نەکات کارەکە دەشێوێت.
بەڵێ وایە.
چونکە ئەو شتەی پێویستە بهێنرێتە بەرهەم چاوەڕێی کات و حەسانەوەی بەرهەمهێنەرەکە ناکات. بەرهەمهێنەرەکە دەبێت بەگوێرەی پێویستیەکەی مامەڵە لەگەڵ پیشەکەیدا بکات و نەیخاتە ڕیزی دووەمی کارەکانیەوە.
بەڵێ، پێویستە.

کەوابوو، هەر کەسێک بەگوێرەی سروشتی خۆی بە کارەکە هەستێت و لە کاتی خۆیدا کارەکەش بکات و بێجگە لەوەش کارێکی دیکەی پێ نەدرێت، ئەوا بەرهەمی چاک و زۆریش بۆ هەموو کەسێک ئامادە دەکات. بەتەواوی دروستە. کەوابوو، ئەدیمەنتۆس، لە شارەکەدا پێویستمان بە چوار کەس زۆرتر هەیە. جووتیار هەوجاڕ و تەشو یان ئامێرەکانی خۆی دروست ناکات. دروستیشی بکات چاک نابێت. ئایا وەستای خانووەکە، پینەچی و تەونکەرەکە، پێویستیان بە زۆر شتی دیکە نییە؟

بەڵێ، پێویستیان هەیە. لێرەدا، دارتاش، ئاسنگەر و زۆر پیشەی دیکەش دێنە نێو شارەکەوە و گەورەی دەکەن.

ڕاستە.

هێشتا شارەکەمان زۆر گەورە نابێت ئەگەر ڕێگە بدەین، شوان، گاوان و خاوەن مێگەل بێنە نێو شارەکەوە. مانگاکان یاریدەی جووتیارەکان بۆ هەوجاڕ ڕاکێشان و گاکانیش بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی خانووسازی بۆ وەستای خانووەکان دەدەن و خوری و پێستی مەڕەکانیش پینەچی و تەونکەر سوودی لێ وەرگرن.

ئەگەر ئەم هەمووە بێنە نێوی، شارەکە گەورە دەبێت.

لەسەروو ئەمەشەوە شار لە شوێنێکدا دانامەزرێت ڕێگەی هێنانەژوورەوەی هیچی نەبێت. بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، کەسانی دیکەشمان دەوێت لە شارەکانی دیکەوە کەلوپەلی پێویست بهێنن.

بەڵێ.

ئەگەر ئەویش لەگەڵ خۆیدا کەلوپەل بۆ ئەو شارە نەبات، کە پێویستیەکانی لێوە دەهێنێت بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە. وانیە؟

لەوانەیە.

کەوابوو، دانیشتووانی شارەکەی ئێمە دەبێت بە تەنیا بۆ پێویستی خۆیان بەرهەمیان نەبێت. کەلوپەلی باش و زۆر بۆ شارەکانی دیکەش بنێرن

پێویستە.

لێرەدا پێویستە جووتیار و پیشەسازی زۆرترمان هەبێت.

بەڵێ.
هەندێکیش سەرپەرشتی ناردن و بردنی کەلوپەلەکان بۆ شارەکانی دیکە دەکەن و بە بازرگان ناوزەدیان دەکەین.
بەڵێ. کەوابوو، پێویستمان بە بازرگانە.
بەدڵنیاییەوە. ئەگەر کەلوپەلەکان بە کەشتی بنێرین پێویستمان بە کەشتیەوانیشە.
بەدڵنیاییەوە. چۆن دانیشتووانی شارەکە پێکەوە کەلوپەلەکان بەکاردەهێنن؟
ئاشکرایە، لە ڕێگەی کڕین و فرۆشتنەوە ئەم کارە دەکەن.
کەوابوو، پێویستیمان بە پارە و بازاڕیش هەیە.
بەدڵنیاییەوە. ئەگەر جووتیارێک یان پیشەسازێک لە کاتی خۆیدا بەرهەمەکەی بۆ گۆڕینەوە نەخستە بازاڕەوە دەبێت دانیشێت و هیچ نەکات؟
نەخێر، نابێ وابێت. کەسانێک دەبێت هەبن سەرپەرشتی ئەم کێشەیە بکەن. لە شاری باشدا ئەم کەسانە لاوازەکانن و کاری دیکەیان بۆ ناکرێت. لەنێو بازاڕ دادەنیشن، کەلوپەلەکان بە پارە دەکڕن و دەیفرۆشنەوە. بۆ ئەم مەبەستە پێویستیمان بە دووکاندار هەیە. ئەو کەسانەی کەلوپەل لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە دەبەن بازرگانن.
ئەمە ڕاستە.
کەسانی دیکەش هەن بەگوێرەی توانای بیرکردنەوەیان لەنێو شارەکەمان جێگەیان نابێتەوە، بەڵام دەتوانین سوود لە بەهێزی لەشیان وەرگرین و کار بکەن. ئەم جۆرە کەسانە هێزی لەشیان بەرانبەر مووچە دەگۆڕنەوە، بە مووچەخۆر ناوزەدیان دەکەین. وانیە؟
بێگومان.
مووچەخۆر شارەکەمان پڕ دەکەن؟
وابزانم وایە.
باشە، ئەدیمەنتۆس شارەکەمان لێرەدا تەواوە؟
هەڵبەتە.
ئایا لەگەڵ ئەم شتانەی باسمان کردن دادوەری و نادادوەری چۆن دەبینرێن؟

سوکرات من نازانم. لەوانەیە جۆرێک بێت لە پێویستی لەنێوان ئەوانەدا ئاماژەمان بۆ کردن.
لەوانەیە بۆچوونەکەت دروست بێت، بەڵام با بەوردی لێی بکۆڵینەوە و خۆمان بە ماندوو دەرنەخەین.
یەکەم، با بزانین هاوڵاتیان لە شارەکەمان بەو جۆرەی باسمان کردن چۆن دەژین. ئەوان نان، شەراب، جلوبەرگ و پێڵاو بەرهەم دەهێنن. وانیە؟ خانوو دروست دەکەن، بە گەرمای هاوینیش بە ڕووتی و پای پەتی کار دەکەن، بە زستانیش خۆیان دەپێچنەوە. بۆ خواردنیش هەویر دەشێلن و لە گەنم و جۆ ئەو خواردنە دروست دەکەن، کە دەیانەوێت. نان و کێک لەسەر گەڵا و سەبەتەی قامیش دادەنێن. لەسەر جێگا پاڵ دەدەنەوە و سەوزە دەخەنە بەردەمیان و دەخۆن و دەخۆنەوە، لەگەڵ منداڵەکانیان کاتێکی خۆش دەگوزەرێنن، سەبەتە گوڵیش بۆ ڕێزلێنان لە خواکان دەڕازێننەوە. لەگەڵ یەکدیدا ڕادەبوێرن و جووت دەبن، بەڵام بەگوێرەی توانایان منداڵ دروست دەکەن. لە هەژاری و جەنگیش دووردەکەونەوە.
گلاوکۆن هەڵی دایەو گوتی: "وا دەردەکەوێت تۆ هاوڵاتیەکان لە جەژنی خۆشی و ناسکی بێبەش دەکەیت. تاکو ڕادەیەک ڕاستە. لەبیرم چوو، کە پێویستیان بە خوێ، زەیتون، پەنیر و سەوزەی کوڵاو هەیە لەگەڵ خواردنەکەیاندا دایبنێن. هەروەها شیرینیشیان بۆ دادەنێن، کە لە هەنجیر، نۆک و لۆبیا دروست کراوە و بەڕووش دەبرژێنن و لە خواردنەوەشدا زیادەڕۆیی ناکەن. بە خۆشی دەژین و تەندروستیان باشە. پاش مردنیان میراتێکی باش بۆ نەوەکانیان جێدەهڵێن".
گلاوکۆن وەڵامی دایەوە و گوتی: "سوکرات ئەگەر شارێک بۆ بەراز دروست بکەین، بەمجۆرە بخۆن قەڵەو نابن؟" منیش گوتم، باشە گلاوکۆن چۆن خواردن بە هاوڵاتیان بدەین؟"بە ڕێگەی ئاسایی. ئەگەر ڕەنجدەر نەبن، دەبێت لە جێگەی نەرم درێژ بن و لەسەر مێز نان بخۆن و شیرینیشیان بخرێتە بەردەم. کەسانی ئەمڕۆ وا دەژین.
باشە، من تێدەگەم. ئەم خاڵانەی ئاماژەمان بۆ کردن لە بنچینەکانی ئەو شارە ناچن ئێمە دەمانەوێت. زیاتر لە بنچینەکانی شارێکی پڕ لە حەسانەوە و خۆشی دەچن. خراپیش نییە لەم بەراوردکردنەوە هەوڵ

بدەین لە واتاکانی دادوەری و نادادوەری لە شارەکاندا بکۆڵینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە دیدی من، شاری ڕاست ئەوەیە، کە ئێمە باسمان کرد، بەڵام با لەو شارە بدوێین، کە تووشی گەرمەتا بووە. ئەگەر ئەوە مەبەستی تۆ بێت هیچ هێزێک ڕامان ناگرێت. وا دیارە ئەو خاڵانەی ئاماژەم بۆ کردن جۆری ئەو ژیانەی باسم کرد هەمووومان لەسەریان هاوڕا نین. جێگەی نەرم و مێز و کەلوپەلی دیکەش دەبێت بخرێتە سەر شتەکان. بێگومان هەموو جۆرە خۆشی و ناسکیەک، ڕۆنی بۆندار، بخورد، کولیچە و ئافرەتی لەشفرۆشیش ڕیز دەکەین. تەنیا پێویستیەکانیان، وەکو خانوو، جلوبەرگ و پێڵاو بۆ ئامادە ناکەین. تابلۆ، قووماشی چنراو، زێڕ و دانی فیلیشیان دەخەینە بەردەست. وانیە؟

بەڵێ.

کەوابوو، پێویستە بیر لە چاکی شارەکەمان نەکەینەوە و گەورەتر دروستی بکەین. شارەکە بەرفراوانتر بکەین و پڕی بکەین لەو شتانەی پێویستیمان پێیان نییە، وەکو ڕاوچیەکان، هونەرمەندان و لاساییکەرەوەکان، بۆ نموونە، کە زۆریان لەگەڵ شێوە، ڕەنگ و مۆسیقادا خەریکن. هەروەها، شاعیرەکان و یاریدەدەرەکانیان، ئەکتەرەکان، گۆرانیبێژ و سەماکەران، هەموو ئەو پیشەسازانەی هەن و تەنانەت ئەوانەی خشڵ بۆ ژنان دروست دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیمان بە خزمەتکاری زۆرتر دەبێت. لەو باوەڕەدا نیت پێویستیمان بە وانەبێژ، برینپێچ و منداڵبەخێوکەر، ئارایشکەر، سەرتاش، چێشتلێنەر و شوانی بەرازیش بێت؟ لە شارەکەی پێشوودا پێویستیمان بەمجۆرە کەسانە نەبوو، بەڵام بۆ ئەم شارە پێویستن. ئەگەر هاوڵاتیان گۆشتخۆر بن دەبێت مەڕوماڵاتی زۆرترمان هەبێت.

هەڵبەتە.

ئەگەر بەو جۆرە بژین لە جاران زۆرتر پێویستمان بە پزیشک دەبێت؟

زۆرتر پێویستمان بە پزیشک دەبێت.

ئەو زەوییەی جاران بۆ کشتوکاڵ هەمان بوو ئێستا بچووک دیارە و بەش ناکات. وانیە؟

وایە.
لەبەرئەمە ئەگەر بمانەوێت لەوەڕگە و زەوی زۆرترمان بۆ کێڵان هەبێت، دەبێت زەوی دراوسێکانمان داگیر بکەین؟
دەبێت ئەم کارە بکەین.
کەوابوو، گلاوکۆن لە هەنگاوی دووەمدا خۆمان بۆ جەنگ ئامادە دەکەین. وانیە؟
بەڵێ، وایە.
من لێرەدا باسی چاکە و خراپی جەنگ ناکەم، بەڵام سەرچاوەکەیمان بۆ دەردەکەوێت. لەو ویست و حەزانەوە سەرهەڵدەدات، کە هەمان کات سەرچاوەی خراپترین ڕووداون لە شارەکاندا.
ئەمە ڕاستە.
دەبێت شارەکە بە ژمارەی دانیشتووانی گەورەتر نەبێت، بەڵکو لەشکری گەورەی پێویستە، تاکو بەرگری لە شارەکە بکات و سامانەکەی بپارێزێت.
بۆچی هاوڵاتیانی شارەکە بەو کارە هەڵناسن؟
چونکە لە پێشتر لەسەر ئەو خاڵە ڕێکەوتین، کە هەرکەسە لە شارەکە پیشەی خۆی هەیە و دەیەوێت کاری خۆی بکات.
بەڵێ ئەوە ڕاستە.
باشە، تۆ جەنگسازی بە پیشە دانانێیت؟
بەڵێ، پیشەیە.
دەبێت، بایەخ بە پیشەی پینەچێتی لە جەنگسازی زۆرتر بدەین؟
نەخێر.
بەڵام، ئێمە ڕێگەمان نەدا پینەچی ببێت بە جووتیار و تەونکەر، یان وەستای خانوو. هاوکات لەسەر ئەوە ڕێکەوتین، کە بۆئەوەی لە کارکردن و پیشەکەیدا سەرکەوتوو بێت پینەچی دەبێت لەسەر پیشەکەی خۆی بمێنێتەوە. بەهەمان شێوە پیشەسازەکان بە باشی بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. ئایا گرنگە جەنگسازی بە باشی بەڕێوە بچێت؟ ئایا جەنگ کارێکی ئەوەندە ئاسانە جووتیار و پینەچی و کارمەندەکانی دیکە بکەین بە سەرباز؟ کەسێک لە منداڵیەوە یاری دامەی نەکردبێت و فێر نەبووبێت یاریزانێکی چاکی لێ دەرناچێت.

ئایا هەموو کەسێک دەتوانێت لەپڕدا شمشێر و قەڵغان یان چەکێکی دیکە هەڵگرێت و بچێتە نێو جەنگەوە؟ هیچ چەکێک، کەسەکە ناکات بە جەنگاوەرێکی ئازا ئەگەر نەزانێک چەک بەکاربهێنێت و مەشقی نەکردبێت.

بێگومان، ئەگەر هەڵگرتنی ئامێرێک کەسەکە بکات بە لێزان ئامێرەکان زۆر بە بایەخ دادەنران.

لەبەرئەوەی پیشەی پاسەوان (سەربازەکان) گرنگە دەبێت کاری دیکەیان نەدرێتێ.

به بۆچوونی من، دەبێت وابێت.

ئایا ئەم پیشەیەش کەسێکی پێویست نییە، کە لەگەڵ سروشتیا ڕێک دەکەوێت؟

بێگومان.

کەوابوو، کاری ئێمە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەیە بۆ پاراستنی شارەکە بگونجێن.

بەڵێ وایە.

بەخوا ئەمە کارێکی بێ نرخ نییە و دەبێت لێی پاشگەز نەبینەوە.

دەبێت، پاشگەز نەبینەوە.

لەو بـاوەڕەدای، کە باسی پاسەوانی دەکەین جیاوازی لەنێوان لاوێکی ئازا و سەگێکی بە ڕەگەز دڕ بۆ پاسەوانی هەبێت؟ مەبەستت چیە؟

هەر یەکێک لەوان بۆ گرتنی نێچیرەکەی پێویستی بە هەستکردنی تیژ و خێراییە لە شەڕکردندا.

هەردووکیان پێویستیان بەو شتانە هەیە.

پێویستە لە جەنگدا ئازا بن.

هەڵبەتە.

ئایا سەگ، ئەسپ یان ئاژەڵێکی دیکە ئەگەر ئازایی و جەنگاوەری لە سروشتیدا نەبێت، ئازایانە شەڕ دەکات؟ نەتبینیوە، چۆن کەسێکی نەبەز خاوەنی گیانێکی نەترسە؟

بینیومە.

کەوابوو، خەسڵەتەکانی لەشی پاسەوانەکانت لا ئاشکرایە.

بەڵێ.
هەروەها، لەڕووی دەروونیشەوە دەبێت ورەی بەرزیان هەبێت.
ئەوەش وایە.
گلاوکۆن، ئەگەر ئەوان بە سروشت ئازاو شەڕەنگێز بن، ئایا بۆ خۆیان و هاوڵاتیانیش دڕندە نین؟
بەخوا، دڕندە دەبن.
دەبێت لەگەڵ هاوڵاتیان نەرم و بەرانبەر دوژمنیش ڕەق بن. ئەگەر وا نەبێت چاوەڕوانی دوژمن ناکەن شارەکە وێران بکات خۆیان دەیڕوخێنن.
ئەوە ڕاستە.
پێویستە چی بکەین؟ لەکوێ ئەو خەسڵەتە پەیدا بکەین، کە نەرمی و ورەی بەرزیشی هەمان کات تێدایە؟ سروشتی نەرم بەپێچەوانەی ورەی بەرزەوەیە.
وا دیارە.
کەسێک ئەو دوو لایەنەی تێدا کۆنەبێتەوە پاسەوانێکی چاکی لێ دەرناچێت. بەستنەوەی ئەو دوو لایەنەش پیکەوە لە کارێکی مەحاڵ دەچێت. وا دەردەکەوێت پاسەوانی چاک پەیدا نەکرێت.
وادیارە. ڕێگەچارەیەک نادۆزمەوە، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ باسەکەی پێشومان و بەوردی سەرنجی بدەین بەتایبەتی لەوێدا، کە گوتم: ئێمە شایەنی چەقینمان هەیە، چونکە لە ئاستی پێشخستنی بەراوردکردنەکەمان نازانین بڕوانینە کوێ. چۆن؟
ئێمە چاومان لەو خاڵە پۆشی، کە جۆرە سروشتێک هەیە ئەو دوو خەسڵەتەی هەڵگرتبێت.
لەکوێدایە؟
تۆ لە سروشتی ئاژەڵەکاندا دەیبینیت. بەتایبەتی ئەو ئاژەڵەی لەگەڵ پاسەواندا بەراوردمان کرد. سەگێکی دڕو فێرکراو ئەو سروشتەی هەیە. لەگەڵ ئەوانەی دەیانناسێت نەرمەو لەگەڵ بێگانەکانیشدا ڕەقە.
من ئەوە دەزانم.
کەوابوو، دەتوانین لە شتێکدا ئەو دوو خەسڵەتە کۆبکەینەوە. گەڕان بەدوای پاسەوانێکی چاکیشدا مەحاڵ نییە.

وادیارە مەحاڵ نەبێت.
تۆ لەو باوەڕەدایت ئەو پاسەوانانەی بۆ پاراستنی شارەکەمان دەمانەوێن لەلایەکەوە ورەیان بەرز و لەلایەکی دیکەشەوە سروشتێکی فەلسەفیان هەبێت؟
مەبەستت چیە؟ من تێناگەم.
تۆ شتێک لە سەگدا دەبینیت، کە لە ئاستی ئاژەڵدا بە سەرسوڕماوی ڕات دەگرێت.
ئەوە چیە؟
کاتێک سەگ بێگانەیەک دەبینێت دەوەڕێت، بەڵام، کە ناسیاوێک دەبینێت، ئەگەر ئەو ناسیاوە هیچیش بە سەگەکە نەدات، سەگەکە پێی ناوەڕێت. ئەمە جێگەی سەرسوڕمان نییە؟
سەرنجی ئەوەم نەداوە، بەڵام سەگ بەو جۆرەیە.
دڵنیام ئەمە خەسڵەتێکی چاکە لە سەگدا و بەڕاستیش فەلسەفیانەیە.
لە چ ڕوویەکەوە فەلسەفیانەیە؟
چونکە بەگوێرەی ناسینەوەی ئەو کەسە حوکم دەدات. ئەمەش حەزە بۆ فێربوون. ئایا ئەوەی دەیناسێ و نایناسێ لەسەر زانین و نەزانینی ڕاناوەستێت؟
بەڵێ.
حەز بۆ فێربوون، وەکو فەلسەفە، یان خۆشەویستی بۆ زانین نییە؟
بەڵێ وەکو ئەوە.
ئایا دەتوانین بڵێین ئەو مرۆڤەی لەگەڵ ناسیاوەکانیدا نەرمە حەزی لە فێربوونە و خۆشەویستی زانینە؟
دەتوانین.
کەوابوو خەسڵەتەکانی، وەکو فەلسەفە، ورەی بەرز، خێرایی و هێز، دەبێت لەو کەسەدا هەبن، کە دەبێت بە پاسەوانێکی شارەکەمان.
بەتەواوی وایە.
ئەمانە خەسڵەتەکانن. چۆن پاسەوانەکە فێر بکەین؟ ئایا ئەم پرسیارە لە دادوەری و نادادوەری نزیکمان ناکاتەوە؟ پێویستە باسەکەمان لەبار

بێت و لەوەش زۆرتر دوای نەخەین.

ئەدیمەنتۆسی برای گلاوکۆن گوتی: لەو باوەڕەدام ئەم باسە بەمەبەستی خۆمانمان دەگەیەنێت.

منیش گوتم: بۆ خوا ئەی ئەدیمەنتۆس، با خۆمانی لێ نەدزینەوە و باسی بکەین. گرنگ نییە چەند دەخایەنێت.

نا، دوای ناخەین.

وەرە، با بیر بکەینەوە چۆن ئەو کەسانە فێر بکەین.

باشە.

چی فێر دەبن؟ شتێکی چاکتر لە پەروەردەی لەش، مۆسیقا و شیعریش بۆ دەروون پەیدا دەبێت؟

دژوارە.

ئێستا مۆسیقا و شیعر پێش پەروەردەی لەش دەخەین. وانیە؟

هەڵبەتە.

چیرۆکیش دەخەینە ڕیزی مۆسیقا و شیعرەوە؟

بەڵێ.

ئایا دوو جۆر چیرۆک نییە؟ یەکەمیان ڕاست و دووەمیان ناڕاست؟

بەڵێ.

پێویست ناکات کەسەکان فێری هەردووکیان ببن؟ بەڵام لەپێشدا ناڕاستەکە؟

نازانم مەبەستت چیە.

تێناگەیت، کە لەپێشدا چیرۆک بۆ منداڵان دەگێڕینەوە. ئەو چیرۆکانە هەرچەندە تاکو ڕادەیەک ڕاستیان تێدایە، بەڵام ڕاست نین. پێش دەستپێکردنی پەروەردەی لەش بۆ منداڵی بچووکی دەگێڕینەوە.

ئەوە ڕاستە.

ئەوەش مەبەستی من بوو، کە گوتم مۆسیقا و شیعریان پێش پەروەردەی لەش فێر دەکەین.

باشە.

ئەی نازانیت لە پرۆسەی فێربوونی لاواندا سەرەتای پرۆسەکە زۆر گرنگە؟ ئەو کاتە وەکو ئاسنێکی نەرم دەتوانین بە ئارەزووی خۆمان

کاری لەسەر بکەین.

بەتەواوی وایە.

نابێت گوێ بدەینە ئەوەی منداڵان چ جۆرە چیرۆکێکیان بۆ دەگێڕینەوە و ئەو باوەڕانە وەرگرن، کە ئێمە نامانەوێت شوێنی بکەون؟

بێگومان ئەوە نابێت.

کەوابوو، لەپێش هەموو شتێکدا دەبێت سەرپەرشتی ئەو کەسە بکەین، کە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە. چیرۆکە چاک و جوانەکان هەڵدەبژێرین. داوا لە دایکان و دایەنەکان دەکەین، کە ئەو چیرۆکانە بۆ منداڵان بگێڕنەوە. ئەوان زۆرتر کار دەکەنە سەر دەروونی منداڵان. زۆر چیرۆکی ئەمڕۆش دەبێت فڕێ بدەین.

چ جۆرە چیرۆکێک فڕێ دەدەیت؟

لە سەرەتاوە تەماشای چیرۆکە سەرەکییەکان دەکەین تاکو بزانین بۆ منداڵان دەگونجێن. دوایی لەوانی دیکەش دەکۆڵینەوە. ئەوانیش، هەرچەندە ناودار بن، وەکو چیرۆکە سەرەکییەکان کاری خۆیان دەکەنە سەر دەروونی منداڵان. ئایا تۆ وا بۆ کێشەکە ناچیت؟

من بەمجۆرە بۆ کێشەکە دەچم، بەڵام نازانم تۆ کامیان بە سەرەکی دادەنێیت.

چیرۆکەکانی هۆمیرۆس، هزیۆد و شاعیرەکانی دیکەش تاکو ئەمڕۆ دەیانگێڕینەوە ناڕاستیان تێدایە.

مەبەستت لە چ چیرۆکێکە و چ جۆرە ناڕاستیەکیان تێدا دەدۆزیتەوە؟

یەکێک لە ناڕێکییەکان لەوەدایە، لە گێڕانەوەدا ناڕاستیەکە دەرنەخرێت.

نموونەیەکم بدەرێ .

کاتێک لە چیرۆکێکدا وێنەیەکی ناشرین بە خواکان و قارەمانەکان دەدەین، ئەمە وەکو ئەوە وایە هونەرمەندێک لە تابلۆکەیدا ئەو شتانەی نیشانی داوە لە بابەتە ڕاستەقینەکان نەچن.

دەگونجێت ئەم کارە ڕەت بدەینەوە، بەڵام تۆ بەتەواوی چیت لەبیردایە؟

یەکەم، دروستکردنی گەورەترین ناڕاستی سەبارەت بە شتە

هەرە گرنگەکان چیرۆکێکی چاک پێک ناهێنێت. هزیۆد دەیگێڕێتەوە (ئورانۆس) چی کردو چۆن (کرۆنوس) سزای داو کرۆنوسیش چۆن بە دەستی کوڕەکەی سزای خوارد. ئەگەر ئەم ڕووداوە، ڕاستیش بێت پێویست ناکات بە منداڵ بگوترێت.

ئەگەر بۆ هەر هۆیەکیش بەپێویستی بزانین دەبێت ئەو ڕووداوە بۆ ژمارەیەکی کەم باس بکەین. بۆئەوەی ژمارەکەیان کەم بکەینەوە، دەتوانین مەرجیان بۆ دابنێن. داوایان لێ بکەین بەرازێک یان شتێکی بەنرخ بکەن بە قوربانی.

بەڵێ. دژوارە مامەڵە لەگەڵ ئەو چیرۆکانەدا بکرێ.

نابێت لەنێو شارەکەی ئێمەشدا بگێڕینەوە. نابێت ئەو منداڵە وا تێبگات هەستان بە گەورەترین تاوان ئاساییە یان سزادانی باوکێکی زۆردار لە تۆڵەسەندنەوەی خواکان دەچێت.

نا، بە خوا، من لەو بـاوەڕەدام. ئەم چیرۆکانە شایەنی گێڕانەوە نین.

بێگومان، ئەگەر پاسەوانەکانمان وا تێبگەن، کە شەرمە ڕقیان لە یەکدی بێت، نابێت ئەو چیرۆکانەی سەبارەت بە هەڕەشەکردن و شەڕی نێوان خواکانیان بۆ بگێڕینەوە، چونکە ناڕاستن. جەنگی خواکان لەگەڵ دێوەکاندا، ڕق و کینەیان، بۆ خێزانەکان و هاوڕێکانیان نابێت بوترێت. لەسەر قوماشیش وێنەکانیان نابێت بکرێن. ئەگەر بمانەوێت لاوەکانمان لە ڕق و کینە بەرانبەر یەکدی دوورخەینەوە پێویستە لە منداڵییەوە فێرکرێن، کە ئەوە کارێکی خراپە و زۆریش لە شاعیران بکەین هەمان باسیان بۆ بکەن. ڕێگەی ئەو چیرۆکانە نادەین گرنگ نییە میتافۆریش بن، وەکو بەستنەوەی هیرا 24 بە زنجیر لەلایەن کوڕەکەیەوە یان دەرکردنی هیفاستۆس25 لە بەهەشت لەلایەن باوکییەوە بوترێن. یان بەو جۆرەی هۆمیرۆس باسی جەنگی نێوان خواکان دەکات لەنێو شارەکەمان بگێڕینەوە. لاوان جیاوازیی نێوان میتافۆر و ڕاستەقینە نازانن. بیرێکیش لەو تەمەنەدا بچێتە نێو مێشکیان سڕینەوەی دژوارە، لەبەرئەمە پێویستە دڵنیا بین لەوەی ئەو چیرۆکانەی یەکەمجار بۆیان دەگێڕینەوە چاکترین بن. ڕێی تێدەچێت کەسێک بپرسێت ئەو چیرۆکانە چۆنن و باسی چی دەکەن؟ من و

تۆ، ئەدیمەنتۆس شاعیر نین، بەڵام دامەزرێنەری شارەکەین.26 باشتر وایە دامەزرێنەرەکان جۆرە شێوازێک بۆ شاعیرەکان دیاری بکەن تاکو پەیڕەوی بکرێت. ئێمە هۆنراوەکانیان بۆ نانووسینەوە.

باشە. شێوازی هۆنراوەی خواناسی، یان چیرۆکەکان سەبارەت بە خواکان چیە؟

دەبێت وێنەی خواکان، وەکو خۆیان لە هۆنراوەی قارەمانێتی و گۆرانی و تراجیدیادا نیشان بدرێت.

بێگومان دەبێت وابێت.

ئێستا، خوا چاکە، وانیە؟ پێویستە بە باشی باسی بکرێت؟

وایە.

چاکەش زیانبەخش نییە. وایە؟

وایە.

هەرشتێک زیانبەخش نەبێت زیان دەگەیەنێت؟

هەرگیز نا

یان شتێک زیانبەخش نەبێت خراپ دەبێت؟

نا.

هەرشتێک خراپەی لێ نەوەشێتەوە دەبێت بە سەرچاوەی خراپە؟

چۆن شتی وا دەبێت؟

چاکە سوودبەخشە؟

بەڵێ.

هۆیە بۆ کاری چاک؟

بەڵێ.

چاکە بە تەنیا هۆیە بۆ شتە چاکەکان و هۆ نییە بۆ خراپەکان.

بەتەواوی لەگەڵتا هاوڕام.

کەوابوو، مادامەکی خوا چاکە، بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆر کەسەوە، هۆی هەموو ڕووداوەکانی ژیانی مرۆڤ نییە و هۆیە بۆ هەندێکیان. ڕووداوە چاکەکانیش لە ژیانماندا لە ڕووداوە خراپەکان کەمترن. خوا هۆی ڕووداوە چاکەکانە و لێرەدا دەبێت هۆی خراپەکاریش بدۆزینەوە.

ئەوە ڕاستە، باوەڕت پێ دەکەم.

هەڵەکەی هۆمیرۆس سەبارەت بە خواکان کردویەتی لە هیچ کەسێکی گێل وەرناگرین، کە دەڵێت:
دوو گۆزە لە پێش دەرگای ماڵی زیۆس دانراون یەکێکیان پڕە لە چارەنووسی چاک و ئەوی دییان لە خراپە. ئەو کەسەی لە هەر دوو گۆزەکان بەشی دەدرێت، تووشی چاکە و تووشی خراپەش دەبێت.
ئەو کەسەی بەشەکەی لە گۆزەی دووەم پێ دەدرێ، نەهاتی خراپ بەسەر ئەم زەمینە پیرۆزەدا ڕادەماڵێت.
بیر لەوەش ناکەینەوە زیۆس سوودی ئێمەی دەوێت ئەو دابەشکەری چاکە و خراپەیە. لەبارەی شکاندنی پێکهاتنی شەڕوەستانەکەش لەلایەن پەنداڕۆسەوە هەر کەسێک پێمان بڵێت، کە ئەسینا و زیۆس یان تیمس و زیۆس دەستیان پێکرد و ئەوان بەرپرسن لە ململانێی نێوان خواکان، ستایشی بۆ ناکەین. تەنانەت نایەڵین لاوان گوێیان لە وشەکانی ئەسخیلۆس بێت، کە دەڵێت:
مرۆڤ بیەوێت خانوویەک وێران بکات خواکان تووشی هەست بە تاوانکردنی دەکەن.
ئەگەر کەسێک هۆنراوەیەک بۆ ئازارەکانی نێوب یان خانووەکەی پێۆلۆپسی داستانی ترۆی، یان لەو بابەتانە بهۆنێتەوە پێویستە ڕوونی بکاتەوە، کە ئەمانە کاری خوا نین. ئەگەر کاری خواش بن ئەو ئازاردان و ئەشکەنجەیە سوودیان هەیە. ڕێگە نادەین شاعیرێک ئازاردانەکە بە خراپە و گەندەڵی دابنێت و بە کاری خوای دابنێت. ئێمە بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتەکەمان بە ڕێکوپێکی بەرانبەر ئەوانەی خوای چاک بە سەرچاوەی خراپە دادەنێن دژی ڕادەوەستین. ئەم چیرۆکانە نارێک و زیانبەخشن.
یاساکەت پەسەند دەکەم و دەنگی بۆ دەدەم.
ئەمە یەکێکە لە یاساکان سەبارەت بە خواکان، کە شاعیر دەبێت پەیڕەوی بکات و دەڵێین خوا هۆی هەموو ڕووداوەکان نییە و تەنیا کاری چاکەی لێ دەوەشێتەوە.
ئەمەش یاسایەکە بەتەواوی پەسەندی دەکەین.
لەبارەی یاسای دووەمەوە چ دەڵێیت؟ تۆ لەو باوەڕەدایت خوا سیحرباز بێت. بە چەند شێوەیەکی جیاواز لە شوێنی جیاوازدا خۆی

دەرخـات؟ یان سـادە بێت و لەو فۆرمەی خۆی زیاتر چی دیکەی نەبێت؟
ناتوانم بیسەلمێنم.
باشە. ئەی ئەمە چۆنە؟ ئەگەر لە فۆڕمەکەی خۆی دەرچێت پێویستی بە خۆی، یان شتێکی دیکە نییە ئەو گۆڕانەی بەسەردا بهێنێت؟
پێویستی هەیە.
چاکترین شت پێویستی بە گۆڕان نییە. وانیە؟ بۆ نموونە، لەشێکی چاک تەندروست بە خواردن و خواردنەوە یان ڕووەکێکی زۆر بەهێز بە خۆر و هەوا تێک ناچێت.
هەڵبەتە.
ئازاترین و هۆشمەندترین کەس لە دەرەوە کاری تێ ناکرێت.
وایە.
ئەمە بۆ هەموو پیشەسازییەک و کەلوپەلی ماڵ و خانوویەکیش دروستە.
ئەوە ڕاستە.
شتێک بە سروشت چاک بێت، چاک دروستکرابێت یان هەردووکیان بێت کەمتر پێویستیان بە چاکردن هەیە. وایە.
خواو خەسڵەتەکانیشی چاکترینن.
دەبێ وابێت.
کەوابوو، نابێت خوا فرەشێوە بێت.
ئایا خوا خۆی دەگۆڕێت؟
ئەگەر گۆڕانی بەسەردا بێت، دەبێت خۆی بگۆڕێت.
ئایا خۆی بۆ شتێکی چاکتر و جوانتر  یان خراپتر و ناشرینتر دەگۆڕێت؟
لەبەرئەوەی خوا لە چاکە و جوانیدا تەواو کۆ و پڕە، دەبێت بۆ شتێکی خراپتر بگۆڕێت.
بەتەواوی ڕاستە. تۆ لەو بـاوەڕەدای، ئەدیمەنتۆس، کە خوا یان کەسێک بەدەستی خۆی خۆی خراپ بکات؟
نەخێر، ئەوە لەبار نییە.
لەبارە خواکان بیانەوێت خۆیان بگۆڕن لە کاتێکدا ئەوان جوانترین

بوونن.

ئەمە بەڕای من پێویست نییە.

کەوابوو، هیچ شاعیرێک نابێت لەبارەی پرۆتیۆس، یان تیتسەوە بڵێت، خواکان، وەکو بێگانەکانی وڵاتە دوورەکان.

بەشێوەی جۆراوجۆر دێنە نێو شارەکەمان.

نابێت لە هۆنراوە و تراجیدیاکاندا هیرا بەو کەسە دابنێین، کە بۆ کورە ژیانبەخشەکانی لە ڕووباری ئەرگیڤی ئیناکوس خێر کۆبکاتەوە. یان چیرۆکی لەم جۆرەمان بۆ بگێڕنەوە. نابێت دایکەکان بە گێڕانەوەی چیرۆک لەبارەی خواکانەوە، وەکو ئەو بێگانانەی بە شەو خۆیان بە شاردا دەکەن، منداڵەکان بترسێنن.

ئەم چیرۆکانە سوکایەتی بە خواکان دەکەن و هاوکات منداڵان فێری ترسنۆکی دەکەن.

نابێت بیانگێڕینەوە.

هەرچەندە خواکان ناگۆڕێن ئایا ئێمە ناگەیەننە ئەو باوەڕەی، کە لە چەند فۆرمێکدا خۆیان دەردەخەن و بە سیحر دەمانخەڵەتێنن؟

هەڵبەتە.

چی؟ ئایا خوا دەیەوێت لە گوتندا، یان بە کردەوە درۆ بکات و هەڵمان فریوێنێت؟

نازانم.

تۆ نازانیت، کە خواکان و هەموو کەسێکیش ڕقیان لە درۆی ڕاستە؟

مەبەستت چیە؟

مەبەستم ئەوەیە کەس ئامادە نییە لەگەڵ کەسە نزیکەکانی درۆ لەبارەی شتە گرنگەکانەوە بکات.

هێشتا لە مەبەستت تێناگەم.

چونکە، تۆ وا دەزانیت باسەکەم قووڵە. مەبەستەکەم سادەیەو دەڵێم، کە لەگەڵ خۆتدا لەبارەی شتەکانەوە درۆ بکەیت و نەزانیت لەسەر ئەو درۆیە دەژیت.

ئەمە شتێکە کەم کەس پەسەندی دەکات. هەموو کەسێک ڕقی لە درۆیە.

ئەوە ڕاستە.

وەکو پێشتر گوتم، ئەوە درۆیەکی ڕاستە ئەگەر کەسێک نەزانێت درۆی لەگەڵدا کراوە. درۆکردن لە گوتندا جۆرێکە لە لاساییکردنەوەی سۆزی دەروون. وێنەکەشی، کە لەدواییدا سەرهەڵدەدات درۆکردنێکی ڕووت دەرناچێت. وایە؟

بەدڵنیاییەوە.

خواکان و خەڵکیش ڕقیان لە درۆیە.

بە بۆچوونی من وایە.

درۆگوتن چۆنە؟ بۆ کێ باشە و نابێت ڕقی لێی بێت؟ ئایا درۆگوتن لەگەڵ دوژمندا سوودبەخش نییە؟ ئەگەر یەکێک لە هاوڕێکانمان لەبەر شێواوی مێشکی، یان نەزانین بە کارێکی خراپ هەستێت دەرمانێک بۆ چاکردنەوەی نییە؟ ئەمەش سەبارەت بەو چیرۆکانەی ئاماژەمان بۆ کردن دروستە، چونکە نازانین، ڕووداوەکانی نێو ئەو چیرۆکانە سەبارەت بە خواکان تاکو چ ڕادەیـەک ڕاستن. ئایا نیشاندانی ئەو درۆیانە بە شتێکی ڕاست سوودبەخش نییە؟

دروستە.

لە چ ڕوویەکەوە درۆ بۆ خوا سوودبەخشە؟

ئایا لەبەر نەزانین درۆمان بۆ دەکات؟

ئەوە گاڵتەبازاڕییە.

کەوابوو، لە خوادا شاعیرێک نییە نادروست بێت؟

بە دیدی من وایە.

لەبەر ترسی دوژمنیش درۆ ناکات؟

لەوەشەوە دوورە.

لەبەر شێواوی مێشکی و نەزانین و هتد؟

کەسێکی شێت و نەزان هاوڕێی خواکان نییە.

کەوابوو، هیچ هۆیەک نییە درۆ بە خوا بکات؟

نییە.

بوونەوەرە پیرۆزەکان، دێوەکانیش لە درۆگوتن بەدەرن.

بەتەواوی وایە.

خوا لە گوتە و بە کردەوەش سادەیە. لە واقیعدا، لەنێو خەودا، بە

گوتن، وێنە، یان هێما لەگەڵ کەسدا درۆ ناکات.
من لەو باوەڕەدام.

کەوابوو، لەگەڵ مندا هاوڕایت، کە ئەمە بە دووەم شێوازی (یاسا) بۆ هۆنراوەکان سەبارەت بە خواکان دابنێین. خواکان سیحرباز نین تاکو خۆیان بگۆڕن. بە گوتن و کردەوەش ئێمە هەڵفریوێنن و درۆمان لەگەڵدا بکەن.

من لەگەڵتا ڕێدەکەوم.

هەرچەندە هۆمیرۆس لایەنی باشی هەیە، بەڵام بەوە ڕازی نین، کە دەڵێت زیۆس خەونەکەی بە ئاگامەمنون بینیوە، یان ئەسخیلۆس باسی ئەوە دەکات لە زەماوەندەکەی تیتسدا ئەپۆلۆ بە گۆرانی داهاتووی نیشان داوە:

منداڵەکانم بەختیان باش دەبێت، لە دەردو نەخۆشی دوور دەبن.

لە ستایشکردنی هاوڕێیەتیم لە خواکان داواکارم زاری فۆبیۆسی پیرۆز لە درۆگوتن بپارێزن.

ئەو خوایەی لەم زەماوەندەدا گۆرانی دەڵێت داهاتوو دەبینێت، کوڕی خۆی دەکوژێت.

ئێمە ڕازی نین کەسێک بەمجۆرە لەبارەی خواوە بدوێت. ڕێگە نادەین لە (شانۆگەرییەکاندا) بەشداری بکات و هۆنراوەکانیشی بخرێنە نێو بەرنامەی فێربوونی لاوانەوە. دەمانەوێت لاوانمان وەکو خوا بن.

من ئەم یاسایانە دادەمەزرێنم و کاریان لەسەر دەکەم.



ئەگەر بمانەوێت بەو شێوەیە پاسەوانەکان پـەروەردە بکەین و خواناس دەرچن و ڕێز بۆ دایک و باوک و هاوڕێکانیان دابنێن، ئەوانە جۆرە چیرۆکێکن دەبێت لە منداڵییەوە ببیستن.

لەو باوەڕەدام ئەوە ڕاستە.

چۆنە ئازاش بن؟ نابێت ئەو چیرۆکانەشیان بۆ بگێڕینەوە بترسن و لە مردن دوور بکەونەوە؟ ئایا کەسێکی ترسنۆک ئازایە؟

نەخێر، بەدڵنیاییەوە.

ئایا کەسێک بەبێ ترس بەرەو مردن بڕوات و باوەڕی بە ئەشکەنجەی نێو جیهانی بەرزەخ هەبێت مردن لە جەنگ بەزین و کۆیلایەتی باشتر دانانێت؟

ئەوە ڕاستە.

کەوابوو، دەبێت چاودێری چیرۆکەکان بکەین. نابێت ئەو چیرۆکانە سوکایەتی بە ژیانی نێو جیهانی بەرزەخ بکەن، بەڵکو پێویستە ستایشی بکەن، چونکە ئـەوەی باسی دەکـەن نە ڕاستە و نە لە داهاتووشدا سوودبە پاسەوانەکان دەگەیەنێت.

ئەوە پێویستە.

ئێمە دەبێت هەموو سوکایەتیکردنێک بسڕینەوە. لەم دێڕانەشەوە دەست بە سڕینەوەکەمان دەکەین:

لام باشترە خزمەتکاری مرۆڤێک بم زەویشی نەبێت بە هەژاری بژیم لەوەی پاشای مردووەکان بم.

یان: دەترسا خانووەکەی جێی مەترسی و ڕقی خواکانیش بێت.

هەروەها: ئالاس لە بەرزەخدا دەژی گیانێکە، خەیاڵێکی ڕووت بەبێ ژیری و بلیمەتی، هەروەها ئەمە:

ئەو بە تەنیا بیر دەکاتەوە ئەوەی هەیە لەرینەوەی سێبەرەکانە.

هەروەها: گیان لە لەش دەرچوو ڕووی کردە بەرزەخ بە سۆزەوە

چارەنووسی دەربڕی و لاوێتی خۆی بەجێ هێشت ئەمانەش:
گیانی وەکو دووکەڵ بە ناخی زەوییدا چوو قیژاندی و ....
هەروەها: لەنێو ئەشکەوتدا، کە شەمشەمەکوێرەیەک دەکەوێت ئەوانی دیکە بە قیژە دەفڕن خۆیان بە بنمیچی ئەشکەوتەکەدا هەڵدەواسن، گیانیان بێ قەرار هاوار دەکات. . . .
داوا لە هۆمیرۆس و شاعیرەکانی دیکەش دەکەین بە لابردنی ئەم دێڕانە توڕە نەبن. مەبەستمان لە لابردنیان ئەوە نییە، کە ئەم دێڕانە جوان نەبن. لەوانەیە زۆر جوان بن، بەڵام شیاوی ئەوە نین منداڵان و ئەوانەی دەیانەوێت بەبێ ترس لە کۆیلایەتی و مردن و ژین ببیستن.
ئەوە ڕاستە.
هەروەها ئەو ناوە ترسناکانەی بۆ شتەکانی دونیای ژێرەوە، وەکو کۆکیتوس، ستیکس27، بانگکردنی مردووەکان و هەموو ئەو ناوانەی تووشی ترس و لەرزینمان دەکەن دەبێت لاببرێن. ئەمانە لە شوێنی دیکەدا بۆ مەبەستێکی دیکە دەشێت بەکار بهێنرێن، بەڵام ئێمە نامانەوێت پاسەوانەکانمان بەو ترس و لەرزە دڵنەرم ببن و زوو کاریان تێ بکرێت.
ترسەکەمان لە جێگەی خۆیەتی.
لەگەڵما ڕێدەکەویت ئەو دێڕانە (لە هۆنراوەکان) دەربهێنین؟
بەڵێ.
شاعیرەکانیش لە نووسین و گوتندا پەیڕەوی شێوازێکی جیا بکەن؟
دروستە.
پێویست دەکات گوتەی خەماوی و پڕبەزەیی ناودارەکانیش بسڕینەوە؟ پێویستە، ئەگەر هەمان کارتێکردنیان هەبێت.
ئێمە باس لەوە ناکەین سڕینەوەکە دروست بێت یان نا، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێین کەس لەو باوەڕەدا نییە مردن بۆ کەسێکی چاک پڕ ئازار بێت. تەنانەت هاوڕێی کەسە چاکەکەش بەو جۆرە لە مردن تێناگات.
ئێمە بڕوامان وایە.

کەوابوو، لەبەرئەوە پرسەی بۆ دانانێت، کە مردووەکە ئازار دەچێژێت.
بێگومان وایە.
ئێمەش لەو باوەڕەداین کەسێکی چاک و بەڕێز خۆبژێوە و کەمتر پێویستی بە شتی دیکە هەیە.
ئەوە ڕاستە.
کەوابوو لە کەسەکانی دیکە کەمتر بەپەرۆشەوەیە، کە لە کوڕی و براکانی و سامانەکەی دادەبڕێت.
زۆر کەمتر.
لەبەرئەمە، کە مردن دێتە پێش کەمتر خەمبار دەبیت.
بێگومان .
کەوابوو، دروستە ئەگەر گوتە خەماوییەکانی پیاوە ناودارەکان لابەرین و بۆ ژنی بەجێ بهێڵین (تەنانەت نابێت بدرێن بە ژنە چاکەکانیش)، یان بیدەین بە پیاوە ترسنۆکەکان و پاسەوانەکانی ئێمەش ورەیان بەرز بێت.
ئەوە ڕاستە.
دیسانەوە داوا لە هۆمیرۆس و شاعیرەکانی دیکە دەکەین بەمجۆرە باسی ئەخیلۆسی کوڕی خاتوو خواکە نەکەن:
ڕاکشاوە و ئەم دیو ئەو دیو دەکات، بەسەر سکدا دەکەوێت، لەپڕێکدا، بە پەشۆکاوییەوە هەڵدەستێت، لێرەو لەوێ لە کەناری دەریایەکی نەناسراودا ڕادەوەستێت، یان مشتێک خۆڵەمێش هەڵدەگرێت، دەیکات بەسەری خۆیدا، دەگری و پەرێشانە.
نابێت بەو جۆرەش باسی پریامی هاوڕێی خواکان بکەین، کە گوایە لە مرۆڤ دەپاڕێتەوە.
لەنێو شیاکەدا گەوز دەدات و بانگیان دەکات و دەپاڕێتەوە.
داوایان لێ دەکەین بەمجۆرە خواکان بە خەماوی باس نەکەن:
ئالاس، چەند بەختی خراپە کوڕێکی مەزن، دایکێکی گەندەڵ ئەگەر خواکانیش بەمجۆرە باس بکەن نابێت وێنەیەکی ناشرین بە مەزنترین لە خواکان بدەن:
ئالاس بە چاوی خۆم ئەو مرۆڤە خۆشەویستە دەبینم

دڵم بۆی پەرێشانە یان: من بووم بە بەڵا سارپەدۆنی خۆشەویستم دایە دەست پاترۆکلس کوڕی مینۆتیۆس، بیکوژێت... ئەدیمەنتۆس، ئەگەر ئەم چیرۆکانە بۆ لاوەکانمان بگێڕینەوە و بە نزم دانەنرێن بە شتێکی بەنرخ دایدەنێن. لە کاتێکدا تووشی ڕووداوێکی ناخۆش دەبن گلەیی لە بەختی خۆیان دەکەن و ئاخ هەڵدەکێشن.

بۆچوونەکەت بەتەواوی دروستە.

تاکو ئەم ڕادەیە و تاکو ئەو کاتەی کەسێک ڕێگەیەکی چاکترمان نیشان دەدات بۆچوونەکەمان دروستە و دەبێت بەو جۆرە هەڵسوکەوت نەکەین.

نا، نابێت بەو جۆرە بێت.

لەسەروو ئەمەشەوە نابێت لاوەکانمان حەز لە پێکەنین و (گاڵتە) بکەن.

هەرکەسە زۆر پێکەنی، مەزاجی دەگۆڕێت.

لەو باوەڕەدام.

ئەگەر کەسێک زۆر حەزی لە پێکەنین و گاڵتە بوو وەری ناگرین. ئەوانەی گاڵتە بە خواکان دەکەن کەمتر وەریان دەگرین.

ڕازی نابین هۆمیرۆس بەمجۆرە باسی خواکان بکات:

کە بینیان هیفاستۆس بە شەلی لەنێو هۆڵەکەدا هاتوچۆی دەکرد خواکان دایانە قاقای پێکەنین.

بە دیدی تۆ ئەم جۆرە باسانە ڕەت دەدرێنەوە.

لەسەروو ئەمەشەوە باشترە بیر لە ڕاستی بکەینەوە. ئەگەر بۆچوونەکەمان لەبار بێت، ناڕاستی، کە سوودی بۆ خواکان نییە، وەکو دەرمان بۆ مرۆڤ باشە، بەڵام پزیشک دەتوانێت دەرمان بۆ نەخۆش دیاری بکات.

ئاشکرایە.

ئەوەی بتوانێت ناڕاستی بۆ شتێکی چاک لە شارەکەدا بەکاربهێنێت فەرمانڕەواکانن. نابێت کەسانی دیکە ئەم کارە بکەن، چونکە درۆکردنی هاوڵاتیەک لەگەڵ فەرمانڕەوادا، وەکو درۆکردنی نەخۆشە لەگەڵ پزیشکدا یان وەرزشەوانێکە لەبارەی تەندروستی خۆیەوە، یان وەکو درۆکردنی کەشتیەوانەکانە لەگەڵ سەرۆکی کەشتیەکەدا.

ئەوە بەتەواوی دروستە.
ئەگەر فەرمانڕەواکە یەکێک بگرێت درۆی کردبێت، هەر خاوەن پیشەیەک بێت پێغەمبەر، پزیشک، کە چارەی نەخۆش دەکات یان ئەو ئاسنگەرەی ڕم دروست دەکات بەناوی کەسێکەوە کودەتاچی بێت و نیازی شێواندنی شارەکە، یان شکاندنی کەشتیەکەی هەبێت سزای دەدات.
ئەگەر بیردۆزە و کارکردن پێکەوە گرێ بدەین دەبێت سزا بدرێت.
لەگەڵ مامناوەندێتیدا چی دەڵێیت؟ ئایا لاوەکان پێویستیان نییە؟
هەڵبەتە.
ئایا مامناوەندێتی ئەوە نییە، کە گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکان بیت، سەرپەرشتی خواردنەوە و خواردن و سێکس بکەیت؟
ئەوە بۆچوونی منیشە.
لێرەدا دەڵێین هۆمیرۆس بە زاری دیۆمیدسەوە باش لە کێشەکە دەدوێت:
هاوڕێم بێدەنگ دانیشە و گوێ لە من بگرە تاکو ڕازیت کەم.
هەروەها، دەڵێت: ئەخیانیەکان تامەزرۆی جەنگ بوون لەژێر فەرمانی سەرکردەکانیان بێدەنگ بەرەو جەنگ ڕۆیشتن، ئەوانە جوان باس کراون.
سەبارەت بەم دێڕە چ دەڵێیت؟
سەرخۆشەکان چاوی سەگ و دڵی ئاسکیان هەبوو.
دەتوانین ئەو گوتانەی هاوڵاتی دژی فەرمانڕەواکان بە جوان دابنێین؟
نەخێر.
لەو باوەڕەدام، بۆ گرتنی ڕێگەیەکی مامناوەندی ڕەوا نییە لاوەکان ئەم گوتانە ببیستن. لەوانەیە جوانیش بن.
چۆن بیری لێ دەکەیتەوە؟
وەکو تۆ بیری لێ دەکەمەوە.
چۆنە بیڵێن ژیرترین کەس و باشترین شت ئەوەیە، مێز دەڕازێنرێتەوە و نان و گۆشت و شەرابی لەسەر دادەنرێت، کاسەکانیش پڕ دەکرێن لە شەرابی نێو گۆزەکان. مردن بە برسێتی ناخۆشترین چارەنووسە.

لەو باوەڕەدای ئەم جۆرە (هۆنراوانە) یاریدەی لاوەکانمان بدەن و بەسەر ئارەزووەکانیاندا زاڵ بن؟ ئەی زیۆس، لە کاتێکدا هەموو خواکان دەخـەون، ئەو بە تەنیا بەئاگایە و لەبەر سێکس پلانەکانی خۆی لەبیر دەچێت، کە هیرا دەبینێت دەیەوێت بیدا بە زەویدا و پێی بڵێت لە جاران زۆرتر حەزی لێ دەکات؟ لەبارەی ئارەزووی سێکسی نێوان ئاریس و ئەفرۆدیت چی دەڵێیت، کە هیفاسیتوس بە زنجیر پێکەوە بەستنیەوە؟

نا، هیچ لەو چیرۆکانە بەڕای من لەبار نییە. بەڵام، ئەگەر گوتەی ئەو ناودارانە بەردەوام لەبەردەم هەموو شتێکدا مابێتنەوە و خۆیان ڕاگرتبێت پێویستە ببیسترێن، بۆ نموونە:

لە سنگی خۆیداو بە دڵی خۆی گوت نەڕوخێیت، تۆ لەمە زۆرتر ناخۆشیت دیوەو شەرمەزاریت بینیوە بەدڵنیاییەوە.

ئێستا، ڕێگە نادەین پاسەوانەکانمان حەزیان لە پارە بێت و بەرتیل و دیاری وەرگرن.

بەدڵنیاییەوە نابێت.

نابێت شاعیرەکانیش ئەم شیعرانەیان بۆ بخوێننەوە:

دیاری و بەرتیل دڵی خواکان و پاشاکان نەرم دەکات.

نابێت ستایشی فۆینیکس بکەین، کە لەلایەکەوە لە مامناوەندێتی دەدوێت و بە ئەخیلۆسیش دەڵێت، دیارییەکە وەرگرێت و بەرگری لە ئەخامینەس بکات. ئەوە بۆ ئەخیلۆسیش لەبار نییە. نابێت بەوەش ڕازی بین، کە ئەو ئەوەندەی حەز لە پارە بوو بۆ دیاری وەرگرتن لە ئەگامێمنون یان بە پارەیەکی زۆر لاشەکەی هێکتەری تەسلیم کردن.

دڵنیام ستایشکردنیان باش نییە.

من ڕێزم بۆ هۆمیرۆس هەیە بۆیە بە دوودڵییەوە دەڵێم نالەبارە بۆ ئەخیلۆس ئەو جۆرە کارە بکات، یان ڕازیبم بەوەی بەمجۆرە بانگی ئەپۆلۆ بکات:

تۆ لە دوورەوە، ئەی خوای بکوژ منت زامدار کرد ئەو ڕۆژەی دەسەڵاتم هەبێت خۆم دەزانم چۆن تۆڵەت لێ بسێنم.

یان دەڵێین لە فەرمانی ڕووبارەکە (یەکێکە لە خواکان) دەرچوو، کە قژی بۆ پارتۆکلیسی مردوو نەزر کرد دژی ڕاوەستا. نابێت باوەڕ بەم

جۆرە گوتانە بکرێت. ئەوەش ڕاست نییە، کە گوایە لاشەکەی هێکتەری بە دەوری گۆڕەکەی پارتۆکلیسدا ڕاکێشاوە و دیلەکانی کوشتوە. ئەمە ڕەت دەدەینەوە. ڕێگە بە هاولاتیان نادەین باوەڕ بکەن، کە ئەخیلۆس کوڕی خاتوو خوا و پیلیۆس (کوڕەزای زیۆس و کەسێکی چاک) پەروەردەکراوی زانایەکی وەکو کیرۆن ئەوەندە لەنێو دەروونەوە شپرزە و نەخۆش بێت. بووبێت بە کۆیلە و عاشقی پارە و لە ئاستی خواکان و کەسانی دیکەشدا لوتبەرز بێت.

ئەوە ڕاستە.

بەدڵنیاییەوە، باوەڕ بەوانە ناهێنین. ڕێگەش نادەین کەس باسی ئەوە بکات، کە سیسیۆسی کوڕی پۆسیدۆن و پیریتۆیۆس و کوڕی زیۆس خەریکی فڕاندن بوون. خواکان یان کوڕەکانیان کاری خراپیان کردبێت. زۆر لە شاعیرەکان دەکەین بڵێن، کە قارەمانەکانمان کاری خراپە ناکەن یان نابێت ئەو قارەمانانەی خراپە دەکەن بە منداڵی خوا دابنرێن. نابێت بە لاوان بڵێین خواکان خراپەیان لێ دەوەشێتەوە، قارەمانەکانیش لە ئاستی نزمی مرۆڤدان. ئەم (بەسەرهاتانە) ڕاست نین و بێ بڕواییە. لە پێشتریش لەو باسە دواین، کە ناگونجێت خواکان کاری خراپ بکەن.

هەڵبەتە وایە.

بێجگە لەمە، گێڕانەوەی چیرۆکەکان زیانی بۆ بیسەرەکان هەیە. بەهانە بۆ ئەو کەسانەی خراپە دەکەن دروست دەکات. ئەگەر یەکێک بزانێت خراپە لەلایەن خواکانەوە دەکرێت.

نەوەکانی خواکان خزمەکانی زیۆس و ئەوانەی لێوەی نزیکن ئەوانەی، لەسەر لوتکەی چیای ئیدا دەژین خوێنی دێو نەچۆتە لەشیانەوە

(خراپەیان لێ دەوەشێتەوە).

ئەم جۆرە چیرۆکانە نابێت بگێڕینەوە. هاندەرن بۆ ئەنجامدانی کاری خراپ28.

بەتەواوی وایە.

ئێستا هیچ چیرۆکێکی دیکە هەیە، کە باسی ناوەڕۆکەکەیمان نەکردبێت؟

تاکو ئێرە باسی ئەوەمان کردوە کەسێک چۆن لە خواکان،

قارەمانەکان، دێوەکان و ژیانی نێو بەرزەخ بدوێت. باسمان کردووە. ئەوەی باسمان نەکردبێت چیرۆکەکانە سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ. وانیە؟

ئاشکرایە.

بەڵام ئێستا ناتوانین ئەم کێشەیە باس بکەین.

بۆچی ناتوانین؟

لەوانەیە بڵێین، ئەوەی سەبارەت بە ژیانی مرۆڤ، شاعیرەکان و پەخشاننووسەکان باسی دەکەن خراپە. ئەوان دەڵێن، گەلێک لە مرۆڤە زۆردارەکـان بەختەوەرن، دادوەرەکانیش ژیانێکی ناخۆشیان هەیە، زۆرداری ئەگەر بلوێت دەربـاز بێت سوودبەخشە و ئەوی دیکەش دۆڕاو. بە بۆچوونی من، ئەم جۆرە چیرۆکانەش دەبێت قەدەغە بکرێت و داوا لە شاعیران بکەین بەم شێوەیە نەنووسن. تۆش بەم شێوەیە بیری لێ ناکەیتەوە؟

وابزانم وایە.

ئەگەر لەگەڵ مندا ڕێکەویت ئـەوە ناگەیەنێت، کە لەسەر یەکەم خاڵیش لەگەڵمدا هاوڕا بیت؟

تۆ خۆت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەوە.

تۆ لەگەڵمدا هاوڕایت پاش ئەوەی زانیمان دادوەری چیە و چ کارێکیش دادوەرییە، چیرۆکیش سەبارەت بە بوونی مرۆڤ بگێڕینەوە.

ئەوە ڕاستە.

لێرەدا کۆتایی بە مشتومڕەکەمان لەسەر ناوەڕۆکی چیرۆکەکان دەهێنین. با لە شێوازەکەیان بدوێین، بەمجۆرە لە ناوەڕۆک و شێوازی گێڕانەوەکەشیان تێدەگەین.

ئەدیمەنتۆس گوتی؛ نازانم مەبەستت چیە؟

دەبێت بزانیت. من لە وەڵامدا گوتم. لەوانەیە باشتر تێبگەیت ئەگەر بەمجۆرە کێشەکە ڕوون بکەمەوە. ئـەوەی شاعیر و چیرۆکنووس باسی دەکات لەبارەی ڕابردوو، ئێستا و داهاتووەوە نییە؟

هیچی تر هەیە باسی بکەن؟

ئایا باسەکانیان گێڕانەوەیە، یان لاساییکردنەوە، یان گێڕانەوەیە بە لاساییکردنەوەوە؟

حەزدەکەم زیاتر ڕوونی بکەیتەوە.

وادیـارە مامۆستایەکی باش نیم بۆ ڕوونکردنەوە. منیش وەکو ئەوانەی نازانن بە باشی بدوێن بۆ ڕوونـکـردنـەوەی واتـای کێشـە گەورەکە پەنا بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنێکی دەبەم. تۆ لەبیرتە (ئیلیاد) چۆن دەست پێدەکات، شاعیرەکە دەڵێت، کریسیس لە ئاگامەمنون دەپاڕێتەوە کچەکەی بەردات. ئەویش ڕازی نابێت و کریسیس داوا لە خوا دەکات تۆڵەی لە ئەخیانس بسەنێت؟ ئەوە دەزانم.

کەوابوو ئەم دێڕانەت لەبیرە:

لە ئەخیانسـەکان پاڕایەوە بەتایبەتی لە دوو کوڕەکەی ئەتریۆس، سەرۆکی لەشکرەکە29.

شاعیرەکە خـۆی ئـەم بەسـەرهاتە دەگێڕێتەوە و لەسـەر زاری کەسێکی دیکە پێمان ناڵێت. دوایی هەوڵ دەدات ڕازیمان بکات بەوەی، کە خۆی کریسیسە و هۆمیرۆس نییەو بە جوانی بەسەرهاتەکانی ترۆی و ئیتاکا و ئۆدیسە دەهۆنێتەوە.

ڕاستە.

ئێستا ئەوەی باسی دەکات گێڕانەوەیە؟

هەڵبەتە.

بەناوی کەسێکی دیکەوە بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە. ئایا ئەمە وامان لێ ناکات بڵێین شێوازی خۆی بە شێوازی گوتەکەرەکە دادەنێت؟

بەدڵنیاییەوە وایە.

ئـەوەی شێوازی خۆی بە شێوازی کەسێکی دیکە نیشان بدات لاسایی ئەو کەسە دەکاتەوە.

بەدڵنیاییەوە.

لەم دێڕانەدا (هۆمیرۆس) و شاعیرەکانی دیکەش دەردەکەوێت گێڕانەوەکەیان لاساییکردنەوەیە.

ڕاستە.

شاعیرێک خۆی نەشارێتەوە هۆنراوەکانی دەبێت بە گێڕانەوەیەکی بێ لاساییکردنەوە. بۆئەوەی نەڵێیت لە مەبەستت تێناگەم. ئەم خاڵەت نیشان دەدەم چۆنە. ئەگەر هۆمیرۆس بڵێت کریسیس بە پـارە و دیارییەکی زۆرەوە بۆ ڕزگارکردنی کچەکەی هاتە لای ئەخیناسەکان

و پاشاکانیان. دوایی هیچ نەڵێت و خۆی نەکات بە کریسیس نابێت بە لاساییکردنەوە و گێڕانەوە. هەرچەندە من شاعیر نیم، بەڵام بەمجۆرە دەیهۆنێتەوە: خواناسەکە هات و لە خواکان پاڕایەوە، تاکو ترۆی بگرن و ئاشتی بەرقەرار بێت. پارە و دیارییەکان وەرگرن، کچەکەی ڕزگار بکەن و سوپاسی خوا بکەن. لەگەڵ ئەم گێڕانەوەیەدا کەسانی گوێگر ڕێز بۆ خواناسەکەش دادەنێن، بەڵام ئاگامەمنون تورە بوو، دەری کرد و گوتی: جارێکی دیکە بۆ ئێرە نەگەڕێیتەوە. ئەو گوتی: پێش ڕزگارکردنی کچەکە لە ئارگۆس لەگەڵیا پیر دەبێت. بە کریسیسی گوت: بڕوات و ئەگەر دەیەوێت بە سەلامەتی بگاتە ماڵەوە لەوە زۆرتر تورەی نەکات. کاتێک کریسیس ئەمەی بیست ترسا و بەبێ دەنگ گەڕایەوە. دوایی لە ئەپۆلۆ پاڕایەوە و بیری خستەوە چی بۆ کردووە. داوای لە ئەپۆلۆ کرد بەرانبەر خزمەتەکانی بۆ خوا، دروستکردنی پەرستگایەک، یان شتێکی دیکە بێت، خوا بۆ فرمێسک ڕشتنەکەی ئەخیانسەکان تیرباران بکات. ئەمە گێڕانەوەیە بەبێ لاساییکردنەوە.

من تێدەگەم.

کەوابوو، تێبگە، پێچەوانەی ئەمە لاساییکردنەوەیە. ئەمەش لەگەڵ لابردنی وشەی نێوان گوتەکاندا ڕوودەدات و گوتەکان بە ڕووتی دەهێڵێتەوە.

من تێدەگەم. تراجیدیا بەم جۆرەیە.

ئەوە بەتەواوی دروستە. ئێستا دەتوانم خاڵەکەی پێشوو ڕوون بکەمەوە. جۆرێک لە هۆنراوەو چیرۆک لاساییکردنەوەیە- دەشێت تراجیدی یان کۆمیدی بێت. جۆرێکی دیکە گێرانەوەیە لەلایەن شاعیرەکەوە. ئەمەش هەموو جۆرەکانی هۆنراوەی بەسۆز دەگرێتەوە. جۆری سێیەمیش، شێوەی گێڕانەوەی شیعری قارەمانێتیە، ئەگەر لە مەبەستەکەی من تێبگەیت.

من ئێستا لە مەبەستی تۆ تێدەگەم.

هەروەها، لەبیرت نەچێت لەپێشدا باسی ناوەڕۆکی چیرۆکەکانمان کرد. ئێستا لە گێڕانەوەی ناوەڕۆک دەکۆڵینەوە.

بەڵێ، ئەوەم لەبیرە.

باشە مەبەستی من ئەمەیە: دەبێت لەسەر ئەوە ڕێکەوین ڕێگە بە

شاعیر بدەین بەسەرهاتەکان بە لاساییکردنەوە بگێڕێتەوە، یان نا. ئەگەر ڕێگەی بدەین داخۆ بە تەنیا دەبێت لاسایی چەند شتێک بکاتەوە یان هەموویان. ئەو چەند شتانەش چین ئەو دەتوانێت لاساییان بکاتەوە؟

تۆ ئەو پرسیارە دەکەیت، ئایا لە شارەکەماندا ڕێگە بە کۆمیدی، یان تراجیدیا دەدەین.

هەڵبەتە و لەوەش زیاتر چۆن من بەش بەحاڵی خۆم نازانم، با بزانین مشتومڕەکەمان بەرەو کوێمان دەبات.

باشە.

کەوابوو، ئەدیمەنتۆس بیر بکەوە لەوەی پاسەوانەکانمان لاساییکەر بن یان نا.

ئایا ئەمەش پەیوەندی بەو خاڵەوە نییە لە پێشتر باسمان کرد و گوتمان هەرکەسە دەبێت پیشەی دیاریکراوی خۆی هەبێت چەند کارمەند نەبێت. ئەگەر بەمجۆرە نەبێت کەس لە بوارەکەی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت؟ سەرکەوتوو نابێت. سەرکەوتووش نابێت ئەگەر لاسایی زۆر شت بکاتەوە. تەنانەت لە دوو شتدا، وەکو کۆمیدی و تراجیدیا کەسێک لە هەردووکیاندا سەرکەوتوو نابێت.

تۆ نەتگوت ئەم دووانە لاساییکردنەوەن؟

من گوتم. تۆش ڕاستت گوت، کە کەسێک ناتوانێت لە هەردووکیاندا سەرکەوتوو بێت.

تەنانەت ناتوانێت چیرۆکخوان و ئەکتەریش بێت.

ڕاستە.

بێگومان ئەو ئەکتەرانەی دەوری تراجیدیا دەبینن بۆ کۆمیدی دانانرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە لاساییکردنەوەن. وانیە؟

بەڵێ، ئەوانە لاساییکردنەوەن.

سروشتی مرۆڤ، ئەدیمەنتۆس، بۆ من وا دەردەکەوێت ئاسنی وردتری لەنێودا مۆر کرابێت. ئەو ناتوانێت بە باشی لاسایی چەند شتێک بکاتەوە و وەکو ئەوان هەڵسوکەوت بکات. ئەوە ڕاستە.

ئەگەر لەگەڵ بیروڕای یەکەممان‌دا بین پاسەوانەکان تەنیا بە کار و ئەرکی خۆیان هەستن نابێت لاسایی بکەنەوە. ئەگەر لاساییکەرەوەش

بن پێویسته له منداڵییەوه بۆ ئەو کاره پەروەرده بکرێن، بۆ نموونه، ئەگەر بیانەوێت ئازا، بڕواکەر، ئازاد و خۆگر بن. نابێت له لاساییکردنەوەی پیشه سووکەکان و شەرماوییەکاندا ژێر بن و چێژ لەو لاساییکردنەوەیه وەرگرن. نازانیت کەسێک له منداڵییەوه لاسایی بکاتەوه لاساییکردنەوه دەبێت به بەشێک له سروشت و خۆرسکی ئەو کەسە، لەنێو دەنگ و جووڵه و هەڵسوکەوتیدا ڕەگ دادەکوتێت؟

بێگومان دەزانم.

کەوابوو، ڕێگە نادەین بەو کەسانەی ئێمه بایەخیان پێ دەدەین و دەمانەوێت ببن به مرۆڤی چاک لاسایی کیژۆڵه و پیرێژن بکەنەوه. دەوری ئەوه ببینن لەگەڵ مێردەکەیدا ناسازه و به دژ خواکاندا دەچێت و خۆی به زل دادەنێت. وا بیردەکاتەوه بەختەوەره، یان خەمباره و خۆی به بێ بەخت دادەنێت، یان نەخۆشه و له خۆشەویستیدا دۆڕاوه، یان ناتوانێت کار بکات. ئەوه بەتەواوی دروسته.

نابێت لاسایی کۆیلەی مێینه و نێرینەش بکەینەوه.

نابێت.

مرۆڤی خراپیش، ئەوانەی ترسنۆکن و گاڵته به یەکدی دەکەن، ناوی یەکدی دەزڕێنن، به سەرخۆشی جنێو دەدەن و خۆیان تووشی هەڵه دەکەن. نابێت دەوری شێت به گوتن و کردار ببینن. ئەوان دەتوانن لەبارەی ژن و پیاوی شێتەوه فێر بن، بەڵام نابێت وەکو ئەوان هەڵسوکەوت بکەن.

ڕاسته.

دەبێت لاسایی ئاسنگەر و پیشەمەندەکانی دیکە، ئەوانەی لەسەر کەشتی کار دەکەن بکەنەوه؟ چۆن دەبێت؟ ئەوه کارو پیشەی ئەوان نییه.

لەبارەی ئەمەوه چی دەڵێیت؟ دەبێت لاسایی حیلەی ئەسپ، بۆڕەی گا، خوڕەی ڕووبار، هاژەی دەریا و گرمەی هەور و ئەم جۆره شتانه بکەنەوه؟ ڕێگەیان پێ نادرێت شێت بن، یان لاسایی شێت بکەنەوه.

من تێبگەم تۆ دەتەوێ بڵێیت یەک جۆر گێڕانەوه هەیه کەسێک چاک خۆی پێوه ماندوو دەکات. جۆرەکەی دیکە، که لەمەوه جیایه کەسێکی جیاوازتر خەریکی دەبێت.

ئەو جۆرانە کامانەن؟
بە بڕوای من، ئەگەر گوتە و کردەوەی کەسێکی چاک بگێڕینەوە دەبێت بەو جۆرە باسی بکەین، کە ئێمە ئەو کەسەین و شەرمیش نەکەین لاسایی بکەینەوە. زۆر چاک لاسایی کارە چاکەکان دەکەینەوە، کەمتریش یان بە نابەدڵییەوە لەو لایەنانە دەدوێین، کە کەسە چاکەکە بە باش دەرناخات. بۆ نموونە ئەو کاتەی کەسە چاکەکە نەخۆشە یان لە ئارەزووی سێکسیدایە یان سەرخۆشە یان تووشی بێ بەختیەک دەبێت. ئێمە ئەم دەورەش بە باشی نابینین، چونکە فێرنەکراوین لاسایی شتی خراپ بکەینەوە و حەزیان لێ ناکەین.
وادیارە بەم شێوەیە بێت.
لاساییکەر جۆرێک لە گێڕانەوە لە چیرۆکەکەی هۆمیرۆسدا، کە پێشتر باسمان کرد بەکاردەهێنێت. شێوازی گێڕانەوەکەی لاساییکردنەوە و جۆرەکەی دیکەشە، بەڵام، ئایا بەدرێژایی گێڕانەوەی چیرۆکەکە لاساییکردنەوە کەمتر نابینیت؟
ئەمە شێوازی گێڕانەوەکەیە.
کەسێک نەتوانێت دەورێکی چاک ببینێت چەند خۆی بە کەم ببینێت ئەوەندە زۆرتر حەزدەکات چیرۆکەکان بگێڕێتەوە و لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا هەموو دەورەکان، وەکو گرمەی هەور، گڤەی با، دەنگی ویل، خولخلۆکە، زوڕنا و شمشاڵ و ئامێرەکانی دیکە و وەڕینی سەگ، باعەی مەڕ و دەنگی باڵندەکانیش ببینێت. دەوری ئەم جۆرە کەسە لاساییکردنەوەیە بە دەنگ و جووڵەی لەش، کەمتر گێڕانەوەی تێدایە.
ئەوە ڕاستە.
ئەمانە دوو جۆر شێواز بوون من ئاماژەم بۆ کردن.
ئەوانە دوو جۆرن.
ئەگەر کەسێک لەگەڵ گێڕانەوەکەدا پارچە مۆسیقایەکیش لێ بدات، کە لەگەڵ (بەسەرهاتەکەدا) دەگونجێت، ئایا خۆی لەگەڵ ئاوازەکەدا هاوسەنگ ناکات؟
ڕاستە.
بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ئایا پێویستیمان بە هەموو جۆرە ئاهەنگێکی

مۆسیقا نییە؟
ڕاستە.
ئایا شاعیرەکان پەیڕەوی یەک جۆر لەم دووانە دەکەن، یان هەردووکیان تێکەڵ دەکەن؟
پێویستە پەیڕەوی بکەن.
ئێمە چ بکەین؟ ڕێگە بە کامیان بدەین؟
بە بیروڕای من ڕێگە بە ئەکتەرە چاکەکە بۆ لاساییکردنەوەی کەسە چاکەکان دەدەین.
هێشتا، ئەدیمەنتۆس، دوو شێوازە تێکەڵەکەش خۆشە. منداڵان و فێرکەرەکانیان و زۆرکەس پەسەندی دەکەن. بەڵام تۆ لەو باوەڕەدایت بەگوێرەی بەرنامەکەمان بێت، چونکە هیچ تاکێک لە یەک کاتدا نابێت بە دوو کەس و هەر تاکە پیشەی (دیاریکراوی) خۆی پێ دراوە.
بێگومان، پەیڕەوی بەرنامەکەمان ناکات.
ئایا ئەمە هۆ نییە بۆئەوەی لە شارەکەماندا پینەچی پیشەی پینەچێتی هەبێت و کەشتیەوانیش کاری پینەچێتی نەکات، یان جووتیارێک جووتیاری بکات و نەبێت بە دادوەر و سەربازیش نەبێت بە بازرگان؟
ئەوە ڕاستە.
ئەگەر کەسێک فێرکرابێت هەموو دەورێک ببینێت و لاسایی هەموو شتێک بکاتەوە بێتە نێو شارەکەمان و هۆنراوەیەکی (قارەمانێتیمان) بۆ بگێڕێتەوە، پێویستە وەکو کەسێکی پیرۆز و سەرنجڕاکێش ڕێزی بگرین. بۆی باس دەکەین کەسێکی دیکەی وەکو ئەو لە شارەکەماندا نییە، بەڵام یاسا ڕێگەی نادات لێرە بمێنێتەوە. گوڵاو بەسەریا دەپرژێنین، سەبەتە گوڵ دەکەین بە تاج بۆ سەری و ڕەوانەی شارێکی دیکەی دەکەین. ئەو شاعیرانەمان پێویستە کەمتر بیر لە خۆشی بەخشین دەکەنەوە و لاسایی کەسانی چاکیش دەکەنەوە. ئەوانەی هۆنراوەکانیان لەو شێوازانە دەرناچن بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی سەربازەکانمان ڕایان دەگرین.

من لەگەڵتام. لەوە دەچێت بە کۆتایی مشتومڕەکەمان سەبارەت

بە شێوازی ناوەڕۆک و دەربڕینی هۆنراوە، چیرۆک و مۆسیقا گەیشتبین.
بەڵێ.
ئایا پێویست ناکات باسی هۆنراوەی گۆرانی و گۆرانیش بکەین؟
پێویستە.
ئایا کەس ناگاتە ئەو باوەڕەی، کە ئەمانیش دەبێت پەیڕەوی بەرنامە دامەزراوەکەمان بکەن؟
گلاوکۆن پێکەنی و گوتی: سوکرات من لەوە دەترسم نەگەیشتبێتمە ئاکام، چونکە بیرۆکەیەکی چاکم پێ نییە دەریببڕم و لە گوماندا دەژیم.
لەگەڵ ئەمەشدا، تۆ دەزانیت گۆرانی سێ توخمی هەیە، وشەکان، شێوازی هارمۆنی و هۆنینەوە.
بەڵێ، من دەزانم. هۆنینەوەی وشەکان بۆ گۆرانی و مۆسیقا وەکو یەکن. لەبەرئەمە، پێویست ناکات بخرێتە بەر ڕۆشنایی بەرنامەکەمان؟
وایە.
هەروەها، شێوازی هارمۆنی و هۆنینەوەی گۆرانیەکە لەگەڵ وشەکاندا ڕێک ناخەین؟
وایە.
لە پێشتر گوتمان لاوانەوە و هۆنراوەی خەمناکمان پێویست نییە.
بەڵێ گوتمان.
شێوازە خەمبارەکان چۆنن؟ تۆ بۆم باس بکە، چونکە تۆ مۆسیقازانیت.
وەکو، میکسۆ- لیدیەن و سینتۆنۆ- لیدیەن و هەندێکی دیکەش.
پێویست دەکات لایان بەرین؟ تەنانەت بەکەڵکی ژنی چاک و بەڕێزیش نایەن.
بەدڵنیایەوە.
سەرخۆشی، نەرمی و تەمەڵیش بۆ پاسەوانەکانمان خراپن.
چۆن ڕەتیان بدەینەوە؟
چ شێوازێکی نەرم بۆ کۆمەڵێک چاکە، کە دەخۆنەوە؟
ئەو گۆرانییە لەسەرخۆیانەی شێوازی ئەیۆنی و لیدیەن.

ئایا ئەم گۆرانیانە مرۆڤ دەکەن بە جەنگاوەر؟
هەرگیز نا. ئەوەی دەمێنێتەوە ئاوازەکانی دۆریەن و فریگیانە.
من شارەزای ئاوازەکان نیم. تۆ ئەو ئاوازەم بۆ باس بکە، کە بۆ لاساییکردنەوەی کەسێکی قارەمان و نەبەرد بەرانبەر زام و مردن و بێ بەختیەکانیدا دەگونجێت و لە ئاستیاندا خۆڕاگرە. ئاوازێکی دیکەشم بۆ دابنێ، کە پەیوەندی بە کەسێکی ئاشتیخوازەوە هەیە و کارێکی چاک دەکات، نوێژ بۆ خوا دەکات، یان ستایش بۆ فێرکەرەکەی دەکات، زیادەڕۆیی ناکات، خۆگرە و لوتبەرز نییە و تێدەگات. ئەم دوو شێوازەم پێ بناسێنە، کە زۆر چاک لاسایی زەبر یان کارێکی خۆکرد دەکاتەوە و دەنگی کەسانی قارەمان و مامناوەندی، لە حاڵەتی چاک و خراپدا تێدا بەرز دەبێتەوە.
ئەو شێوازی ئاوازانەی داوایان دەکەیت، ناوم بردن.
باشە، کەوابوو پێویستیمان بە پۆلی هارمۆنیک و ئەو ئامێرە تەلدارانەش نییە لەگەڵ گۆرانیەکەدا لێبدرێن.
لەوانەیە پێویست نەبێت.
لێرەدا، پێویستیمان بەو کەسە نییە، کە عود و گیتارە و پۆلی هارمۆنیک و ئامێرە تەلدارەکانی دیکە دروست دەکات.
دەردەکەوێت پێویست نەبێت.
ئەی ئەو کەسەی شمشاڵ دروست دەکات و شمشاڵ لێدەدات؟ ڕێگەیان پێ دەدرێت لەنێو شارەکەماندا بژین
ئایا هەموو جۆرەکانی هارمۆنیکا لە شێوەی شمشاڵ دروست نەکراون؟
بەدڵنیاییەوە.
باسی گیتار و تارمان نەکرد. ئەمانە بۆ شار و لادێش باشن. دەبێت لوولەیەکیشمان هەبێت شوانەکان ئاوازی پێ دەربهێنن.
لە مشتومڕەکەماندا ئەمە دەردەکەوێت.
ئەگەر ئەپۆلۆ و ئامێرەکانی لە مارسیاس و ئامێرەکانیمان پێ باشتر بێت کارێکی نوێمان نەکردوە.
بەخوا وا دەردەکەوێت.
(سوێنە بە سەگ) شارەکەمان لە ڕابواردن پاک کردۆتەوە.

چونکە زیادەڕۆییمان نەکردووە.
باشە. با شتەکانی دیکەش پاک بکەینەوە. پاش باسەکەمان لەسەر شێوازەکانی مۆسیقا دێینە سەر ڕێکخستنی مەوداکان. نابێت ناسکی و هاوکات فرە جۆریشمان لە مەوداکاندا هەبێت، بەڵکو پێویستە بەدوای ئەو کەسەدا بگەڕێین، کە هۆنینەوەکەی هاندەری ئازایەتییە. مەوداو ئاوازەکەی وەردەگرین و لەگەڵ هۆنراوەکەدا دەیگونجێنین. ئەنجا دەکەوێتە سەر تۆ بڕیار لەسەر چۆنیەتی هۆنینەوەکە بدەیت.
نازانم چی بڵێم، وەکو چۆن چوار شێواز هەن دەتوانم سێ جۆر مەودات بۆ دەستنیشان بکەم، کە دەبن بە بناغە بۆ ئەوانی دیکەش، بەڵام ناتوانم لاساییکردنەوەی ژیان لای ئەم مەودایانە ڕوون بکەمەوە.
ڕوودەکەینە (دامون) تاکو پێمان بڵێت چ جۆرە مەودایەک لەگەڵ ژیانی کۆیلایەتی، لاساری، شێتی و کارە خراپەکانی دیکەو دژەکانی ئەم شێوازانەشدا دەگونجێت. بیستومە (ئینۆپلیۆنی) بۆ مەودا داناوە (بەڵام دڵنیا نیم)، هەروەها بڕگە، یان مەودای قارەمانێتی هەڵبەستووە. نازانم بەرزی و نزمییان چۆنە. بۆی دەچم هەر یەکێک لەوانەی ناو ناوە (ئیامبوس) و (ترۆچی) و درێژ و کورتی کردوونەتەوە. لە هەندێکیاندا خێراییەکەشی کەم کردۆتەوە، بەڵام نازانم ئەوانە چۆنن.
بۆ ئەمە ڕوو لە دامون دەکەین. دیاریکردنی جیاوازییەکانیان مشتومڕی پێویستە. پێویست دەکات ئێمە باسیان بکەین؟
نا، پێویست ناکات.
بەڵام تۆ جیاوازییەکانیان دەبینیت. هۆنینەوە لەسەر بەخشندەیی و بێ بەخشندەیی، وەکو خراپە و چاکەیە. هەڵبەتە. بێجگە لەمە، بەو جۆرەی باسمان کرد، ئەگەر هۆنینەوەو شێوەکەی بەرانبەر وشەکان بوەستن ئەم پەیوەندییەش پێویست بێت هۆنینەوەی چاک دەبێت وشەی چاکی تێدا بێت و هۆنینەوەی خراپیش وشەی خراپ. ئەمە بۆ ئاوازی هارمۆنی و ناهارمۆنیش دروستە.
دڵنیام ئەمانە پەیوەندییان بە وشەکانەوە هەیە.
سەبارەت بە ناوەڕۆک و شێوازی وشەکانەوە چ دەڵێیت؟ ئایا پەیوەندییان بە دەروونی گوتەکەرەکەوە هەیە؟ هەڵبەتە. هەموویان پەیوەندییان بە وشەکانەوە هەیە؟

بەڵێ.
کەوابوو، وشەی چاک، هارمۆنی، بەخشندەیی و هۆنینەوە دەبێت سادە بێت. مەبەستم لە سادەیی گوتەی نەرم و بیرکردنەوەی ساکارانە نییە. مەبەستم ئەو جۆرە سادەییەیە، کە لەگەڵ نەخشە و پلانەکانی ژیرییدا کۆکن.
ئەمە بەتەواوی دروستە.
پێویست ناکات لاوەکانمان لە هەر شوێنێکدا کار بکەن پەیڕەوی بکەن؟
پێویست دەکات.
ئێستا دێینە سەر وێنەکێشان، کە ئەم خەسڵەتانەی تێدایە. هونەرەکانی دیکەش بەمجۆرەن؛ تەونکردن، چنین، تەلارسازی و ئەو پیشەیەی کەلوپەلی نێوماڵ دروست دەکات خاوەنی ئەم خەسڵەتانەن. لەشمان پڕە لەم خەسڵەتانە. لەنێو هەموویاندا بەخشندەیی و نابەخشندەیی هەیە. نابەخشندەیی، هۆنینەوەی خراپ و ناهارمۆنی پەیوەندی بە ڕەفتار و وشەی خراپەوە هەیە. دژەکانیشیان لاساییکردنەوەی ڕەفتارە چاکەکان و مامناوەندییەکانن.
بەتەواوی دروستە.
ئایا تەنیا سەرپەرشتیی شاعیرەکان دەکەین و ناچاریان دەکەین وێنەی چاک لە هۆنراوەکانیاندا دەربڕن؟ ئایا داوا لە هونەرمەندانی دیکە ناکەین لە تابلۆ و تەلار و بەرهەمەکانیاندا ڕەفتاری کۆیلایەتی و بەرەڵایی و نابەخشندانەمان نیشان دەدەن؟ ڕێگە بەو هونەرمەندە دەدرێت، کە سەرپێچی ئەم (بڕیارانە) دەکات لە شارەکەمان بژی و نموونەی خراپ بە پاسەوانەکانمان نیشان بدات و دەروونیان پڕ بکات لە خراپە؟ ئایا پێویست دەکات بەدوای هونەرمەندی کارچاکدا بگەڕێین تاکو لاوان ژیانێکی تەندروستمەندیان هەبێت، سوود وەرگرن و لە منداڵییەوە فێری هاوڕێیی هارمۆنی و جوانیی ژیریی بن؟
ئەم شێوەیەی دوایی چاکترین جۆری پەروەردەکردنە بۆ لاوان.
ئەمانە بۆ گرنگی فێربوونی هۆنراوە و مۆسیقا هۆ نین؟
یەکەم، لەبەرئەوەی هۆنینەوە و هارمۆنی لە هەموو شتێک زۆرتر بە ناخیاندا دادەچۆڕێن و کاریان تێدەکەن، ئەوانەی هۆنراوەو مۆسیقا

دەخوێنن فێری بەخشندەیی دەبن.
دووەم، هەر کەسێک هۆنراوە و مۆسیقا بخوێنێت بەئاسانی هەست بە کەموکورتی لە بەرهەمێکدا دەکات. لەبەرئەوە، ناڕێکی پەسەند ناکات و حەزی لە کاری چاکە. ئەوەی هۆنراوە و مۆسیقا دەخوێنێت دەزانێت لە تەمەنی لاوێتیەوە چۆن دژی کارە شەرماوییەکان ڕاوەستێت و ڕقی لێیان بێت. دەزانێت چۆن پێشوازی ژیری بکات، چونکە ئەو لە ژیرییەوە نزیکە.
بەڵێ، من لەسەر ئەم هۆیانە بۆ خوێندنی هۆنراوە و مۆسیقا هاوڕام.
ئایا دروستە، ئەگەر وێنەی کۆمەڵێک پیت لە ئاوێنەدا یان لەنێو ئاودا ببینین، ئێمە ئەو پیتانە تاکو بەڕاستی نەبینین، نایناسینەوە، چونکە دەرکەوتنەکەیان بەشێکە لەو هونەرە؟
بەتەواوی وایە.
توخوا پێم بڵێ، ئایا دروست نییە ئێمە تاکو فۆرمەکانی مامناوەندی و ئازایەتی و ڕاستگۆیی و ژیری نەناسین و دژوەستاوەکانیان نەدۆزینەوە نەتوانین پاسەوانەکانمان فێری هۆنراوە و مۆسیقا بکەین؟ ئەم فۆڕمانە لە هەموو شوێنێکدا ڕووبەڕوویان دەبنەوە و دەردەکەون. گرنگ نییە بە گەورەیی، یان بچووکی نووسرابێتن، ئەوان سەر بە جۆرێک هونەرن؟
ئەوە بەتەواوی دروستەو بنەڕەتیە.
ئەگەر کەسێک خاوەنی دەروونێکی چاک و لەشێکی جوانیش بێت، دەروونی و لەشی پێکەوە هاوسەنگ بن، ئایا ئەوە جوانترین شت نییە تەماشای بکرێت؟
بەدڵنیاییەوە.
ئایا جوانترین شت پەسەندترینیش نییە؟
هەڵبەتە.
مۆسیقازانیش لە هەموو کەسێک زۆرتر ئەو جوانیەی لا پەسەندە. حەز لە شتێک ناکات هارمۆنی نەبێت؟ نەخێر، حەزی لێ ناکات، بەتایبەتی ئەگەر کەموکورتیەکە دەروونی بێت. ئەگەر لە لەشدا بێت لەگەڵیا ڕادێت و بەدوای لەشێکی جوانتردا دەگەڕێت.

من تێدەگەم، کە تۆ ئەو لاوەت خۆش دەوێت، یان خۆشت ویستوە. من لەگەڵتا ڕێدەکەوم، بەڵام پێم بڵێ، ئایا زیادەڕۆیی لە چێژوەرگرتن لەگەڵ مامناوەندێتیدا دەگونجێت؟

چۆن دەگونجێت؟ وەکو ئازار مرۆڤ بەرەو شێتی دەبات.

سەبارەت بە چاکەکانی دیکەوە، چ بیروڕایەکت هەیە؟

بەمجۆرە نین.

ئایا لەگەڵ زەبر و پەیوەندیی سێکسی ناڕێکدا دەگونجێیت؟

وایە.

لەو باوەڕەدایت چێژێک هەبێت لە سێکس خۆشتر بێت؟

لەو باوەڕەدا نیم. بەڵام خۆشەویستی دروست و سروشتی ئەو جۆرەیە، کە ڕێک و جوانە. لە ڕێگەی پەروەردەکردنی ئەو کەسە بە هۆنراوە و مۆسیقا شێوازێکی مامناوەندی وەرگرتوە.

ئەوە ڕاستە.

کەوابوو خۆشەویستی دروست پەیوەندی بە کاری شێتانە و پەیوەندی سێکسی ناڕێکەوە نییە؟

نەخێر، پەیوەندی نییە.

لەم حاڵەتەدا، پەیوەندی بە چێژی سێکسیشەوە نییە. ئەوانەی خۆشەویستی دەکەن، بیر لە چێژی سێکسی ناکەنەوە؟

نا، بەخوا، سوکرات نابێت بیری لێ بکەنەوە.

دەردەکەوێت، تۆ یاسایەک لە شارەکەدا بۆ هاوڵاتیان دادەمەزرێنیت. هەرکەسێک کوڕێکی خۆش بوێت دەتوانێت داوای ماچی لێ بکات، لەگەڵیا بێت، وەکو باوک و کوڕ، لەنێو پەیوەندییە چاک و جوانەکەدا دەستی لێبدات. لەمە زۆرتر پەیوەندییەکەیان تێنەپەڕێت ئەگینا وەکو ئەو کەسەی لە هۆنراوە و مۆسیقا نازانێت و جوانی و چاکە ناناسێت ڕەفتار دەکات.

ئەوە ڕاستە.

تۆ لەو باوەڕەدایت باسەکەمان لەسەر پەروەردەی هۆنراوە و مۆسیقا تەواو بووبێت؟ بەهەرحاڵ، لەگەڵ خۆشەویستی بۆ چاکە و جوانی کۆتایی هات.

لەگەڵتا هاوڕام.

دوای هۆنراوە و مۆسیقا لاوەکانمان فێری وەرزش دەکەین.

هەڵبەتە.

لێرەشدا پێویستە پەروەردەکردنەکەیان لە منداڵییەوە سەرپەرشت بکرێت. بە دیدی من، وادیارە، لەشێکی بە سروشت تەندروست نابێتە هۆی دەروونێکی چاک، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕاستە. دەروونی چاک لەشێکی تەندروست دروست دەکات. ئەمە بە لای تۆوە چۆنە؟

بەڕای من وایە.

ئایا پاش ئەوەندە بایەخدان بە پەروەردەکردنی دەروون پێویست ناکات سەرپەرشتی پەروەردەکردنی لەشیش بکەین؟

بەدڵنیاییەوە.

گوتمان، کە نابێت پاسەوانەکان خۆیان سەرخۆش بکەن و نەزانن لەکوێدا دەژین.

نابێت، پاسەوان بۆ پاسەوان ڕاگرین.

لەبارەی (خواردن)ەوە چی دەڵێیت؟ ئایا ئەم پاسەوانانە وەرزشکار نین؟

بەڵێ، وەرزشکارن.

ئایا ئەو پارێزەی بۆیان دادەنێین لەپێناوی ئەواندا نییە؟

بەڵێ وایە .

لەوانەیە ببێتە هۆی سستی و تەمەڵییان و بۆ تەندروستیان بکەوینە گومانەوە. ئایا دەزانیت، کە لادان لەو پارێزە دەبێتە هۆی نەخۆشی لە وەرزشکارەکاندا؟

من دەزانم.

کەوابوو، پاسەوانە وەرزشکارەکانمان پێویستیان بە مەشق و ڕاهێنانی تەواو هەیە. وەکو سەگی ڕاوچی دەبێت نەخەون و بەئاگا بن. لەگەڵ گۆڕانەکانی خواردن و خواردنەوە، زستان و هاوین خۆڕاگر بن و تەندروستیان بەرەو خراپی نەڕوات.

بە دیدی منیش، دەبێت بەمجۆرە بێت.

ئێستا، نابێت ئەو وەرزشە لەو هۆنراوەو مۆسیقایانەوە نزیک بێت، کە فێریان دەکرێت؟

چۆن؟

مەبەستم وەرزشێکی سادەیە (وەکو جۆری هۆنراوە و مۆسیقاکە) بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە مەشقکردن و خۆئامادەکردن بۆ جەنگ هەیە.

ئەوە چۆنە؟

دەشێت لە هۆمیرۆسەوە فێر بیت. تۆ دەزانیت، (هۆمیرۆس) ماسی و گۆشتی کوڵاو بۆ قارەمانەکانی پێش جەنگ دانانێت؟ بۆ نموونە، لە جەنگی (هێلیسپۆن)دا ئەمە دەبینین. هەرچەندە (قارەمانەکان) نزیک دەریاشن ئەو گۆشتیان بۆ دەبرژێنێت و دەیانداتێ. ئەمە بۆ سەرباز بەئاسانی ئامادە دەکرێت، چونکە ئاگرکردنەوە لە هەموو شوێنێک ئاسانە و پێویستیشمان بە لەگەن و ئاو نییە.

ئەوە ڕاستە.

لەو باوەڕەدام هۆمیرۆس باسی شیرینیشی نەکردووە. تەنانەت وەرزشکارەکانیش نازانن، کە نابێت ئەم جۆرە شتانە بخۆن.

من نازانم.

کەوابوو، تۆ لەگەڵ ئەوەشدا نیت، کە ژنە کۆرینتیانەکان بۆ پیاوەکان دەبێت تەندروستمەند بن.

من لەگەڵ ئەوەدام.

سەبارەت بە خواردنی شیرینی و کێک چ دەڵێیت؟

نابێت بیخۆن.

ئێمە دەتوانین ئەم پارێز و جۆری ژیانە لەگەڵ هۆنینەوە و دانانی هۆنراوە و گۆرانیەکاندا (کە بۆ لاوەکان بڕیارمان لەسەر دان) بەراورد بکەین.

بێگومان.

ئایا ئەو (خواردنانە) وەکو چۆن خۆڕازانەوە و خۆجوانکردن دەبێتە هۆی ڕوودانی جووتبوونێکی سێکسی نارێک، تەندروستی بەرەو خراپی نابات؟ ئایا سادەیی لە هۆنراوە و مۆسیقادا دەروون ئارام ناکات و لە ئاستێکی مامناوەندا ڕایناگرێت؟ وەرزش لەش تەندروست ناکات؟

ئەمە بەتەواوی دروستە.

لە کاتێکدا بەڕەڵایی سێکسی و نەخۆشی بە شارەکەماندا

بڵاودەبێتەوە پێویست ناکات دادگاو نەخۆشخانە بکەینەوە؟

پێویستە.

چی هەیە لەوە شەرمتر و خراپتر لە شارێکدا نەک تەنیا کەسانی سادە، بەڵکو ئەوانەی بە ڕێکوپێکیش پـەروەردە کراون و ئـازادن پێویستیان بە پزیشک و پارێزەری زۆرتر هەبێت؟ ئایا کارێکی خراپ نییە دادوەری بە زەبر لە ڕێگەی دادوەرەکانەوە بسەپێنرێت، چونکە تۆ ناتوانیت چارەسەری کێشەکە بکەیت؟

بە دیدی من زۆر شەرمە.

ئایا شەرم نییە کەسێک زۆربەی کاتی خۆی لە دادگادا بۆ بەرگریکردن لە خۆی، یان تاوانبارکردنی کەسێکی دیکە بەرێتە سەر. لەبەرئەوەی خاوەنی ئەزموون نییە بە شانازییەوە لە کارە نادادوەرییەکەیدا خۆی بە ژێر دابنێت، هەموو جۆرە فێڵێک بەکار بهێنێت تاکو لە دادگا تاوانبار نەکرێت. ئەمەش لەپێناوی شتێکی بچووکدا و نازانێت باشترە ژیانی خۆی ڕێک بخات و پێویستی بە دادوەرێکی خەواڵو، یان گوێنەگر (لە دادگایا) نەبێت.

ئەمە لە کێشەکەی دیکە شەرماویترە.

ئەی شەرم نییە کەسێک، نەک لەبەرئەوەی بریندار بووە، بەڵکو ئاگای لە خۆی نییەو تەمبەڵە سکی با دەکات و سنگی پڕە لە بەڵغەم. پزیشکەکانی ئەسکلیپیاد بە زۆر ڕادەکێشینە (شارەکەمان) تاکو چارەی بای سکیان و هەڵامەتەکەیان بکات؟

وایە. ئەمانە ناوی نوێن بۆ نەخۆشی.

دڵنیام، لە سەردەمی ئەسکلیپیادس نەبوون30. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو جۆری دەرمانە بوو، کە ژنێک بۆ برینەکەی یوریپلوسی گرتیەوەو پاترۆکلیس داوای کرد لە شەراب و جۆ و پەنیر دروست بکرێت و بخرێتە سەر برینەکەی. کوڕەکانی (ئەسکلیپیۆس) لە ترۆی ڕەخنەیان لێ نەگرت، بەڵام ئەمڕۆ ئەو دەرمانە بەکار نایەت، چونکە دەبێتە هۆی سووربوونەوەی برینەکە.

دەرمانێکی سەیرە لەو حاڵەتەدا بە نەخۆش بدرێت.

سەیر نییە ئەگەر لەبیرت بێت، کە ئەو دەرمانە پێش هیرۆدکێس ئەسکلیپیادس بەکاری نەهێناوە. ئەو (پێش پیشەی پزیشکی) فێرکەری

یاری وەرزش بوو. کاتێک نەخۆش کەوت خۆی فێری پزیشکی کردو لەپێشدا خۆی دەرمانە گیراوەکانی بەکارهێنا و دوایی بە نەخۆشەکانی دەدا. چۆن ئەو کارەی کرد؟ لە ڕێگەی پارێزێکی زۆرەوە. کە بەردەوام بەدوای چێژ و خۆشیدا دەرمانی بەکاردەهێنا. ئەگەر تۆزێک لەو پارێزە لایدایە تەندروستی بەرەو خراپی دەڕۆیشت. لەبەرئەمە بە تەمەنی درێژەوە ژیا.

ئەوە خەڵاتی لێزانییەکەیەتی.

ئەمە بۆ کەسێک دەگونجێت، کە نەزانێت و خاوەن ئەزموون نەبێت، چونکە نازانێت ئەسکلیپیۆس لە فێرکردنی کوڕەکانیا سەرکەوتوو نەبوو. ئەو لەو باوەڕەدا بوو هەر تاکە پیشەی خۆی هەیە. کەس بۆی نالوێت بەدرێژایی تەمەنی نەخۆش بێت و لەژێر چاودێری پزیشکدا بێت. بێ واتایە ئەگەر ئەم جۆرە ژیانە بۆ کارمەندێک بە دروست و بۆ دەوڵەمەندێک و بەختەوەرێک بە نادروست دابنێین.

چۆن؟

کاتێک دارتاشێک نەخۆش دەکەوێت چاوەڕوانە پزیشکەکەی بە دەرمان، یان نەشتەرگەری چارەی بکات. ئەگەر کەسێک پێشنیاری ئەوە بکات، کە دەبێت بە سەرپێچراوی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ڕاکشێت دەڵێت، کە نەخۆشی بۆ ئەو دەست نادات و ناتوانێت واز لە کارەکەی بهێنێت و تەنیا بیر لە نەخۆشیەکەی بکاتەوە. پزیشکەکە جێدەهێڵێت و دەچێتەوە سەر کارەکەی. لێرەدا لە خۆیەوە چاک دەبێتەوە، یان بە نەخۆشیەکەوە دەمرێت.

چاکترە ئەو کەسە، بەمجۆرە دەرمان بەکاربهێنێت.

ئایا لەبەرئەوەی ژیان لەلای بێ نرخە بە کاری خۆی هەڵناسێت؟

ئاشکرایە.

بەڵام دەوڵەمەندێک، گوتمان، کارێک ناکات ژیانی بۆ دژوار بکات.

ئەوە بۆچوونی زۆر کەسە.

تۆ نەتبیستوە فۆسیلیدس دەڵێت، کاتێک ڕێگای ژیانت دۆزییەوە دەبێت چاکە بکەیت31.

لەو باوەڕەدام لەپێش ئەوەشدا دەبێت چاکە بکرێت.

ئێمە لەگەڵ فۆسیلیدس لەسەر ئەم کێشەیە مشتومڕ ناکەین. با

بزانین داخۆ دەوڵەمەندێک پێویستە چاکەکەر بێت. ئەگەر چاکەی نەکرد ژیانی دژوار دەبێت و نەخۆش دەکەوێت؟
بەڵام بایەخدانی زۆر بە لەش لە ژوور وەرزش و مەشقەوە یەکێکە لە ڕێگرە گەورەکان. لە ژیانی سەربازی و فەرماندەییشدا بایەخدان بە نێوماڵ کارێکی ئاسان نییە.
لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە، کە هەموو جۆرێکی فێربوون، بیرکردنەوە، یان تێڕوانینێکی تایبەتی سەخت دەکات. گوایە ئەو کەسە تووشی ژانی سەر و گێژبوون دەکات. فەلسەفەش بە سەرچاوەی ئەم (ژانی سەرو گێژبوونە) دەبینرێت و تاوانبار دەکرێت. لە هەر شوێنێکدا بمانەوێت چاکە بکەین زیادەڕۆیی لە بایەخدان بە لەش دەبێت بە ڕێگری، چونکە ئەو کەسە وا هەست دەکات نەخۆشە و ئاگای لە لەشی بێت.
دەشێ وابێت.
کەوابوو، ئێمە نەمانگوت ئەسکلیپیۆس ئەمەی دەزانی و بۆ ئەوانەی لەش و ڕەفتاریان بە سروشت چاکە و تەندروستە فێرکەرێکی پزیشکی بوو، بەڵام تووشی نەخۆشییەکی ناسراو بوون؟ چارە و دەرمانەکەی بۆ ئەم جۆرە کەسانە بوو. بە دەرمان و نەشتەرگەری چارەی نەخۆشیەکەی دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن ژیانێکی ئاسایی بگوزەرێنن، بەڵام ئەوانەی لەشیان ببوو بە مەتەڵی نەخۆشی بە تێکەڵکردنی چەند جۆرە دەرمانێک، تۆزێک لێرە و تۆزێکیش لەوێ، هەوڵی دەدا درێژە بە ژیانە سەخت و پڕ ئازارەکەیان بدات تاکو بتوانن منداڵی وەکو خۆیان بهێننە جیهانەوە. ئەو بیری لەوە نەکردەوە نابێت چارەی ئەو نەخۆشە بکات، کە ناتوانێت ژیانێکی ئاسایی بژی و سوودیشی بۆ خۆی و شارەکەی هەبێت.
ئەو ئەسکلیپۆسەی تۆ باسی دەکەیت سیاسەتمەداریش بووە.
ئاشکرایە نابینیت، لەبەرئەوەی سیاسەتمەدار بوو کوڕەکانیشی لە شاری ترۆی، وەکو کەسانێکی چاک چارەی نەخۆشی و برینی خەڵکیان دەکرد؟ لەبیرتە چۆن خوێنیان لە برینەکەی مینەلاوس دەرهێنا، پێچایانەوە و پارێزیان بۆ دانەنا؟ ئەگەر پاش تیمارکردنی برینەکە شەراب و شۆربای جۆ و پەنیریشیان بخواردایە گرنگ نەبوو، بەڵام

ژیانی ئەوانەی بە سروشت نەخۆش و بەڕەڵا بوون بۆ شارەکەیان سوودبەخش نابینرێت. دەرمان بۆ ئەم جۆرە کەسانە دروست نەکراوە و نابێت چارەشیان بکرێت. تەنانەت ئەگەر ئەم کەسانە لەمیداسیش دەوڵەمەنتر بووبن.

کوڕەکانی ئەسکلیپیۆس، کە تۆ ناویان دەهێنیت شارەزا و لێهاتوو بوون.

وایە، بەڵام پیندار و نووسەرە تراجیدییەکان لەگەڵ ئێمەدا هاوڕا نین.

بە دیدی ئەوان، ئەسکلیپیۆس کوڕی ئەپۆلۆی (خواوەند) بوو. زێڕیان بە بەرتیل دایە تاکو چارەی نەخۆشیی دەوڵەمەندێک بکات. لەسەر ئەو کارە بە هەورەبروسکە کوژرا. ئێمە باوەڕمان بەمە نییە. ئەگەر ئەسکلیپیۆس کوڕی خوا بووایە، بەرتیلخۆر نەدەبوو. ئەگەر بەرتیلخۆریش بێت، نابێت کوڕی خوا بێت.

ئەوە ڕاستە. بەڵام، سوکرات تۆ سەبارەت بەمە چ دەڵێیت؟ ئایا پێویستیمان بە پزیشکی چاک بۆ شارەکەمان نییە؟ چاکترین پزیشکیش ئەو کەسەیە، کە چارەی زۆر نەخۆشی کردبێت. بەهەمان جۆریش دادوەری چاک ئەوەیە، کە زۆر دادگای بەڕێوە بردبێت.

من لەگەڵتام. دەبێت پزیشک و دادوەر چاک بن، بەڵام تۆ دەزانیت، کێ لای من چاکە؟

ئەگەر تۆ پێم بڵێیت.

من هەوڵ دەدەم پێت بڵێم، بەڵام لە پرسیارەکەتا ئەو شتانە ڕیز دەکەیت، کە لە یەکدی ناچن.

لە چ ڕوویەکەوە؟ چاکترین پزیشک ئەوەیە، کە بێجگە لەوەی لە بوارەکەی خۆیدا شارەزاو لێزانە لە منداڵییەوە ژمارەیەکی زۆر نەخۆشی بینیوە و ئیشی لەسەریان کردووە. بەو ئەزموونانەدا تێپەڕیوە و چارەی بۆ داناون. چارەکردنەکەش تەنیا لە ڕێگەی ئەوە ڕاستە.

سەبارەت بە دادوەرەکەش حوکم بەسەر دەروونی ئەوانی دیکەدا دەدات.

ئایا کەسێک لە منداڵییەوە لەنێو دەروونە خراپکارەکاندا بژی لە تاوانەکاندا بەشداری بکات، دەتوانێت حوکمیان بەسەردا بدات، وەکو

(پزیشکەکە) چارەی نەخۆشییەکان بکات؟ دادوەری چاک لە تاوان و خراپە بەدەرە. دەروونێکی پاکی هەیە و لە تەمەنی لاویێتیشدا بە ئەزموونی خراپدا ناڕوات. لەبەرئەمەشە کەسانی چاک سادەن و بەئاسانی کەسانی خراپ فێڵیان لێ دەکەن. ئەوان ئەزموونی خراپیان نییە تاکو ببێت بە ڕێگەناسیان و لەوێوە حوکم بدەن.

بەڵێ، وایە.

کەوابوو، دادوەری چاک دەبێت بە تەمەن لاو نەبێت. لە ئەزموونی ژیان فێر بووە. نادادوەری چیە؟ نەک لەبەرئەوەی خۆی بەو کارە هەستاوە و دەروونی پڕە لە خراپە. خراپەی لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە ناسیوە و زانیاری لەبارەوە پەیدا کردووە.

ئەو دادوەرە چاکتر نییە.

ئەو چاکە، چونکە دەروونێکی چاکی هەیە. کەسێکی تاوانکەر و نادادوەر، ئەوەی خۆی بە نەیاری زانا دادەنێت، لەنێو دەستەو تاقمی کەسانی وەکو خۆیدا ژیر دەردەکەوێت، بەڵام کە دەکەوێتە نێو کەسانی چاک و بەتەمەن گەمژە و نەزان دیارە، چونکە لەو شێوازی ژیانە نازانێت، لەبەرئەوەی زۆربەی کاتیش لەنێو دەستەو تاقمی هاوڕەنگی خۆیەتی بە ژیر دادەنرێت.

ئەوەش بەتەواوی ڕاستە.

گەڕان بەدوای دادوەرێکی چاکدا پێویستە. کەسێکی خراپ و دڕندە نە خۆی و نە کەسێکی چاک دەناسێت. کەسێکی چاکیش باشتر لە ڕێگەی فێرکردنەوە زانیاری سەبارەت بە چاکە و خراپە پەیدا دەکات. بە دیدی من، ئەو کەسە چاکە نەک کەسە خراپەکە دەبێت بە زانا (فەیلەسووف).

من لەگەڵ بۆچوونەکەتدام.

کەوابوو، تۆ لەگەڵ ئەوەدا نیت ئەم جۆرە دەرمان و دادوەرییە لە شارەکەماندا ڕێگەی یاساییان پێ بدرێت سەرپەرشتی دەروون و لەشی ئەو هاوڵاتیانە بکەن بە سروشت لەم دوو ڕووەوە چاکن؟ ئەوانەی، کە بە سروشتیش نەخۆش و خراپن وازیان لێ ناهێنیت بمرن، یان ئەوانەی تاوانبارن بە سزای مردن بگەن؟ ئەمە لە ڕێگەچارەیەکی چاک دەچێت بۆ ئەو کەسانە و شارەکەشمان. هەروەها، ئەو لاوانەی

پەیڕەوی ژیانێکی سادە دەکەن مۆسیقا و هۆنراوە دەخوێنن و زیادەڕۆ نین و بەئاگان لەوەی پێویستیان بە دادوەرە، یان نا.

ئەوە ڕاستە.

ئەی ئەو کەسەی مۆسیقا و هۆنراوە دەخوێنێت بەهەمان شێوەش وەرزش دەکات؟ یان تەنیا لە کاتی پێویستیدا دەرمان بەکاردەهێنێت؟

لەو باوەڕەدام.

مەبەستی ئەو کەسەش لە وەرزش وەدەستهێنانی هێز نییە، بەڵکو بەرزکردنەوەی ورەی دەروونییە.

ئەوە بەتەواوی ڕاستە.

کەوابوو، گلاوکۆن، پێم بڵێ مەبەستی ئەو کەسانەی بەم فێربوونەدا تێدەپەڕن، مۆسیقا و هۆنراوە دەخوێنن و وەرزش دەکەن چیە؟ ئایا نایانەوێت لە ڕێگەی دەروونەوە ئاگایان لە لەشیان و لەشیش ئاگای لە دەروونیان بێت؟ ئایا هیچ مەبەستێکی دیکەیان هەیە؟

چ مەبەستێکی دیکە؟

لەوە دەچێت هەردووکیان لە خزمەتی دەروون‌دا بن؟

چۆن؟

ئایا کاریگەرێتی ژیانێکی درێژخایەن لە ڕێگەی وەرزشەوە بەبێ فێربوونی مۆسیقا و هۆنراوە یان فێربوونی مۆسیقا و هۆنراوەش بەبێ وەرزش بەسەر دەروونەوە دەبینیت؟ چ جۆرە کاریگەرێتیەک؟

دڕندەیی و ڕەقی لە یەکێکیاندا، نەرمی و زێدە دەستکەوتن لەوی دیکەدا.

لەو خاڵە تێدەگەم. بە دیدی تۆ ئەوانەی وەرزشی زۆر دەکەن دڕندە دەردەچن. ئەوانەی مۆسیقا و هۆنراوەش دەخوێنن کەسانێکی نەرمترن لەپێویست.

لەسەروو ئەمەشەوە، دەروون سەرچاوەی دڕندەییە. ئەگەر ئەو دەروونە سەرپەرشتی بکرێت ئازا دەردەچێت و زۆریش ببەسترێتەوە ڕەق و توووند دەبێت.

وادیارە.

ئایا لایەنی فەلسەفی لە سروشتی مرۆڤدا نییە، کە دەبێتە سەرچاوەی فێرکردن و بەخێوکردن؟ ئەگەر بەتەواوی بەڕەڵای بکەین و وازی

لێبهێنین لە ڕادەی خۆی نەرمتر دەردەچێت. ئەگەر بە ڕێکوپێکی سەرپەرشتی بکرێت ئاکامێکی چاکتریشی دەبێت .

ئەوە وایە.

ئێمە لەو باوەڕەداین پاسەوانەکانمان ئەو دوو سروشتەیان هەبێت.

پێویستە.

پێویستە، هەردووکیان هاوتەراز بکرێن؟

بێگومان.

ئایا هاوتەرازبوونەکە دەروون مامناوەند و ئازا دەکات؟

بەدڵنیاییەوە.

ئەگەر هاوتەراز نەکران (کەسەکە) دڕندە و ترسنۆک دەکات؟

بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.

ئەوەی گوێ لە مۆسیقا دەگرێت دەنگی شیرین و خۆشی شمشاڵێک بە لوولەی گوێیدا دەچۆڕێتە نێو دەروونیەوە هەموو ژیانی دەبێت بە گۆرانی گوتن و خۆشحاڵی، وەکو ئەو ئاسنە ڕەقەی بە چەکوشکوتان نەرم دەبێت، ئەویش نەرم دەبێت و سوودی لێ وەردەگرێت، بەڵام بەردەوامی بەم جۆرە ژیانە کەسەکە نەرمتر دەکات و دەروونی دەتوێنێتەوە و دەمارەکانی دەبڕێت. ئەو کەسە دەکات بە (پاسەوانێکی زەبوون).

ئەوە ڕاستە.

ئەگەر لە سەرەتاشەوە یان بە سروشت دەروونی فەوتاو بێت، ئەوا لە یەکەم ڕۆژەوە لاواز و زەبوون دەردەچێت. ئەگەر ورەبەرزیش بووبێت، لەدواییدا بەرەو لاوازی بڕوات زوو هەڵدەچێت و بەئاسانیش دادەمرکێتەوە. لە ئاکامدا ئەم جۆرە کەسانە خێرا فێری توڕەبوون و ناڕەزایی دەربڕین دەبن و ورەیان بە بەرزی نامێنێتەوە.

بەدڵنیاییەوە ڕاستە.

ئەو کەسە چۆنە، کە سەخت کار و وەرزش دەکات، بەڵام لە مۆسیقا و فەلسەفە نازانێت؟ ئایا خاوەنی لەشێکی چاک نییە؟ ئایا ئازا نییە؟

بەدڵنیاییەوە.

چۆنە ئەو کەسە هیچی دیکە نەکات، یان بیرنەکاتەوە؟ ئایا حەز

و خۆشەویستیەکەی بۆ فێربوون لە دەروونیدا لاواز و کەڕ و کوێر نابێت، چونکە چێژی فێربوون ناکات و شوێن لێکۆڵینەوە ناکەوێت، بەشداری لە هیچ گفتوگۆیەک لەسەر مۆسیقا و هۆنراوە ناکات؟

وا دەردەکەوێت.

لەو باوەڕەدام ئەو جۆرە کەسە ڕقی لە هۆش و مۆسیقایە.

ئەو لە ڕێگەی گفتوگۆوە بە ئاکامەکانی ناگات، بەڵکو لە ڕێگەی زەبرەوە، وەکو ئاژەڵێکی دڕندە و لەنێو گەمژەیی و نەزانیندا بەبێ هۆنینەوە و بەخشندەیی دەژی.

ئەوە جۆری ژیانی ئەو کەسانەیە.

کەوابوو، وا دیارە، خوداوەند، مۆسیقا و وەرزشی بۆ لەش و دەروونی مرۆڤەکان لەبەرئەوە بەخشیوە ئەو لایەنانەی سەرچاوەی ورەی بەرز و فەلسەفەن لە دەروونـدا هاوتەراز پێکەوە بژین و هەریەکەیان گەشەی پێ بدرێت.

وا دیارە.

ئەوەی لەم هاوتەرازکردنەی نێوان مۆسیقا و وەرزشدا سەرکەوتوو دەبێت و کاریگەرێتیەکەی بەسەر دەروونیەوە هەڵدەکۆڵێت ئەو کەسەیە ئێمە لە کەسێکی دیکە، کە دەیەوێت تەلەکانی ئامێرێکی مۆسیقاکەی هاودەنگ بکات، بە فێرکراوێکی تەواوتری دادەنێین.

بەدڵنیاییەوە، سوکرات، ئەوە ڕاستە.

ئایا، گلاوکۆن، ئێمە پێویستیمان بەو جۆرە کەسە لە شارەکەماندا نییە؟

بەڵێ، لە هەموو کەسێکی دیکە زۆرتر بۆ شارەکەمان پێویستە.

کەوابوو، ئەمە شێوەکانی پەروەردە و بەخێوکردنە. پێویست دەکات ژمارەی سەماکردن، ڕاوکردن و ڕاکردن بەدوای تانجیدا و ئەسپسوارەکان بدۆزینەوە؟ ئەمە کارێکی سەخت نییە، چونکە دەزانین چ شێوەیەکی پەروەردەیان بۆ دامەزرێنین.

هەڵبەتە وایە.

باشە، دوای ئەمە پێویستە چ بکەین؟ ئایا پێویست ناکات بزانین چ جۆرە کەسێک لەوانە دەبێت بە فەرمانڕەوا و فەرمانڕەواییکراو؟

بەدڵنیاییەوە.

ئاشکرا نییە، کە دەبێت فەرمانڕەواکان لە فەرمانڕەواییکراوەکان پیرتر بن؟

بەڵێ، وایە.

ئایا نابێت فەرمانڕەواکان چاکترین کەس بن؟

بەڵێ.

ئایا چاکترین جووتیار ئەو کەسە نییە، کە لە کاری جووتیارییدا چاکترینە؟

بەڵی.

ئەگەر فەرمانڕەواکان پاسەوان بن، ئایا نابێت ئەو جۆرە پاسەوانانە بن، کە لە هەموو پاسەوانێک باشتر شارەکە دەپارێزن؟

بەڵێ.

ئایا نابێت خاوەنی زانین و توانا بن و بایەخ بە شارەکە بدەن؟

ڕاستە.

هەموو کەسێک بایەخ زۆرتر بەو شتە دەدات، کە خۆشی دەوێت.

وایە.

هەروەها، ئەوەی شتێکی زۆر خۆش دەوێت لەو باوەڕەدایە هەر کەسێک سوود بەو شتە بگەیەنێت بە ئەویشی دەگەیەنێت. لەبەرئەوە باشی و خراپی ئەو شتە باشی و خراپی خۆیەتی.

ڕاستە.

کەوابوو، پێویستە، لەنێو پاسەوانەکانمان ئەو کەسانە هەڵبژێرین، کە بەدرێژایی تەمەنیان سوورن لەسەر خزمەتکردنی شارەکە و نایانەوێت زیانی پێ بگەیەنن.

ئەم جۆرە کەسانە شایەنی ئەو کارەن.

بە دیدی من، دەبێت بیانخەینە ژێر چاودێرییەوە تاکو بزانین بەتەواوی گەیشتوونە ئەو باوەڕەی خزمەتی شارەکە بکەن و هیچ جادوویەکیش نایانخاتە سەر ئەو ڕێگەیەی واز لەم کارە بهێنن.

مەبەستت لە وازهێنان چیە؟

من بۆتی ڕوون دەکەمەوە. وازهێنان لە بیر و باوەڕێک بە زەبر، یان بە هەڵبژاردنی کەسەکە خۆیەتی. کاتێک ئەو کەسە دەگاتە ئەو ئاکامەی بیرو باوەڕەکەی ناڕاست بێت بە هەڵبژاردنە. لەژێر زەبریشدا

واز لەو بیروباوەڕە ڕاستەی دەهێنێت.
من لە واتای وازهێنان بە هەڵبژاردنی کەسەکە تێدەگەم، بەڵام لەوی دیکە تێناگەم. ئەوە چۆنە؟
تۆ نازانیت، کە زۆر کەس بە حەز و ئارەزووی خۆی واز لە زۆر شتی خراپ دەهێنێت و بە زۆریش لە شتی چاک بێبەری دەکرێن؟ ئایا هەڵخەڵەتاندن سەبارەت بە ڕاستی خراپ و ڕاستی ناسینیش چاک نییە؟ لەو باوەڕەدا نیت بڕواکردن بە بوونی شتەکان ڕاستی بێت؟
ئەوە ڕاستە. من لەو باوەڕەدام، کە زۆر کەس بە زەبر لە بیروباوەڕی ڕاست بێبەری کراون.
ئایا دز، جادووگەر، یان زەبرکردن بێبەرییان ناکات؟
ئێستا، جارێکی دیکە لە مەبەستەکەت تێناگەم.
لەوە دەترسم، کە دەبێت، وەکو شاعیرێکی تراجیدی لەگەڵتا بدوێم. مەبەستم لەو کەسانەی دزییان لێ کراوە ئەوانەن زۆریان لێ کراوە بۆچوونەکانیان بگۆڕن یان لەبیریان چۆتەوە، چونکە کاتێکی زۆری بەسەردا ڕۆیشتوە. لە حاڵەتی یەکەمدا، مشتومڕ و لە دووەمدا کات دەبێتە هۆی بێبەریکردنەکە. ئێستا تێدەگەیت؟
بەڵێ.
مەبەستم لە ''زەبرکردن'' ئەوەیە، کە ئازار و ناخۆشی ببێتە هۆی گۆڕان لە بیروباوەڕدا.
من تێدەگەم. تۆ ڕاست دەڵێیت.
ئەوانەی بوون بە "قوربانی جادووکردن" کەسانێکن لەژێر جادووی چێژ، یان ترسدا بیروڕاکانیان گۆڕاوە.
وا دەردەکەوێت هەموو گۆڕانێک هۆکەی جادووگەریی بێت.
کەوابوو، وەکو ئێستا گوتم، پێویستە بزانین چ جۆرە پاسەوانێک لەو باوەڕەدایە خزمەتی شارەکەمان دەکات. دەبێت ئەو جۆرە پاسەوانانە لە منداڵییەوە بخەینە ژێر چاودێرییەوە و فێریان بکەین تاکو فێڵیان لێ نەکرێت. ئەو کەسانە هەڵبژێرین، کە خزمەتکردنی شارەکەیان لەبیر ناچێتەوە و هەڵناخەڵەتێن. ئایا لەگەڵمدا هاوڕایت؟
بەڵێ.
بۆ دۆزینەوەی ئەو جۆرە خیانەتە (لە شارەکەمان)دا پێویستە

پاسەوانەکان بخەینە نێو پێشبڕکە و لەسەر کاری سەخت و ئازار ڕایان بهێنین. کەوابوو دەبێت، پێشبڕکەی سێیەمیش بۆ ئەوانەی لە جادوو بێبەری کراون ڕێک بخەین. وەکو ئەوانەی جاشەکەر دەشڵەژێنن و دەیانخەنە زەڕین تاکو بزانن دەترسن یان نا، ئێمەش لاوانمان دەخەینە بەر ئەزموونی ترس و خۆشیەوە، وەکو زێڕ لەسەر ئاگر تاقیان دەکەینەوە. ئەگەر کەسێک نەخرایە ژێر کاریگەریێتی جادوەوە، ئەوا بۆ شارەکەمان پاسەوانێکی چاکە. مۆسیقا و هۆنراوەشی خوێندوە و لەنێو دەروونیدا (لایەنەکان) هاوتەرازن. ئەوەی لە تەمەنی منداڵی، لاوێتی و پیریدا بەم تاقیکردنەوەیەدا تێپەڕی و سەرکەوتوو بوو دەکرێت بە پاسەوان و فەرمانڕەوا. لە ژیاندا ڕێزی لێ دەنرێت و کە مردیش گۆڕێکی جوانی بۆ هەڵدەبەستین و یادی دەکەینەوە. ئەوەی سەرنەکەوت ڕەت دەدرێتەوە. بە دیدی من، گلاوکۆن، فەرمانڕەواکان و پاسەوانەکان، هەرچەندە بەگشتی باسی شێوەی هەڵبژاردنەکەمان کردووە و بەوردی ڕوونمان نەکردۆتەوە دەبێت بەمجۆرە هەڵبژێرێن و دامەزرێن، بەڕای منیش، دەبێت بەمجۆرە هەڵیانبژێرین.

ڕاستر نییە، ئەم کەسانە بە پاسەوانی تەواو ناوزەد بکەین، چونکە دژی دوژمنی دەرەوە و هاوڕێی ناوەوە دەمانپارێزن؟ دوژمنەکان بێ هێز دەکەن و ئارەزووی هاوڕێکانیشمان لە زیان بە شارەکە کەم دەکەنەوە؟ ئەو لاوانەی بە پاسەوان دامانان ناویان دەنێین (یارمەتیدەران)ی فەرمانڕەواکان.

من لەگەڵتا ڕێدەکەوم.

چۆن یەکێک لەو درۆ سوودبەخشانەی باسمان کردن دووربخەینەوە، ئەو درۆیەی فەرمانڕەواکانیش ڕازی دەکات؟

چ جۆرە درۆکردنێک؟

شتێکی نوێ نییە، وەکو چیرۆکەکەی فۆینیسیەن، کە لە زۆر شوێندا دەگێڕێتەوە و زۆر کەس باوەڕی پێ دەکات. لێرە لەنێو ئێمە ڕووی نەداوە، نازانم ڕوودەدات، یان نا. دڵنیام هەوڵدانی زۆری دەوێت، کە زۆر لە هاوڵاتیان بکەیت باوەڕی پێ بکەن.

تۆ بەترسەوە چیرۆکەکەم پێ دەڵێیت.

ئەگەر بۆت بگێڕمەوە دەزانیت بۆچی بەترسەوە باسی دەکەم.

من بۆت دەگێڕمەوە، بەڵام نازانم چ زمانێک بەکار بهێنم. من لە سەرەتاوە فەرمانڕەوا و پاسەوانەکان ڕازی دەکەم، ئەنجا هاوڵاتیانی نێو شارەکە، کە ئەو فێرکردن و پەروەردەیەی پیایدا تێپەڕیوون جۆرێک بوون لە خەوبینین. ئەوان بە چەک و تفاق و کەلوپەلەکانیانە، وە لەژێر زەوییدا پەیدابوون، کاتێک تەواو دروست بوون، زەوی (دایکی ئەوان) فڕێیدانە نێو جیهان. لەبەرئەمە، هەر کەسێک بیەوێت پەلاماری زەوی بدات پێویستە دژی ڕاوەستن و پاریزگاری لەو دایکەیان بکەن. هاوڵاتیانیش بە برای سەر زەوی خۆیان دابنێن.

بۆیە بە ترس و شەرمەوە درۆکەم بۆ دەگێڕیتەوە؟

بەڵێ، بەڵام گوێ لە بەشی دووەمی چیرۆکەکە بگرە "ئێوە لە شارەکەدا برای یەکن" بەمجۆرە لەگەڵتان دەدوێین، چیرۆکەکەیان بۆ دەگێڕینەوە، "بەڵام ئەو کاتەی خوا ئافەریدی کردن، زێری کردە نێو هەندێکتانەوە تاکو فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە ئەوان لە هەموو کەسێک بەنرختر بوون. زیوی کردە نێو ئەوانەی دەبن بە یارمەتیدەر، ئاسن و برۆنزیش بۆ نێو لەشی جووتیار و خاوەن پیشەکانی دیکە. منداڵیش دروست دەکەن، کە لە خۆتان دەچێت، بەڵام لەبەرئەوەی هەمووتان خزمن، هەندێکجار منداڵێکی زیو لە دایک و باوکێکی زێڕین دەبێت یان بەپێچەوانەوە، هەروەها ئەوانی دیکەش بەمجۆرە تێکەڵ دەبن. خوداوەندیش بە فەرمانڕەواکان دەڵێت، کە ئەو کەسانەی لە کانەکان تێکەڵ کراون باشتر فەرمانڕەوایی دەکەن. ئەگەر نەوەیەکی خۆیان بینی لە ئاسن و برۆنز دروست کرابێت نابێت لەگەڵیا بە بەزەیی بن. پێویستە بەگوێرەی خۆی لەگەڵ جووتیار و پیشەمەندەکاندا کار بکەن. ئەگەر نەوەکەیان تێکەڵکراوی زێڕ و زیو بێت بە ڕێزەوە لەنێو پاسەوان و یارمەتیدەرەکاندا داینێن. پێشبینی کراوە، کە ئەو شارەی پاسەوانەکانی ئاسن و برۆنز بن زوو تێک دەشکێت".

چ دەکەیت تاکو هاوڵاتی شارەکەمان باوەڕ بە ڕاستی ئەم چیرۆکە بکەن؟

من هیچ ڕێگەیەک شک نابەم، بەڵام بۆ منداڵان و نەوەی پاش ئەوان دەشێت باوەڕپێکراو بێت.

دەزانم مەبەستت چیە، ئەمەش هانیان دەدات زۆرتر بایەخ بە یەکدی

و شارەکە بدەن. با واز لەم کێشەیە بهێنین بیر لەوە بکەینەوە چۆن نەوەکانی سەر ئەم زەویەمان چەکدار بکەین و لەگەڵ فەرمانڕەواکاندا شارەکە بەڕێوەبەرن. با بەدوای باشترین شوێن بۆ لەشکرگاکەیان لە شارەکەدا بگەڕێین. شوێنێک بێت بەئاسانی لێوەی دەستیان بە کەسانی سەرپێچیکەر بگات، وەکو چۆن گورگ پەلاماری مێگەل دەدات، ئەوانیش هێرش بکەنە سەر دوژمن و بیشکێنن. پاش ئەوەی لەشکرگاکەمان بۆ دامەزراندن شوێنی پشوودانیان بۆ ئامادە دەکەین. تۆ چ دەڵێیت؟

لەگەڵ تۆدام.

ئایا ئەو لەشکرگا و شوێنی پشوودانە لە سەرمای زستان و گەرمای هاویندا نایانپارێزێت؟

هەڵبەتە، دیارە تۆ مەبەستت خانووە بۆ ئەوان.

بەڵێ، بەڵام خانوو بۆ سەرباز نەک بۆ بازرگان.

تۆ چۆن ئەم دوو جۆرە خانووە لە یەکدی جیا دەکەیتەوە؟

هەوڵ دەدەم جیاوازییەکەیان ڕوون بکەمەوە. شەرمترین کاری شوان لەوەدایە سەگ بۆ یارمەتی و پاسەوانی مەڕەکانی ڕابگرێت. سەگەکان لەبەر برسێتی و بەڕەڵایی، وەکو گورگ مەڕەکانی بخۆن.

ئەوە زۆر ناخۆشە.

ئایا پێویست ناکات بە هەموو توانامانەوە ڕێ لەم کارە بگرین. نەیەڵین یارمەتیدەرەکان زیان بە هاوڵاتی بگەیەنن، لەبری ئەوەی ببن بە خاوەنێکی بەبەزەیی دڕندە دەرچن؟

ئەوە پێویستە بکرێت.

ئایا پەروەردەی چاک فێریان ناکات لەم ڕووەوە کەسێکی زۆر چاک دەرچن؟

ئەو پەروەردەیە، بەدڵنیاییەوە، دەیانکات بە کەسێکی چاک.

با ئەمەش نەکەین بە باوەڕێکی چەسپاو ئەی گلاوکۆن. ئەوەی دەمانەوێت پەروەردەکردنێکی دروستە بۆ ئەوان. ئەو پەروەردەیەی لە ئاستی کەسانی دیکەدا دەیانکات بە کەسێکی چاک و هانیان دەدات خەڵکی بپارێزن.

ئەوە ڕاستە.

دەگونجێت هەندێک بەمجۆرە بۆ کێشەکە بچن، کە لەگەڵ ئەم جۆرە پەروەردە و فێربوونەدا پاسەوانەکان خانوو، یان موڵکیان هەبێت. ڕێگەیان لێ نەگرین ببن بە پاسەوانێکی زۆر چاک و ئازا، خراپە بەرانبەر هاوڵاتی نەکەن.

بیرکەرەوە، ئەوان دەبێت بەم شێوەیە بژین. ئەگەر ئەو کەسانە بن ئێمە دەمانەوێن. یەکەم، کەسیان نابێت لە پێویست بەولاوە خاوەنی موڵک بێت. دووەم، کەسیان نابێت خاوەنی خانوو، یان زەخیرەیەک بێت، کە کەسانی دیکە نەتوانن بەکاری بهێنن. سێیەم، پێویستیەکانیان دەبێت بەجۆرێک جێبەجێ بکرێن کەم و زیادیان نەبێت. ئەوەش بە مووچە لە ڕێگەی باجدان لەلایەن هاوڵاتیانەوە بۆیان مسۆگەر دەکرێت. چوارەم، هەموو پێکەوە لە لەشکرگا دەژین و لەسەر خوانێک خواردن دەخۆن. فێریان دەکەین پێویستیان بەو جۆرە زێڕە نییە، کە کەسانی دیکە هەوڵی بۆ دەدەن، چونکە ئەوان خوداوەند دەروونیانی پڕ زێر کردووە. فێریان دەکەین، کە ئەوە کارێکی بێ بڕواییە ئەگەر ئەو زێڕە پیرۆزەی دەروونت نەپارێزیت و لەگەڵ ئەوانی دیکە شوێن زێڕ بکەویت. لەبەرئەوە لەنێو شارەکەماندا ڕێگە نادرێت ئەوان زێڕ و زیو کۆبکەنەوە. نابێت لەگەڵ ئەوانەی زێڕ بە خۆیانەوە دەکەن و لە پەرداخی زێڕ و زیودا دەخۆنەوە لەژێر یەک بنمیچدا بژین. لێرەوە خۆیان و شارەکە دەپارێزن. ئەگەر شوێن موڵک و ماڵ و پارە بکەون دەبن بە بەڕێوەبەری موڵک و ماڵ و جووتیار نەک پاسەوان. دەبن بە دژمنی هاوڵاتیان نەک دۆست. بەدرێژایی تەمەنیان ڕقیان لە خەڵکی و خەڵکیش ڕقیان لەوان دەبێت. نەخشە و پلان دژی یەکدی دادەنێن. ئەوەندەی لە هاوڵاتیەکان دەترسن لە دوژمنەکانیان ناترسن. شار بەرەو وێرانە دەبەن. لەبەر ئەم هۆیانە دەبێت پاسەوانەکان خانوویان، وەکو شتەکانی دیکە بۆ ئامادە بکرێت. ئەمەش یاسا بەرقەراری دەکات. ئایا تۆ بەمە ڕازی نیت؟

گلاوکۆن گوتی: بەدڵنیاییەوە ڕازیم

ئەدیمەنتۆس گفتوگۆکەی بڕی و گوتی: سوکرات، چۆن بەرگری لە خۆت دەکەیت، ئەگەر کەسێک بڵێت تۆ پاسەوانەکان زۆر بەختەوەر ناکەیت خەتاکەش لە خۆیاندایە؟ شار بە دەستی ئەوانەو خۆشیشی لێ نابینن. زەوی، تەلار و کەلوپەلی نێومالْ، قوربانیدان بۆ خواکان، میوانداری و ئەنجا زێڕ و زیو، هەموو ئەم شتانە بە دەست کەسانی دیکەوەیە. لەوانەیە خەڵکی بڵێن، پاسەوانەکانی تۆ لە شارەکەدا، وەکو بەکرێگیراو دەژین و چاودێری شار دەکەن.

من گوتم، بەڵێ وایە، لەوەزیاتر چیت دەوێت. ئەوان بۆ پارەی زۆر کار ناکەن و سادە دەژین. ناتوانن گەشتی دەرەوەی شار بکەن و دیاری بە دڵدارەکانیان بدەن. پارەیان ئەوەندە نییە تاکو بە ئارەزووی خۆیان، وەکو خەڵکی سەفەر بکەن.

باشە، با ئەم ڕەخنەیەش بگرین. تۆ دەپرسیت، چۆن بەرگری لە خۆمان بکەین؟

بەڵێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر باسەکەی پێشوومان ڕێگەی بەرگریکردنیش دەدۆزینەوە.

ئەگەر دەستەو تاقمێکی کۆمەڵ لەوانی دیکە بەختەوەرتر بن جێگەی سەرسامبوون نییە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت هەموو کەسێک لە شارەکەماندا بەختەوەرانە بژی. ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕەی دادپەروەری لەم جۆرە شارانەدا بەئاسانی سەقامگیر دەبێت. ئەو شارەی بە خراپی بچێت بەڕێوە نادادوەری مەحکومی دەکات. لەگەڵ سەرنجدان و بەراوردکردنی ئەم دوو جۆرە شارانەدا وەڵامی پرسیارەکەمان دەست دەکەوێت. ئێمە دەمانەوێت شارێکی پڕ لە بەختەوەری بۆ هەمووان دامەزرێنین. بە تەنیا دەستە و تاقمێک لە دانیشتووانی بەختەوەر نەبن.

(هەروەها باسی شاری خراپیش، بەمزووانە دەکەین)32.
گریمان ئێمە پەیکەرێک دروست دەکەین و دەمانەوێت ڕەنگی بکەین. کەسێک ڕەخنەمان لێ دەگرێت، چونکە چاوەکانی، کە لە هەموو بەشێکی پەیکەرەکە جوانترن، ڕەش کراون. ئێمەش بە بۆچوونی خۆمان ئەم وەڵامە بە گونجاو دادەنێین: ''نامانەوێت چاوەکانی ئەوەندە بە جوانی ڕەنگ بکەین، کە لە چاو نەچن. ئەمەش بۆ هەموو بەشەکانی دیکەی پەیکەرەکە دەبێت. پەیکەرەکە لەوێدا جوانە، کە لەگەڵ بەشەکانیدا بەگوێرەی خۆیان ڕەنگیان بکەیت''. بەهەمان شێوە، نابێت جۆرە بەختەوەرییەک بەسەر پاسەوانەکاندا بسەپێنیت شێوازیان بشێوێنێت. ئێمە دەزانین چۆن جووتیار بە جلوبەرگی مۆر و ملوانکەی گوڵدار و زێڕ بڕازێنینەوە، بیخەینە سەر زەوییەکەی و بە ئارەزووی خۆی کاری لەسەر بکات. دەزانین چۆن گۆزەسازکەرەکان لە نزیک
کوورەوە دانێین و لەگەڵ گۆزەکردنەکەشیاندا بخۆنەوە. بەمجۆرە دەتوانین، هەموو کەسانی دیکە بەختەوەر بکەین. بەم کارەمان جووتیارەکە و گۆزەسازکەرەکە نابن بە شتێکی دیکە و شێوازیان ناشێوێنرێت. ئەگەر پینەچیەکیش لە کارەکەیدا وریا و ژیر نەبێت و خۆشی بە پینەچیەکی چاک دابنێت هێندە زیان بە شارەکەمان ناگەیەنێت. ئەوەی باسی دەکەین ئەوەندە بەسەر ئەم جۆرە کەسانەدا ساخ نابێتەوە، بەڵام ئەگەر پاسەوانی شارەکەمان بەڕاستی پاسەوان نەبن و خۆیان بە پاسەوان دانا، ئەوا شارەکەمان بەرەو ڕووخان دەبەن. ئەوان دەتوانن شارەکە بەڕێوە بەرن و دانیشتووانی بەختەوەرکەن.
کێ دەتوانێت لە شارەکەدا خراپە بکات ئەگەر پاسەوانی ڕاستەقینەمان هەبێت؟ پێویستە لەبیرمان نەچێت ئێمە دەمانەوێت پاسەوانەکان، یان هەموو دانیشتووانی نێو شارەکەمان بەختەوەرکەین. بۆ ئەمە پاسەوان و یارمەتیدەرەکان دەبێت پەیڕەوی بەرنامەکەمان بکەن و لە بواری خۆیاندا شارەزا و لێهاتوو بن. ئەمە بۆ دەستە و تاقمەکانی دیکەشە. لەم ڕێگەیەوە هەموو هاوڵاتیان بەختەوەر دەبن و شارەکە بە چاکی فەرمانڕەوایی تێدا دەکرێت. ئەو گوتی: تۆ چاکت ڕوون کردەوە.
ئایا تۆ ئەم ڕوونکردنەوەیەی دیکەش، کە ئێستا دەستی پێدەکەم، بە چاک دەزانیت؟

چ ڕوونکردنەوەیەک؟
تۆ بیر لەم شتانە بکەوە، کە کارمەندەکان تووشی گەندەڵی دەکەن و خراپیان دەکەن.
وەکو چی؟
سامان و هەژاری.
چۆن کارمەندان تووشی گەندەڵی دەکەن؟
تۆ لەو باوەڕەدایت، کە گۆزەسازکەرێک دەوڵەمەند بوو لەسەر کارەکەی خۆی بمێنێتەوە؟
نا.
ئایا لە جاران تەمەڵتر و بێ خەمتر نابێت؟
بەڵێ، لە جاران زیاتر.
ئایا نابێت بە گۆزەسازکەرێکی خراپ؟
خراپتریش.
ئایا هەژاریش ڕێگەی ناگرێت ئامێری چاک بۆ گۆزەسازی بەکاربهێنێت، لەو حاڵەتەدا ناتوانێت کارەکەی بە باشی بکات و منداڵەکانیشی یان ئەوانەی لەژێر دەستیدا کاردەکەن خراپ فێری پیشەکە ببن؟
هەڵبەتە.
بەمجۆرە سامان و هەژاری کاری خراپ دەکەنە سەر بەرهەمی کارمەندەکە.
وادیارە.
لەوە دەچێت، شتی دیکەشمان دۆزیوەتەوە تاکو پاسەوانەکانمان ئاگاداری بن و ڕێگە نەدەن لەنێو شارەکەمان بڵاو ببنەوە.
وەکو چی؟
سامان و هەژاری. یەکەمیان دەبێتە هۆی ڕابواردن و تەمەڵی و شۆڕش؛ دووەمیش کۆیلایەتی و بەرهەمی خراپ و دیسانەوە شۆڕش.
ئەوە ڕاستە، بەڵام سوکرات ئەگەر شارەکەمان بێ پارە بوو، چۆن بتوانێت بچێتە جەنگەوە، بەتایبەتی دژی شارێکی دەوڵەمەند؟ ئاشکرایە ئاسان نییە دژی یەک شار بچینە جەنگەوە، بەڵام لەگەڵ دوو شاردا

ئاسانە.
مەبەستت چیە؟
یەکەم، ئەگەر شارەکەمان دژی شارێکی دەڵەمەند بچێتە جەنگەوە، ئایا پاسەوانەکانمان دژی دەوڵەمەندەکان ڕاناوەستن؟
بەڵێ.
باشە، ئەدیمەنتۆس، تۆ لەو باوەڕەدا نیت، کە یاریزانێکی چاکی شەڕەمشت، بتوانێت لەگەڵ دوو یارینەزانی دەوڵەمەند و قەڵەودا شەر بکات؟
لەوانەیە لەیەک کاتدا نەتوانێت.
ئایا ناتوانێت لەژێر دەستیان ڕاکات و یەکە یەکە بە هەناسەبڕکێ لەبەر گەرمای خۆریشدا لێیان بدات؟ ئایا بەمجۆرە ناتوانێت شەڕ لەگەڵ دوو کەس زیاتریش بکات؟
جێگەی سەرسوڕمان نییە.
ئایا لەو باوەڕەدا نیت دەوڵەمەندەکە زانیاری و ئەزموونی زۆرتری لەبارەی شەڕەمشتەوە هەبێت و کەمتر بزانێت جەنگ چۆن دەکرێت؟
لەو باوەڕەدام.
لەم ڕووەوە، پاسەوانەکانمان دەتوانن بەرانبەر دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندەی ژمارەی خۆیان لە جەنگدا بوەستن.
من لەگەڵتا هاوڕام. ئەوە دروستە.
چۆنە ئەگەر نوێنەر بۆ شارەکەی دیکە بنێرن و بڵێن: "ئێمە یاسا ڕێگەی لێ گرتووین زێڕ و زیو کۆبکەینەوە و سوودیان بۆ ئێمە نییە. ئێوە لەم جەنگەدا وەرنە بەرەی ئێمەوە و سامانی دوژمنەکانمان بۆ ئێوە." هەرکەسێک ئەم گوتەیە ببیستێت، وەکو سەگێکی هار شەڕ دەکات، یان دەبێت بە مەڕ؟
وایە، بەڵام ئەگەر سامانی هەموو شارەکان لەلایەن شارێکەوە تاڵان بکرێت دەوڵەمەندبوونی ئەو شارە جێگەی مەترسییە.
تۆ بیرکردنەوەکەت هەژارانەیە، چونکە هەموو شارێک دەخەیتە ڕیزی ئەو شارەی ئێمە دایدەمەزرێنین.
مەبەستت چیە؟
ئێمە دەبێت ناوی دیکە بۆ شارە گەورەکانی دیکە بدۆزینەوە، چونکە

ئەوان چەند شارێکی گەورەن، نەک یەک شار. هەر یەکێک لەوان بەڕادەیەک لە دوو شار پێکهاتووە و بەرانبەر یەک لەنێو جەنگدان. یەکێکیان هەژارو ئەوی دی دەوڵەمەند، یان بە ژمارەی دانیشتووان جیاوازن. هەڵەیە بە یەک شاریان دابنێیت. ئەگەر بە چەند شارێک دایانبنێیت و لەگەڵ یەکێکیان هاوپەیمان بیت و بەڵێنی پارە و دەسەڵاتی بدەیتێ، ئەوا دۆست بۆ خۆت زۆر دەکەیت و دوژمنیش کەم. ئەگەر شارەکەی ئێمەش بەمجۆرەی دەمانەوێت فەرمانڕەوایی بکرێت بە هەزار پاسەوانیشەوە دەتوانین شەڕی خۆمان بکەین. بەناو ناوداریێتی نا، مەبەستم ئەمە نییە، بەڵکو بە کردەوە. تۆ شارێک لەمە چاکتر لەنێو یۆنانیەکان و بەربەرییەکانیشدا نادۆزیتەوە33. هەرچەندە شار هەیە لەوەی ئێمە بە ڕووبەر گەورەترە. ئایا لەسەر ئەم خاڵە ڕێناکەویت؟

با، بەدڵنیاییەوە.

ئەمەش دەبێتە دانانی سنوورێک لەلایەن پاسەوانەکانمانەوە بۆ شارەکە. ئەوان بەگوێرەی پێویست زەوی بۆ شارەکە دەستنیشان دەکەن.

چ سنوورێک؟

بە بۆچوونی من بەمجۆرەیە. مادامەکی یەک شار دەبێت گەشە بکات، ئەوا گەشەکردنەکەی سنووردار دەبێت.

چاکە .

کەوابوو، فەرمان بۆ پاسەوانەکانمان دەردەکەین ئاگاداری گەورەیی و بچووکی شارەکەمان لە ناوداریێتی نەک لە ڕووبەرەکەیدا بکەن.

ئەو فەرمانە ڕەوایە.

فەرمانەکەی پێشوو، لەمە ئاسانترە، کە گوتمان ئەو منداڵانەی هەست بە کەمی لە بوونیاندا دەکرێت و منداڵی پاسەوانەکانن، ڕەوانەی لای هاوڵاتیەکانی دیکە بۆ پەروەردە و فێربوون دەکرێن. منداڵی هاوڵاتیەکانی دیکەش، کە هیچ کەموکورتیەکیان نییە دەخرێنە نێو پاسەوانەکانەوە. ئەمەش پێویستە، چونکە هەر هاوڵاتییەک کارو پیشەی تایبەتی خۆی هەیە. شارەکەش دەبێت بە شارێک بۆ هەمووان.

ئەمە لەوی پێشووتر ئاسانترە.

فەرمانەکانمان، ئەدیمەنتۆس گرنگترن لەوەی زۆر بن. هەروەها من

دەڵێم فەرمانی مەزن نین، بەڵکو شتێکی تەواون.
چۆن؟
ئەگەر هاوڵاتیان لە منداڵییەوە فێر بکرێن، دەبن بە کەسانی ژیر و هۆشمەند. خۆیان چاکەکان دەبینن و دەزانن چ شتێکیان پێ نەدراوە. بۆ نموونە هاوسەربوون و زاوزێکردن دەبێت لەسەر ئەو پەندە دابمەزرێن، کە دەڵێت: هاورێکان لە هەموو شتەکاندا هاوبەشن.
ئەوە زۆر چاکە.
بەدڵنیاییەوە، شارەکەمان لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنیەوە چاک بڕوات گەشەکردنەکەش شێوازێکی خولەیی دەگرێتە بەر. پەروەردە و فێرکردنی چاک کەسانی چاک و سوودبەخش دەهێننە کایەوە. کەسانی چاک پەروەردەکراو و خوێندەواریش لە نەوەکانی پێشووتریان چاکتر دەردەچن. نەوەی چاکتریشیان لێ دەبێتەوە.
بەڵێ، ڕاستە.
بەکورتی، فەرمانڕەواکان دەبێت فێر بکرێن گەندەڵ نەبن. لەسەروو ئەمەوە، دەبێت دژی ئەو تازەبوونەوانە و مامۆستا و هۆنراوانە ڕاوەستن، کە دەبنە هۆی شێواندنی شیرازەی سیستەمەکەمان. لەوانە بترسن دەڵێن: خەڵکی ئەو گۆرانیەیان لا خۆشە بۆ یەکەمجار لەسەر زاری گۆرانیبێژەکە دەیبیستن34. هەندێک ستایش بۆ ئەم گوتەیە دەکەن. وا بۆی دەچن، مەبەستی شاعیر گۆرانی نوێ نەبێت، بەڵکو شێوازی نوێی گۆرانیگوتن بێت. ئەمە نابێت ستایشی بۆ بکرێت. پاسەوانەکان دەبێت ئاگایان لە مۆسیقای نوێ بێت، چونکە هەڕەشە لە سیستەمەکەمان دەکات. دامۆن دەڵێت، گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی شێوازی مۆسیقای شارێک بەبێ گۆرانکاری لە یاسای شارەکەدا نوێ نابێتەوە.
کەوابوو، پاسەوانەکانمان بە مۆسیقا و هۆنراوە، شورا بە چواردەوری خۆیاندا بەرز دەکەنەوە.
بەڕەڵایی لە بێ ئاگایی ئەوانەوە (شارەکە) سڕ دەکات.
بەڵێ، وەکو بڵێین، مۆسیقا تەنیا بۆ لێدان و گوێگرتن زیان بە کەس ناگەیەنێت.
تاکو ئەکاتەی بەڕەڵایی پەرش و بڵاو نەبێت و هەنگاو بە هەنگاو

لایەنەکانی ژیان داگیر نەکات بێ زیانە. کاتێک ژیانی تایبەتی خەڵکی داگیر دەکات و لاسارانەش کاردەکاتە سەر یاساو شێوەی فەرمانڕەوایی، بەتەواوی ژیانی گشتی و تایبەتی دەگرێتەوە.

ئەم ئاکامەی هەیە؟

بە بۆچوونی من هەیەتی.

کەوابوو، وەکو لە سەرەتاوە باسمان کرد، یاری منداڵان پێویستی بە سەرپەرشتیکردنی یاسایی هەیە.

ئەگەر یارییەکانیان بەڕەڵایی بێت و منداڵان بەو جۆرە پەروەردە بکرێن، ئایا کە گەورە بوون کەسانی چاکیان لێ دەردەچێت؟

نا، چاک دەرناچن.

کاتێک منداڵان فێری یاریکردنی چاک دەبن پەیڕەوی یاساکان دەکەن، فێری مۆسیقا و هۆنراوەی (دیاریکراو) دەبن، بە چاکی گەورە دەبن و هەڵەکان و کارە خراپەکان چاک دەکەنەوە. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر یارییەکانیان لەسەر یاساکانمان دانەمەزرابێتن خراپ دەردەچن.

ئەوە ڕاستە.

ئەم هاوڵاتیانە نەریتە لەناوچووەکەی نەوەکانی پێش خۆشیان دەدۆزنەوە.

وەکو چی؟

وەکو، لە چ کاتێکدا پێویستە لاوێک لە ئاستی گەورەدا بێدەنگ بێت، لەبەریان هەستێت، ئاگای لە دایک و باوکی بێت، قژدانان، جلوبەرگ و پێڵاو لەپێکردن، هەڵسوکەوت و زۆر شتی دیکەش؟

بەڵێ وایە.

وابزانم پێویست ناکات یاسایان بۆ دابنێین. ئەم جۆرە شتانە دێن و دەڕۆن ناتوانین گلیان بدەینەوە.

چۆن گلیان بدەینەوە؟

بە هەر جۆرێک بێت، ئەدیمەنتۆس، دەردەکەوێت پەروەردە و فێربوون لە سەرەتاوە کاردەکەنە سەر کەسەکە.

ئایا کەسێک هاندەری ئەوە نییە، کە لە خۆی دەچێت؟

هاندەرە.

ئامانجی پـەروەردەش تەواوکردنی مرۆڤێکی نوێیە بە چاکی یان خراپی.
هەڵبەتە.
بۆیە یاسام بۆ ئەو جۆرە شتانە دانەنا.
هۆیەکەت بەجێیە.
کەوابوو، توخوا پێم بڵێ، بازاڕ و کاسپی، بەڵێنی خەڵکی لە بازاڕدا بۆ نموونە، کرێکاری و بریندارکردنی یەکدی و شکاتکردن، دامەزراندنی دادگا و پارەدان لە شارەکەدا یاسایان بۆ دامەزرێنین؟
حوکمدان بەسەر مرۆڤێکی چاکدا نالەبارە. ئەوانەی چاکن خۆیان دەزانن چۆن بە چاکی کارەکانیان بەڕێوە بەرن.
بەڵێ، ئەگەر یاساکانمان، خوا بکات، وەکو خۆیان بمێننەوە.
ئەگەر وا نەبوو، یاساکان دەگۆڕن و کاری لەسەر دەکەن. لەو ڕێگەیەوە بە بۆچوونی ئەوان، بە ئاکامێکی چاک دەگەن.
مەبەستت ئەوەیە، کە ئەوانیش، وەکو ئەو مرۆڤە نەخۆشانەی لەبەر لاساییان واز لە کارە زیانبەخشەکان ناهێنن، ڕەفتار دەکەن.
بەڵێ وایە.
ئەم جۆرە کەسانە بـەردەوام ژیانێکی سەیریان هەیە، وانیە؟ دەرمـانـکـردن چـارەی نەخۆشییەکەیان نـاکـات. نەخۆشیەکەشیان بـــەرەو خـــراپـی و ئـاڵـۆزی دەڕوات. هـەمـیـشـەش چـاوەڕوانـی دەرمـانـێـکی چاکتر بـۆ چـاکـبـوونـەوەی نـەخـۆشـیـەکـەیان دەکـەن.
ئەم جۆرە کەسانە، وا دەژین.
سەیر نییە ئـەوەی ڕاستیان پێ دەڵـێت بە دوژمـنـی دادەنـێـن؟ بۆ نموونە بڵێیت واز لە خـواردنـەوە و زۆر خـواردن، شەهوەت و تەمەڵی بهێنن. هیچ دەرمـان و نەشتەرسازییەک چـارەتـان ناکات.
سەیر نییە.
وادیارە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا نیت.
بەدڵنیاییەوە، لەگەڵیاندا نیم.
لەگەڵ ئەوەشدا نیت، کە هاوڵاتیانی شارەکەمان بەم جۆرە بژین؟ نابینیت ئەو شارانەی بە خراپی فەرمانڕەواییان تێدا بەرقەرارە بەم جۆرە بەڕێوە دەچن؟ داوا لە هاوڵاتیان دەکەن لە کاتی ناخۆشی و

مردندا دەسەڵاتی ڕامیاری شارەکە تێک نەدەن؟ لەم شارانەدا کەسانی زمانلووس، شوێنکەوتووی ڕژێم و ئەوانەی بەگوێرەی دەسەڵاتدارەکان هەڵسوکەوت دەکەن بە کەسانی خاوەن ڕێز و زانا و ژیر دادەنرێن.

هەر شارێک بەمجۆرە بێت من ڕەتی دەدەمەوە.

ڕات دەربارەی ئەو کەسانەی شوێن ئەم جۆرە شارانە دەکەون چیە؟ ئایا ئازایەتی و ئامادەبوونیانت لا پەسەند نییە؟

بەڵێ، ئەوانەی زۆرینە هەڵی خەڵەتاندون، وا دەزانن فەرمانڕەواکانیان بەڕاستی لێهاتوون.

مەبەستت چیە؟ چۆن بەزەییت پیایاندا دێتەوە؟ یان بە بۆچوونی تۆ دەگونجێت کەسێک خۆی نەزانێت چۆن بەرزی بپێوێت، بەڵام باوەڕ بە خەڵکی نەزانی وەکو خۆی بکات پێی بڵێن باڵات شەش پێ بەرزە؟

نا، وا بیر ناکەمەوە.

کەوابوو، بەرانبەریان دڵڕەق مەبە. ئەم کەسانە زۆر سەیرن. ئەوان یاسا بۆ کەسانی دیکە دادەنێن و دوایی دەیگۆڕن. لەو باوەڕەشدان ڕێگەچارەیەک بۆ ئەو فڕوفێڵانەی (نێو بازاڕ)، کە باسمان کردن دەدۆزنەوە بەبێئەوەی بزانن، کە ئەوان تەنیا سەرێکی (هیدرا)یان بڕیوە35.

ئایا ئەو کارە دەتوانن بکەن؟

من وا تێدەگەم یاساساز لەنێو شارێکی چاک و خراپیشدا خۆی بەم جۆرە یاسایەوە ماندوو نەکات.

لەنێو شاری خراپدا بێ سوودە. هیچ دەستکەوتێکی لێ چاوەڕوان ناکرێت. لە شاری چاکیشدا خەڵکی بەئاسایی شوێن یاساو نەریتە دامەزراوەکان دەکەون.

چی دیکە هەیە لێرەدا، لەگەڵ یاسادانانەدا باسی بکەین؟

هیچ بۆ ئێمە نەماوە، بەڵام بۆ ئەپۆلۆی نێو (پەرستگای) دێلف چاکترین یاسا ماوە دەستنیشان بکرێت.

ئەوە چیە؟

ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە پەرستگا دروستکردن و قوربانیکردن و خزمەتگوزارییەکانی دیکە بۆ خوداوەند و دێوەکان و قارەمانەکانەوە هەیە و بۆ مردووناشتن و چاکەکردنە بۆیان. ئێمە زانیاریمان لەبارەی

ئەم جۆرە شتانەوە نییە. بۆ زانینیش لەبارەیانەوە دەبێت بۆ نەوەکانی پێش خۆمان بگەڕێینەوە. دڵنیام لەوەی ئەو خوایەی لە ناوەڕاستی جیهان لەسەر تاشەبەردێک دانیشتووە سەرچاوەی ئەو زانیاریەیە36.

گوتەکەت جوانە، پێویستە وا بکەین.

ئێستا باشە، کوڕی ئەریستون، شارەکەی تۆ دامەزرا. هەنگاوی دووەم برۆ چرایەک بێنە با بەردەممان ڕووناک بکاتەوە. براکەت و پۆلیمارکۆس و ئەوانی دیکەش بانگ بکە تاکو بزانن لەکوێدا دادوەری و نادادوەری هەیە. جیاوازییەکانیان بدۆزنەوە. گرنگیش نییە ئەو کەسەی دادوەرە یان نادادوەر، خواکان و کەسانی دیکە پێی بزانن.

گلاوکۆن گوتی: ئەوەی تۆ باسی دەکەیت واتایەکی نییە. تۆ بەڵێنت دا خۆت بەدوایدا بگەڕێیت. تۆ خۆت بەو کەسە دانا دادوەری بپارێزیت.

ڕاستە، من بەڵێنەکەی خۆم جێبەجێ دەکەم، بەڵام پێویستیم بە یارمەتی تۆیە.

من یارمەتیت دەدەم.

هیوادارم لەم ڕێگەیەوە بیدۆزمەوە. بە بۆچوونی من، ئەگەر شارەکەمان بە دروستی دامەزرابێت پێویستە بەتەواوی شارێکی چاک بێت.

پێویستە.

ئاشکراشە، کە شارێکە پڕ لە زانایی و مامناوەندێتی و ئازایەتی و دادوەری.

ئاشکرایە.

ئەگەر ئەم خەسڵەتانەی هەبێت، ئەوەی ماوە ئەوانەیە، کە ئێمە نەماندۆزیونەتەوە؟

هەڵبەتە.

ئێمە چوار چاکەمان ئاماژە کردووە. یەکێک لەو چاکانە زانابییە. وادیارە شتێکی نارێک لەبارەیەوە هەیە. ئەوە چیە؟

وا بیر دەکەمەوە شارەکەمان پڕە لە زانایی، چونکە حوکمدانی چاکی تێدایە. وانیە؟

بەڵێ وایە.

حوکمدانی چاک جۆرێکە لە زانین، چونکە بە ڕێگەی زانینەوە، نەک

نـەزانـیـن خـەڵـکـی حـوکـمـی چـاک دەدەن بـەسـەر شـتـەکـانـدا.

ئاشکرایە.

بەڵام چەند جۆرێک زانین لە شارەکەدا هەیە.

بەدڵنیاییەوە.

ئایا زانیاری دارتاشەکان شارەکەمان زانا دەکات و حوکمی چاکی تێدا سەقامگیر دەکات؟

نا، وانیە.

لە دارتاشیدا ئەو زانیارییە شارەزاییە. کەوابوو، زانیارییەکەی بە زانایی دانانرێت.

بێگومان دانانرێت.

زانیاریمان لەبارەی برۆنز و کانەکانی دیکەوە چیە؟

وانیە.

ئەی زانیاریمان لەبارەی کشتوکاڵەوە ئەوەش شارەزاییە؟

من وا بۆی دەچم.

ئایا جۆرە زانینێک لای هاوڵاتیەکی شارەکە هەیە، کە پەیوەندی بە هیچ تاکە شتێکەوە نەبێت و تەنیا پەیوەندی بە پاراستنی شارەکە لە دەرەوە و ناوەوە هەبێت؟

بێگومان هەیە.

ئەو زانینە چیە؟ کێ هەیەتی؟

ئەو زانینە پاسەوانێتییە و لای ئەو فەرمانڕەوایانە هەیە، کە بە پاسەوانی تەواو ناوزەدمان کردن.

ئەم زانینە چیت لەبارەی شارەکەوە پێ دەناسێنێت؟

شارێکە حوکمی چاکی تێدا دەکرێت و پڕە لە زانایی.

چ جۆرە هاوڵاتیەک لە شارەکەماندا ژمارەیان زۆرترە، ئاسنگەر یان پاسەوانی ڕاست؟

ئاسنگەر زۆرترە.

کەوابوو، ئەو شارەی سروشتیە و پڕە لە زانایی ژمارەی چینی فەرمانڕەوای کەمترە. ئەم ژمارە کەمەش جۆرە زانینێکیان هەیە، کە بە زانایی (فەلسەفە) ناوزەدمان کرد.

بەتەواوی دروستە.
ئێستا، یەکێک لەو چوار چاکەیەمان دۆزییەوە. دەزانین کێ لە شارەکەماندا هەیەتی، بەڵام نازانم چۆن دۆزیمانەوە.
بە بۆچوونی من، ڕێگەی دۆزینەوەکەی ئاشکرایە.
لێرەوە دژوار نییە ئەوانەی ئەم خەسڵەتەیان لە شارەکەماندا هەیە بدۆزینەوە.
چۆن؟ ئەوانەی بە ئازا دادەنرێن ئەو هاوڵاتیانە نین، کە بۆ شارەکە دەچنە جەنگەوە؟
لەوان زیاتر کەسی دیکە نییە.
شارەکە ئازایە. ئەوانەی دەسەڵاتیان هەیە باوەڕەکانی بپارێزن فێرکراون نەترس بن.
ئەوە بە ئازایەتی دانانێیت؟
بەتەواوی تێناگەم. تکایە دووبارەی بکەوە.
مەبەستم ئەوەیە، کە ئازایەتی جۆرێکە لە خۆهێشتنەوە.
چ خۆ هێشتنەوەیەک؟
ئەو خۆ هێشتنەوەیەی یاسا لە ڕێگەی پەروەردەوە بەرانبەر مەترسی هانی دەدات. ئەمەش هێشتنەوە و پاراستنی "بڕوا" یە و کۆڵنەدانە لەژێر باری گرانی ئەشکەنجە و ترس یان خۆشی و ئارەزوودا.
ئەگەر حەز بکەیت لەگەڵ شتێکی لێکچوودا بۆتی بەراورد دەکەم.
حەزدەکەم بەراوردی بکەیت.
تۆ دەزانی (لە خومخانە) ئەوەی ڕەنگی خورییەکەی مۆر دەکات سپیترین خوری هەڵدەبژێرێت و بە چەند پرۆسەیەکدا دەیبات. خوریەکە ئەو ڕەنگە بە شێنەیی هەڵدەمژێت. ئەو خورییەی بەمجۆرە ڕەنگ کرا بەشتن، تەنانەت شتن بە سابوونیش ڕەنگەکەی ناڕوات. خورییەک بەمجۆرە ڕەنگ نەکرابێت ڕەنگەکەی کاڵ دەبێتەوە. من دەزانم، چۆن ڕەنگەکەی دەڕوات.
کەوابوو، تێبگە، ئێمەش بۆ هەڵبژاردنی پاسەوانەکانمان و پەروەردەکردنیان بە هۆنراوە و مۆسیقا و وەرزش هەمان پرۆسەمان بۆ ئامادە کردن. ئەوەی کردمان ئەمە بوو: لەبەرئەوەی سروشتێکی ئاسایی و پەروەردەیەکی چاکیان هەبوو توانیان، وەکو چۆن خورییە

(سپیەکە) ڕەنگەکەی هەڵمژی، بە چاکی فێری یاساکان ببن. بڕوایان بەو شتانەی، کە دەبێت بیپارێزن بەجۆرێک چووە ناخیانەوە هیچ جۆرە سابوونێک، وەکو چێژ و ئارەزوویان و ترس کاڵی نەکاتەوە. هەروەها چێژ لە هەموو جۆرە سابوونێک یان سۆدەیەک بۆ شتن بەهێزترە. من ئەم هێزە لە ئاستی هێشتنەوەی هەموو ئەو شتانەدا یاسا دایناون، یان داینەناون بە ئازایەتی دادەنێم. ئەگەر تۆ بە شتێکی دیکەی دادەنێیت پێم بڵێ.

من بیرێکی جیاوازم نییە. تەنیا ئەوەندە دەڵێم تۆ باسی باوەڕی ڕاست ناکەیت، کە لای ئاژەڵ و کۆیلەکانیش هەیە و لە ئاکامی فێربوون و پەروەردەکردنیشەوە سەری هەڵنەداوە. تۆ ئەمە بە ئازایەتی دانانێیت.

ئەوە بەتەواوی ڕاستە.

کەوابوو، لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆدام.

تۆ لەباتی باسکردنی چەند جۆرێک لە ئازایەتی ڕاست دەکەیت.

ئەگەر حەز بکەیت جارێکی دیکە بەدرێژی باسی ئازایەتی دەکەین. ئێستا لێکۆڵینەوەکەمان سەبارەت بە دادوەرییە. ئەوەی گوتمان بەسە.

تۆ ڕاست دەکەیت.

دوو جۆر شت لە شارەکەماندا ماوە بیدۆزینەوە: مامناوەندێتی و ئامانجە گەورەکەمان، کە دادوەرییە.

ڕاستە.

ڕێگەیەک هەیە بەبێئەوەی مامەڵە لەگەڵ مامناوەندییا بکەین بمانگەیەنێتە دادوەری؟

من نازانم. نامەوێت دادوەری لە پێش مامناوەندێتیدا بدۆزمەوە. ئەگەر دەتەوێت دڵی من ڕابگریت لەپێشدا بەدوای مامناوەندێتیدا بگەڕێت.

من دڵی تۆ ڕادەگرم و بەدوایدا دەگەڕێم.

فەرموو، بیدۆزەوە.

دەیدۆزینەوە. لێرەوە تەماشای بکەیت، وەکو هاوئاهەنگی، یان هارمۆنی دەردەکەوێت.

لە چ ڕوویەکەوە؟

مامناوەندێتی جۆرێکە لە سیستەم. دەسەڵاتگرتنە بەسەر چێژ و ئارەزووەکاندا.

خەڵکی بە"خۆ- ڕاگرتن" ناوزەدی دەکەن. من نازانم چ مەبەستێکیان هەیە، بەڵام ئەم گوتەیە بە کلیلی مامناوەندێتی دادەنێن. وانیە؟

بەتەواوی وایە.

ئایا دەربڕینی "خۆ- ڕاگرتن" گاڵتەبازی نییە؟ ئەوەی بەهێزە و خۆی ڕادەگرێت، ئەوەی لاوازە و ڕێی لێ دەگیرێت، وەکو یەک بە خۆڕاگر دادەنرێن.

وایە.

بێجگە لەمە، دەربڕینەکە هەوڵ دەدات ئەوەمان بۆ دیاری بکات، کە لەنێو دەروونی هەموو تاکێکدا بەشی چاک و خراپ هەیە. کاتێک بەشی چاک دەسەڵات بەسەر بەشی خراپدا دەگرێت و بەڕێوەی دەبات، پێی دەوترێت "خۆ- ڕاگرتن".

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر بەشە خراپەکە دەسەڵاتی بەسەر بەشە چاکەکەدا بەهۆی پەروەردەکردنی تاکەکەوە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسانی خراپدا هەبێت، بە کەسێکی دۆڕاو و بەڕەڵا، یان شەرمەزار ناوزەدی دەکەن.

بەتەواوی وایە.

تەماشایەکی شارە نوێکەمان بکە ئەمەی تێدا دەبینیت. ئەو شتە خراپەی دەسەڵاتی بەسەردا گیراوە تۆ بە مامناوەندێتی و خۆڕاگرتنی دادەنێیت.

من تەماشا دەکەم، ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ڕاستە.

ئێستا هەموو کەسێک حەزو ئارەزووی جیاواز، وەکو چێژەکان، ئازارەکانی لەنێو منداڵان و ژنان، خزمەتکارەکان و زۆربەی ئەوانەی ئازادن (لە پلەی نزمی کۆمەڵایەتیدا دەژین) دەبینێت.

ئەمە ڕاستە.

هەروەها، ئەو کەسانەش دەبینێت، کە حەزو ئارەزووەکانیان سادە و سنووردارن.

بەگوێرەی تێگەیشتنی ئەوان سەرپەرشتیان کراوە، چونکە ئەو کەسانە بە سروشت چاکن و چاکترین پەروەردەشیان بۆ کراوە.

ئەوە ڕاستە.
کەوابوو، نابینیت حەزو ئارەزووەکانی کەسە نزمەکان بە زانایی و حەزو ئارەزووی کەسە بەرز و بە ژمارە کەمەکان سەرپەرشتیان کرابێت؟
ئەوە دەبینم.
لەم ڕووەوە ئەگەر شارێکی خۆڕاگر هەبێت دەسەڵاتی بەسەر حەزو ئارەزووەکاندا گرتبێت شارەکەی ئێمەیە. بەتەواوی.
ئایا لەبەر ئەم هۆکارە مامناوەندیەش نییە؟
وایە.
بێجگە لەمە، ئەگەر فەرمانڕەوا و فەرمانڕەواییکراوانی شارێک یەک جۆر بیروڕایان لەسەر فەرمانڕەوایی هەبێت، ئەوا لە شارەکەی ئێمەدایە. ئایا لەگەڵما هاوڕا نیت؟
بەتەواوی لەگەڵتا هاوڕام.
ئەگەر هاوڵاتیان لەسەر ئەم خاڵە ڕێکەون لە کامیاندا ژیانی مامناوەندی دەدۆزینەوە؟ لەلای فەرمانڕەواکان یان فەرمانڕەواییکرا وەکان؟
بۆی دەچم لە هەردووکیاندا.
لێرەدا دەبینیت چۆن مامناوەندێتی لە جۆرێک هاوئاهەنگی دەچێت.
چۆن؟
چونکە بەپێچەوانەی ئازایەتی و زاناییەوە، کە هەر یەکێکیان سەر بە بەشێکی دەروونەو شارەکەمان ئازاو زانا دەکەن، مامناوەندێتی لەنێو هەموو بەشەکاندا هەیە. ئەو دەتوانێت هێزدارەکان، لاوازەکان، ئەوانەی لەنێوانیاندان لەڕووی ژیرییەوە، بەهێزی لەشەوە، ژمارە، یان سامان بێت پێکەوە ڕێک بخات و هەموویان یەک گۆرانی پێکەوە بڵێن. ئەم تێکڕایی و ڕێکەوتنە لەنێوان لایەنە چاک و خراپەکاندا و لەنێو (دەروونی) فەرمانڕەواو فەرمانڕەواییکراوەکاندا بە مامناوەندێتی دادەنرێت.
بەتەواوی لەگەڵ ڕاکەی تۆدام.
باشە، بەگوێرەی بۆچوون و بیروڕاکەی ئێستامان، سێ چاکەمان لەنێو چوار جۆرە چاکەکاندا لە شارەکەماندا دۆزیوەتەوە. چ جۆرە

چاکەیەک ماوەتەوە باسمان نەکردبێت تا شارەکەمان چاکتر نیشان بدات؟
ئاشکرایە ئەو چاکەیە دادوەرییە.
دیارە.
کەوابوو، گلاوکۆن پێویستە خۆمان لەنێو دارستانەکەدا، وەکو ڕاوچی (بۆ نێچیر) حەشار بدەین و هەوڵی تێگەیشتن بدەین، تاکو دادوەری لەدەستمان دەرنەچێت. لەنێو تاریکی (دارستانەکەدا) ون نەبێت و هەوڵی دۆزینەوەی بدەین. ئەگەر پێش من دۆزیتەوە، ئاگادارم بکە.
خۆزگە وا دەبوو، بەڵام باشتر دەیبینم ئەگەر شوێن تۆ بکەوم و تۆ نیشانم بدەیت.
کەوابوو، شوێنم بکەوە.
شوێنت دەکەوم ئەگەر پێشڕەوی بکەیت.
من ئەوە دەکەم، بەڵام شوێنی (خۆحەشاردانەکەمان) چڕە و پڕ سێبەرە. لەم شوێنە تاریکەوە گەڕان دژوارە. شوێنەکانی دیکەش بەمجۆرەیە و دەبێت گەڕانەکەمان دەستپێبکەین.
ئەوە خەبەرێکی خۆشە.
ئەگەر وا نەبێت، ئێمە گەمژەین.
لە چ ڕوویەکەوە؟
ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێین لە سەرەتای گەشتەکەمانەوە لە قاچمان ئاڵاوە و نەمان بینیوە. ئەمەش گاڵتەبازییە. زۆرجار کەسێک بەدوای شتێکدا دەگەڕێت، کە بە دەستیەوەیەتی. ئێمە تەماشای بەر قاچی خۆمان نەکرد و دوور دەمانڕوانی، بۆیە نەماندۆزییەوە.
مەبەستت چیە؟
مەبەستم ئەوەیە، کە ئێمە لەمێژە باسی دادوەری دەکەین و پێمان نەزانیوە.
ئەو پێشەکییە بۆ وەڵامی پرسیارەکە درێژە.
کەوابوو، گوێ بگرە و بزانە، ئەوەی من دەیڵێم واتایەکی هەیە.
بە دیدی من، دادوەری ئەوەیە، کە باسمان کرد و گوتمان پێویستە لەنێو شارەکەماندا بەرقەرار بێت. ئەگەر لەبیرت بێت چەند جارێک

گوتمان هەرکەسە دەبێت لەسەر ئەو پیشەیە دابنرێت، کە بە سروشت بۆی ئامادە کراوە و لەگەڵیا دەگونجێت.

بەڵێ، ئەوەمان چەند جارێک باس کرد.

لەسەروو ئەمەوە، لە کەسانی دیکەمان بیستووەو ئێمەش گوتمان، دادوەری هەڵسانە بە کاری خۆت و تێکەڵاونەکردنی ئەو پیشە و کەسانەیە، کە لەگەڵ یەکدییا ناگونجێن.

بەڵێ، گوتمان.

کەوابوو، هەرکەسە بەگوێرەی خۆی کاری بدرێتێ دادوەرییە. ئایا دەزانیت بەڵگەم بۆ ئەمە چیە؟

نازانم، پێم بڵێ.

وابزانم پاش دۆزینەوەی مامناوەندێتی، ئازایەتی و زانایی لە شارەکەدا ئەمە مایەوە (ئاماژەی بۆ نەکرێت). ئەمەش هێزێکە بۆ گەشەکردن و هێشتنەوەی شارەکە. هەروەها گوتمان پاش دۆزینەوەی سێ جۆر لە چاکەکان دادوەری ماوەتەوە باسمان نەکردبێت.

بەڵێ.

ئاسان نییە بزانین چ جۆرە چاکەیەک بەبێ ئەوانی دی شارەکەمان چاک دەردەخات. ئایا ئەمە دەکەوێتە سەر ڕێکەوتنی فەرمانڕەواو فەرمانڕەواییکراوەکان؟ یان خۆهێشتنەوەی پاسەوانە گوێڕایەڵەکانمان و نەبەردی و قارەمانێتیان؟ زانایی فەرمانڕەواکان؟ یان دەکەوێتە سەر ئەوەی هەریەکێک لە منداڵان، ژنان، کۆیلەکان، بازرگانەکان، فەرمانڕەواکان و فەرمانڕەواییکراوەکان بە کاری گونجاوی خۆیان هەستن و دەست نەخەنە نێو کار و ئیشی یەکدییەوە؟ بۆچی ئاسانە نییە؟

دەردەکەوێت، دانانی کارە گونجاوەکان بۆ هەر کەسێک لە هاوڵاتیانی شارەکەمان بەرانبەر زانایی، ئازایەتی و مامناوەندێتی ڕادەوەستێت و لەوان زۆرتر بەشداری دامەزراندنی شارێکی چاک دەکات.

بەدڵنیاییەوە.

ئایا تۆ ئەم چاکەیەی بەرانبەر ئەوانی دیکە ڕاوەستاوە بە دادوەری دانانێیت؟

بەتەواوەتی (دادوەرییە).

ئەگەر ڕازی بوویت بەمجۆرە تەماشای بکە. تۆ فەرمانڕەواکانت بە دادوەر لە دادگای شارەکە دانانێیت؟
بێگومان.
ئایا فەرمان دەرناکەن نابێت کەس ماڵ و سامانی کەسێکی دیکە داگیر بکات؟ یان کەس بێبەری نەکرێت لەوەی هەیەتی؟
ئەوە ئامانجی ئەوانە.
بەڵێ.
لەم بۆچوونەوە، کەسێک پیشەی خۆی بکات، ئەوەی هەیەتی لێی زەوت نەکرێت دادوەرییە.
ڕاستە.
بیرکەرەوە و پێم بڵێ، تۆ لەگەڵمدا لەسەر ئەم خاڵە هاوڕایت. ئەگەر دارتاش بیەوێت ببێت بە پینەچی و پینەچی بە دارتاش، یان ئامێر و کەلوپەلەکانیان بگۆڕنەوە، تاکێک هەردوو پیشەکەی هەبێت زیان بە شارەکە دەگەیەنێت؟ زیانی زۆر ناگەیەنێت.
بەڵام، من لەو باوەڕەدام ئەگەر کەسێک بە سروشت پیشەساز، بازرگان، دەوڵەمەند بێت، خەڵکی دەنگی بۆ دەدەن یان بەهێزەو هەوڵ دەدات بچێتە نێو دەستەی پاسەوانەکانەوە، یان پاسەوانێک بیەوێت ببێت بە دادوەر یان فەرمانڕەوا و کەلوپەلەکانیش بگۆڕنەوە، یان ئەو کەسە بەو هەموو کارە جیاوازانە هەستێت، شارەکە بەرەو وێرانی دەبات.
ڕاستە.
گۆڕینەوە و تێکەڵاوکردنی (پیشەکان) لەنێو ئەم سێ چینەی (کۆمەڵدا) گەورەترین زیان دەبەخشێت37.
ڕاستە.
ئایا تۆ لەو باوەڕەدا نیت نادادوەری گەورەترین زیانە بۆ شارەکە؟
هەڵبەتە.
کەوابوو، گۆڕینەوە و تێکەڵاوکردنی (پیشەکان) نادادوەرییە، یان بەجۆرێکی دیکە دەتوانین بڵێین: دادوەری لەوەدایە بازرگان، یارمەتیدەران و پاسەوانان بە کاری خۆیان هەستن. ئەمە دادوەرییەو

شارەکەشمان پڕ داد دەکات، وانییە؟
به بۆچوونی منیش ئەوە دادوەرییە و چی دیکە نییە.
بڕیاری تەواو لەسەر ئەمە نادەین. ئەگەر ئەم حاڵەتەمان لەنێو هەموو تاکەکاندا دۆزییەوە و بە دادوەری دانرا، ئێمەش بڕیاری خۆمان دەدەین. ئەگەر نەدۆزرایەوە دەبێت لە شوێنێکی دیکەدا بەدوای دادوەرییدا بگەڕێین. ئێستا هەوڵ دەدەین توێژینەوەکەمان تەواو بکەین. ئێمە گوتمان بینینی دادوەری لە شتێکی گەورەدا ئاسانترە. هەروەها ئەو شتە گەورەیە شار بوو. ئێمەش چاکترین شارمان دامەزراند. ئێستا، ئەوەی باسمان کرد لەم شارەدا بەسەر تاکە کەسدا دەیسەپێنین. سەرکەوتنمان لەم کارەدا ڕاستی بۆچوونەکەمان دەسەلمێنێت. ئەگەر نەگونجا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ شارەکەمان و بیخەینە ژێر تاقیکردنەوە. ئەگەر بتوانین هەموو لاکان سەرکەوتووانە بەراورد بکەین، وەک چۆن دوو پارچە دار بۆ ئاگرکردنەوە بە یەکدا دەدەین و لەپڕ ئاگریان لێ دەبێتەوە، ئێمەش دادوەری دادەگیرسێنین.
تۆ لەسەر ئەو ڕێگەیەی گرتوومانە.
ئایا ئەو شتانەی گەورە و بچووکن لە یەکدی دەچن، یان جیاوازن و یەک ناویان پێ دەدرێت؟
وەکو یەکن.
کەوابوو، کەسێکی دادوەر و شارێکی پڕ دادوەری لەڕووی دادوەرییەوە وەکو یەکن.
وەکو یەکن.
بەڵام دادوەری شارەکە لەسەر پیشەی گونجاوی هەر یەکێک لەو سێ چینە ڕادەوەستێت، کە باسمان کردن و بە مامناوەندی و ئازا و زانامان دانان.
ئەوە ڕاستە.
ئەگەر تاکێک ئەو سێ بەشەی لە دەروونیدا هەبێت هەمان ناوی بۆ دادەنێین.
پێویستە.
لێرەدا ئەو پرسیارەی دەمانەوێت بیکەین ئاسانە: ئایا دەروون ئەو سێ بەشەی هەیە یان نا؟

بۆ من پرسیارێکی ئاسان نییە. لەو باوەڕەدام، سوکرات، ڕاستیەک لەو پەندە کۆنەدا هەبێت، کە دەڵێت؛ هەموو شتێکی چاک دژوارە.

دیارە. بەڵام، گلاوکۆن دەبێت بزانیت بە بۆچوونی من، ڕێچکەو گفتوگۆکەی ئێستامان ڕێگە نادات وەڵامێکی دروستمان دەست بکەوێت. پێویستە ڕێگەیەکی درێژتر بگرینە بەر. دەتوانین بەگوێرەی گفتوگۆکەی پێشوومان وەڵامەکەش بدۆزینەوە.

ئایا وەڵامەکە پەسەند دەکەیت؟

تاکو ئێستا بۆ من بەسە.

لەم حاڵەتەدا بۆ منیش بەسە.

کەوابوو، نیگەران مەبەو بەردەوام بە.

ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕەی هەریەکێک لە ئێمە، وەکو شارەکە، سێ بەش لە دەروونیدا هەیە. لەکوێی ترەوە ئەم بەشانە هاتوون؟ گاڵتەبازییە کەسێک نەزانێت ورەبەرزی لە شاردا لای کەسانی، وەکو تراسیەن و سکیسیەن نییە، خۆشەویستی بۆ فێربوون پەیوەندی بەم جیهانەوە نییە و لای فینیشیەکان و میسرییەکان بۆ پارە نییە.

وانیە.

ئەمە وایە و تێگەیشتنی دژوار نییە.

بێگومان.

بەڵام دژوارە. ئایا ئەم کارانە بە هەموو بەشەکانی دەروون دەکەین؟ یان هەر بەشە کاری خۆی هەیە؟ ئایا بەشێک لە دەروون سەرچاوەی فێربوونە و بەشەکانی دیکەش بۆ توڕەبوون، حەز، چێژ، خواردن، خواردنەوە و سێکسە؟ کاتێک دەمانەوێت کارێک بکەین دەروونمان (بە هەموو بەشەکانیەوە) بەو کارە هەڵدەستێت؟ ئەمە دژوارە لەبەر ڕۆشنایی گفتوگۆکەمان ڕوون بکرێتەوە.

منیش وا بیر دەکەمەوە.

با بزانین ئەم بەشانە وەکو یەکن، یان جیاوازن؟

چۆن؟

ئاشکرایە شتێک نایەوێت پەیوەندی بە دژەکەیەوە هەبێت و لەهەمانکاتدا بە کارێکی دژ هەستێت. ئەگەر ئەمە لە دەروون‌دا بدۆزینەوە باشە.

بیرکەوە، چی دەڵێم.
بڵێ.
دەگونجێت شتێک لە یەک کاتدا بجووڵێت و وەستاویش بێت؟
نەخێر.
با ڕێکەوتنەکەمان باشتر دامەزرێنین تاکو لەدواییدا تووشی کێشەمان نەکات. ڕاست نییە کەسێک ڕاوەستا بێت و دەست وسەری بجووڵێنێت بڵێین ئەو ڕاوەستاوە و دەجووڵێت. لێرەدا بەشێکی دەجووڵێت و بەشێکی وەستاوە. وانیە؟
وایە.
ئەگەر گوتەبێژەکەمان زیرەکانە باسی بکات، کە ئەو سەرانەی دەخولێنەوە ڕاوەستاون، یان پێچکەیەک لە شوێنێکدا ڕاوەستێت سەرەکانی هەر دەخولێنەوە، ئەمەش بۆ هەموو جووڵانێکی بازنەیی دروستە، ئێمە ڕازی نابین، چونکە ئەو بەشەی بجووڵێت لەهەمانکاتدا وەستاو نییە. ئەوانەی دەسوڕێنەوە تەوەر و چێوەیان هەیە. لە ئاستی تەوەرەکەیاندا وەستاون و بەم لاو ئەولادا ناکەون. لەنێو چێوەکەشدا بە بازنەیی دەجولێنەوە، بەڵام ئەگەر بەلای چەپ و ڕاستدا، بە پێش و پشتەوەدا بکەون بە وەستاو دانانرێن.
ئێمە ڕاست بۆی دەچین.
هێشتا بۆچوونەکەی ئەو نامانشێوێنێت. نامانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی شتەکان بە نێو دژەکانی خۆیاندا لە یەک کاتدا تێپەرن.
ئەو من ناگەیەنێتە ئەو باوەرە.
لەگەڵ ئەمەشدا، بۆئەوەی بەدرێژی باسی نەکەین یەکەیەکە ناڕاستی بۆچوونەکان نەسەلمێنین، ئەم گریمانەیە بەڕاست دادەنێین. هەمان کات لەگەڵ ئەوەشدا ڕێدەکەوین، کە دەشێت ئەم بۆچوونە ڕاست نەبێت و ئاکامەکانمان لەناوبچن.
لەسەر ئەوە ڕێدەکەوین.
ئایا لەو باوەڕەدا نیت ئەم شتانە جووتی دژەکان بن: ژوورچوون و دابەزین، خواستی هەبوون و ڕەتدانەوە، وەرگرتن و دانەوە؟
بەڵێ، ئەمانە دژن.
لەبارەی ئەمانەوە چ دەڵێیت؟ ئایا برسێتی، تینوێتی و ئارەزووەکان

و ویست ناخەیتە ڕیزیانەوە؟ تۆ نالێیت دەروونی کەسێک ئارەزووی لە شتێک بێت، ئەو شتەی دەوێت و هەوڵ دەدات هەیبێت. ئەگەر ویستی شتێکی بدرێتێ مادامەکی دەروونی ئارەزووی ئەو شتەیە، وەکو چۆن کەسێک لە ئاستی وەڵامی پرسیارێکدا دەپاڕێتەوە، ئەویش بۆ وەدەستهێنانی ئەو شتە دەچەمێتەوە.

وایە.

ئەی نەویستن، حەزنەکردن و ئارەزوونەکردن چین؟ ئایا ئەمانە دژەکان نین، کە دەروون لە ڕێگەیەوە نایەوێت شتێکی هەبێت و خۆی بە خاوەنی ناکات؟

هەڵبەتە.

ئایا ئەمە نامانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی چەند ئارەزوویەک هەبن لە هەموویان دیارتریش برسێتی و تینوێتی بن؟

وایە.

یەکەمیان (ئارەزووە) لە خواردن و دووەمیان لە خواردنەوە؟

بەڵێ.

سەبارەت بە تینوێتی ئایا بۆ یەک بابەتی ئارەزووەکەیە؟ بۆ نموونە کاتێک (کەسێک) تینوی دەبێت ئارەزووی ئاوی سارد یان گەرم، کەم یان زۆر یا بەکورتی چ جۆرە بابەتێکی (خواردنەوە) دەکات؟ ئایا لە کاتی گەرماییدا دەروون ئارەزووی ئاوی سارد و لە سەرماشدا ئاوی گەرم دەکات؟ کە زۆر تینو بوو حەزی لە ئاوی زۆرە و کەمیش حەزی لە ئاوی کەمە؟ هەمان کات، خودی تینوێتی بێجگە لە خواردنەوە، یان برسێتی، بێجگە لە خواردن بۆچی دیکە نییە. بەمجۆرە هەر یەکێک لە ئارەزووەکان بۆ بابەتێکی سروشتیە و ئارەزووش بۆ شتێکی دیاریکراو خراوەتە سەری. کەوابوو ڕێگە نادەین کەسێک سەرمان لێ بشێوێنێت و بڵێت ئارەزووی خواردنەوە و خواردن بۆ خواردنەوە و خواردنی چاکە. ئەمەش لەوێوە هاتووە، گوایە هەموو کەسێک ئارەزووی شتی چاکە و مادامەکی تینوێتیش ئارەزووە، ئەوا دەبێت ئارەزووکردن بێت بۆ خواردنەوەی چاک38.

هەموو ئارەزووەکان وەکو یەکن. ئەوەی بەم جۆرە باسی دەکات ڕاست بۆ کێشەکە چووە. بەڵام وا بۆی دەچم ئەو بابەتانەی هەندەکین

پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. ئەوانەی بە تەنیا خۆیانن پەیوەندییان بە خۆیانەوە هەیە.
من تێناگەم.
دەزانیت، ئەو گەورەترە دەبێت لە شتێکی دیکە گەورەتر بێت؟
هەڵبەتە. کەمتریش؟
بەڵێ.
بەڵێ.
جارێک گەرەترە لە بچووکترەکە؟ یان گەورەتر دەبێت لەوەی بچووکترە؟
بەدڵنیاییەوە.
ئایا ئەمەش بۆ ئەو شتانەی کەم و زۆرن، دوو قات بەرانبەر و نیوەن، گرانتر و سوکترن، خێراتر و هێواشترن، گەرم و ساردن و هەموو شتەکانی دیکەش نابێت؟
بێگومان.
ئەی جۆرەکانی زانین؟ ئەمەیان بەسەردا ساخ نابێتەوە؟ زانین زانینی ئەو شتەیە، کە فێری دەبین. زانینێکی تایبەت سەر بە بابەتێکی تایبەتە. بۆ نموونە، زانین لەبارەی تەلارسازییەوە لە زانینەکانی دیکەوە جیاوازەو بە زانینی تەلارسازی دادەنرێت.
هەڵبەتە.
ئایا هۆی ئەمە جیاوازی زانینە؟
بەڵێ.
لەبەرئەوەش نییە، کە پەیوەندی بە شتێکی تایبەتیەوە هەیە و ئەو پەیوەندییە دەیکات بە زانینێکی تایبەت؟ ئایا ئەمە بۆ هەموو جۆرەکانی زانین ڕاست نییە؟
ڕاستە.
مەبەستم ئەمە بوو، هیوادارم ئێستا تێبگەیت. من گوتم هەموو شتەکان پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. ئەوانەی بە تەنیا خۆیانن پەیوەندییان بە خۆیانەوە هەیە. بۆ نموونە زانیاری لەبارەی تەندروستی، یان نەخۆشییەوە تەندروستبوون و نەخۆشکەوتن نییە. زانیارییمان لەبارەی چاکە و خراپەوە نابێت بە چاک و خراپ. مەبەستم ئەوەیە

کاتێک زانین لەبارەی شتێکەوە دەبێت بە زانین، ئەو شتەش تایبەت و هەندەکی بێت، ئەویش دەبێت بە زانینێکی تایبەت و هەندەکی. ئەمەش دەیکات بە زانینێکی تایبەتمەند.

من تێدەگەم. ئەوە ڕاستە.

ئایا تینوێتی پەیوەندی بە شتێکەوە نییە؟

پەیوەندی بە خواردنەوەوە هەیە .

کەوابوو تینوێتی تایبەت پەیوەندی بە خواردنەوەیەکی تایبەتەوە هەیە، بەڵام تینوێتی بۆ زۆری و کەمی، چاکی و خراپی نییە تەنیا بۆ خواردنەوەیە.

بەتەواوی وایە.

دەروونێکی تینو، بێجگە لە خواردنەوە، ئارەزوویەکی دیکەی نییە و ئەو ئارەزووە بەرەو بابەتەکەی پاڵی پێوە دەنێت. بەدڵنیاییەوە. ئەگەر ڕێگرێکی هەبێت هەوڵی پەلاماردان بۆ شکاندنی تینوێتیەکەی نادات؟ ئێمە گوتمان، ئەو بەشە لە یەک کاتدا بە دژەکەیدا ناڕوات.

بەڵێ، ناڕوات.

بەمجۆرە، هەڵەیە بڵێین، تیرهاوێژێک لە کاتی تیرهاویشتندا لە یەک کاتدا ڕووی دەستیشی لە خۆیەتی. دەتوانین بڵێین، بە دەستێک تیرەکەی دەهاوێت و دەستەکەی دیکەشی ڕووی لەوە.

بەتەواوی وایە.

ئایا ڕاست نییە بڵێین هەندێکجار مرۆڤی تینو نایەوێت ئاو بخواتەوە؟

ڕاستە، ڕوودەدات.

چییان لەبارەوە دەگوترێت؟ ئایا شتێک لە دەروونیاندا نییە، کە ئارەزووی ئاو خواردنەوەیان لا دروست دەکات و شتێکی دیکەش ڕێگەیان لێ دەگرێت؟

وای بۆی دەچم.

ئایا ڕێگرەکە ئاکامی ژیری و بیرکردنەوەو ئارەزووی خواردنەوەکەش هەستکردن و نەخۆشی نییە؟

وادیارە.

باشترە ئەوانە بە دوو بەشی جیاواز دابنێین. ئەو بەشەی لە

دەروونا ژیری و بیرکردنەوەی لێوە هەڵدەقوڵێت هۆشە. بەشەکەی دیکەش سەرچاوەی حەز، برسێتی، تینوێتی، هەڵچوون و چێژە و بە ئارەزوو ناوزەدی دەکەین. بەڵێ، ئەوە کارێکی ژیرانەیە.

ئەم دوو بەشەی دەروون لە یەکدی جیا دەکەینەوە. ئەو بەشەی پێی دەوترێت گیان سەرچاوەی توڕەبوونە. ئایا لەم دوو بەشە دەچێت؟

لە ئارەزوو دەچێت.

بەڵام شتێکم بیستوە بۆ ئەم باسە دەگونجێت. لێونتیۆسی کوڕی ئەگلیون بە پیرایۆسەوە بە ژێر دیوارەکەدا بەرەو ژوور دەڕۆیشت و لاشەی مردووەکانی لەبەر پێی جەلادەکەدا بینی. ئەو حەزی دەکرد تەماشای لاشەکان بکات، بەڵام زۆری پێ ناخۆش بوو. لەبەرئەوە ڕووی خۆی وەرگێڕاو تەماشای نەکردن. بۆ ماوەیەک لەگەڵ خۆیدا لە ناوەوە مشتومڕی بوو. دەستەکانی خستە سەر چاوی، بەڵام ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بوو. دەستەکانی لەسەر چاوی لابرد و تەماشای لاشەکانی کرد و گوتی: بەدوای خۆتاندا بگەڕێن ئەی خراپەکارەکان، جوانی ئەم ناوەتان شاردۆتەوە.

من خۆم ئەم چیرۆکەم بیستوە.

ئەوە دەسەلمێنێت هەندێکجار توڕەیی دژی ئارەزوو شەڕ دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێکجار دەبینین ئارەزووەکان بەپێچەوانەی هۆشەوە دەجووڵێنەوە و ئەو کەسە شەرمەزار دەکەن توڕە دەبێت. لەنێو ئەم جەنگە دەروونیەدا هۆش و گیان (دژی ئارەزوو) یەک دەگرن، بەڵام لەوانەیە نەبینیت گیان دژی هۆش لەگەڵ ئارەزوودا یەک بگرن و ڕێگری بن.

نا، من نەمبینیوە.

چی ڕوودەدات کەسێک بیر لەو کارە خراپە بکاتەوە، کە بەجێی هێناوە؟ ڕاست نییە ئەو کەسە چاک بێت، کە کەمتر هەست بەوە بکات کەسێکی دادوەر زوڵمی لێ کردووەو ئازاری داوە و هەڵنەچێت؟

ڕاستە.

چی دەبێت لە جێگەی ئەمە بگاتە ئەو باوەڕەی کەسێک زوڵمی لێ کردوە؟

ئایا گیانی لە ناوەوە ناکوڵێ و توڕە نابێت؟ ئایا تاکو ئەو کاتەی

سەردەکەوێت تورە بوونەکەی بەردەوام نابێت؟ تاکو نەیباتەوە، یان نەمرێت لایەنە چاکەکەی وەکو سەگ و شوان لەگەڵیا نابێت؟

گیان بەو جۆرەیە. هەروەها لە شارەکەدا یاریدەدەرەکانمان، وەکو سەگ بۆ فەرمانڕەواکان دانا، کە ئەوانیش، وەکو شوانن بۆ شارەکە.

تۆ چاک لە مەبەستەکەم تێدەگەیت. گوێ لەمەش بگرە.

چی؟

چیەتی ئەو بەشەی بە گیانمان دانا لەوە دەچێت جیاوازتر بێت لەوەی باسمان کرد. ئێمە لە پێشتر گیانمان بە شتێک دانا، وەکو ئارەزوو بێت و ئێستا نکوڵی لێ دەکەین، چونکە لەنێو جەنگە دەروونیەکەدا گیان زۆرتر خۆی لەگەڵ هۆشدا ڕێک دەخات.

بەتەواوی وایە.

ئایا لە هۆشەوە جیاوازە یان هەردووکیان یەک شتن؟ ئایا لەنێو دەروونـدا دوو بـەش؛ هـۆش و ئـارەزوو هـەن یان سێ بـەش؟ یان دەروونیش بەشێوەی دانیشتووانی نێو شارەکەمان؛ بازرگانەکان و سەربازەکان بەئەنقەست پێکەوە بە یاریدەدەری هۆش دانـراون و پەروەردەیەکی خراپیش گەندەڵی نەکردوون؟

دەبێت بەشی سێیەم بێت.

بەڵێ. بەمەرجێک جیاوازییەکەی لە هۆشەوە بسەلمێنن.

سەلماندنی جیاوازییەکەی (لە هۆشەوە) دژوار نییە. تەنانەت لە منداڵیشدا گیان بەئاسانی لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونەوە دەبینرێت، بـەڵام زۆر کـەس، کـە گـەورە دەبـن پێوانە هۆشەکییەکانیان تێدا دەردەکەوێت.

چاک بۆ کێشەکە چوویت. ئەمە لەنێو ئاژەڵەکانیشدا هەیە. هۆمیرۆس ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت، کە دەڵێت: "سنگی خۆی کوتا و لەگەڵ دڵیا کەوتە دوان". ئەوەی لێرەدا هۆمیرۆس ئاماژەی بۆ دەکات ئەو بەشەیە پێوانەی بۆ چاکە و خراپە هەیە. جیاوازە لەو بەشەوە، کە تورە دەبێت و پێوانەشی نییە.

ئەوە ڕاستە.

ئێمە، لێرەدا، ڕێگاکەمان دۆزیوەتەوە و لەسەر ئەوەی چەند چینمان لە شارەکەدا هەبێت ڕێکەوتووین. دەروونیش بەقەد ژمارەی چینەکان

بەشی تێدایە.

ڕاستە.

کەوابوو، ڕاستە بڵێین، ئەو تاکەی زانایە لە شارەکەشدا (چین) و جێگەی خۆی هەیە.

ئەوە ڕاستە.

ئایا کەسێکی ئازاو قارەمان بەمجۆرە نییە؟

پێویستە بەمجۆرە بێت .

بێجگە لەمە، گلاوکۆن، من دەڵێم ئەو مرۆڤە دەبێت وەکو شارەکەمان دادوەر بێت.

ئەوەش پێویستە.

لەبیرمان ناچێت.

پێویستە بزانین، کە هەرکەسێک لە ئێمە بەگوێرەی بەشە زاڵبووەکەی دەروونی کار بکات دادوەر و چاکە.

هەڵبەتە وایە.

کەوابوو، باشتر نییە بەشی هۆشەکی لەبەرئەوەی زانا و داهاتووناسە نوێنەرایەتی دەروون بکات و ببێت بە فەرمانڕەوا و گیانیشی ملکەچی فەرمانەکانی بێت؟

بەدڵنیاییەوە.

ئایا تێکەڵکردنی مۆسیقا و هۆنراوە لەلایەک و وەرزش لەلایەکی دیکەوە هاودەنگی لەنێوان دوو بەشەکەدا دروست ناکات؟ بەشی هۆشەکی بە وشەی جوان پەروەردە ناکات و چیرۆکە خەمڕەوێنەکان هێمنی ناکەنەوە؟ بەتەواوی وایە.

پاش پەروەردەکردنی ئەم دوو بەشە بەمجۆرە فێری دەسەڵاتگرتن بەسەر ئارەزوودا دەبین، کە بۆ پارەپەیداکردن گەورەترین و چاوچنۆکترین بەشی دەروونە. سەرپەرشتی دەکەین تاکو خۆی بەڕادەیەکی زۆر بە چێژەوە ماندوو نەکات. ئەوەندەش گەورەو بەهێز نەبێت ڕێگە لە هەڵسوڕانی کارەکان بگرێت. ڕێگە نادەین ئەو بەشەی بۆ فەرمانڕەوایی دانەنراو دەسەڵات وەرگرێت.

ڕاستە.

ئایا ئەم دوو بەشە لە پاراستنی دەروون و لەشدا دژی دوژمنەکانی

دەرەوە کارێکی چاک ناکەن؟ هۆش بە نەخشەی چاک هەڵدەستێت و گیانیش قارەمانانە دەجەنگێت و شوێن بڕیاری پێشەواکەیان دەکەون.
ئەوەش ڕاستە.
بە دیدی من، لەبەر بەشی گیانە لە دەروونەدا خۆڕاگرێک لە ئاستی ئازار و خۆشیدا بە ئازای دادەنێین و هۆشی بەیانی ئەو شتانە دەکات، کە دەبێت لێیان بترسێت، یان نا.
ڕاستە.
لەبەر ئەو بەشە بچووکەش، کە بەیانەکە دەردەکات زانیاری لەبارەی کارە سوودبەخشەکانەوە بۆ دەهێنێت، ئێمە بە (هۆش) ناوزەدی دەکەین.
بەتەواوی وایە.
ئایا لەبەر هاودەنگی ئەم سێ بەشەی دەروون نییە کەسێک دەتوانێت ژیانێکی مامناوەندی هەبێت؟ فەرمانڕەواو فەرمانڕەواییکراوەکان دەگەنە ئەو ئاکامەی دژی ئەو شەڕ نەکەن؟
ژیانی مامناوەندێتی بۆ تاکە کەس و شارەکەش بەو جۆرەیە.
کەسێکیش بەمجۆرەی باسی دەکەین دادوەرە.
بەڵێ، پێویستە دادوەر بێت.
ئایا دادوەری لە ئێمەدا لە دادوەری نێو شارەکەوە جیاوازە؟
من بە جیاوازیان دانانێم.
ئەگەر گومانمان لەمە هەبێت دەتوانین بە گەڕانەوە بۆ کێشەکان لەناویان بەرین.
کام کێشە؟
بۆ نموونە، ئەگەر بڵێین کەسێک بە سروشت و پەروەردەکردن، وەکو شارەکەی ئێمەیەو هەندێک زێڕ و زیوی دزیوە. کێ بۆی دەچێت بێجگە لەو کەسەی وەکو ئەو نییە ئەو کارەی کردبێت؟
کەس.
ئایا هیچ پەیوەندییەکی بە چەتەی پەرستگاکانەوە، دزەکانەوە، ئەوانەی خیانەت لە هاوڕێکانیان دەکەن، یان خیانەت لە شارەکە دەکەن هەیە؟
نەخێر.

هەروەها بۆ سوێندخواردن و ڕێکەوتنیش، جێی بڕ وا نییە؟

چۆن دەبێت؟ زیناکردن، ڕێزنەگرتن لە دایک و باوک، فەرامۆشکردنی خوداوەندیش زۆرتر لە ڕیزی ئەو جۆرە هەڵوێستە دادەنێت. لەگەڵ هەموویاندا دایدەنێم.

ئایا هۆکەی ئەوە نییە، کە هەر بەشە لە دەروون بە کاری خۆی هەڵناسێت؟

بەڵێ، ئەوە هۆیە.

بێجگە لەم هێزە، وەکو هۆ، لەنێو خەڵکدا و لە شارەکە بۆ هۆیەکی دیکە بۆ دادوەری دەگەڕێیت؟

بێگومان نەخێر.

ئەو خەونەی لە سەرەتای دامەزراندنی شارەکەمان لەبارەی بنەڕەت و شێوازی دادوەرییەوە هەمان بوو ئێستا بە یاریدەی خوداوەند هێنامانە دی.

بەتەواوی وایە.

بێگومان، گلاوکۆن، ئەو بنەمایەی دامان نا، کە دروستە، ئەو کەسەی بە سروشت پینەچییە و کاری پینەچێتی بکات، ئەوەی بە سروشت دارتاشە و دارتاشی بکات بەمجۆرە بۆ کەسانی دیکەش وێنەیەکە لە دادوەری. لەبەرئەمە سوودبەخشە.

وادیارە. لەڕاستیدا دادوەری بەمجۆرەیە. بەهەرحاڵ، پەیوەندی بە ناخی کەسەکانەوە هەیە، بەوەی، کە ئەو کەسە خۆیەتی و خاوەنی ئەو شتەشە، کە (بە سروشت) پێی دراوە. دادوەر ڕێگە نادات بەشێکی (بوونی) کاروباری بەشێکی دیکە بەڕێوە بەرێت، یان کارو ئیشی بەشەکان تێکەڵاو بن. ئەوەی بۆ ئەو دانراوە ڕێکی دەخات و سەرپەرشتی دەکات. خۆی ڕێک دەخات و هەر سێ بەشەکەی دەروونی، وەکو سێ جۆری نۆتەی مۆسیقا بەرز و نزم و مامناوەندی بەگوێرەی پێوەرەکە هاودەنگ ڕیز دەکات. بەمجۆرە کارەکانی بەئاکام دەگەیەنێت. لە هەموو کارەکاندا؛ بازرگانی، بایەخدان بە لەش، کاری ڕامیاری، یان پیشە تایبەتەکان خۆی دادوەرانە هەڵسوکەوت دەکات و بە زانیارییەکی تەواوەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. لەو باوەڕەدایە ئەو کارانەی هاوئاهەنگیەکەی ئەو دەشێوێنێت نادادوەرانەیە. ئەو زانینەی

پشتگیری (نادادوەرییەکەش) دەکات نەزانینە. سوکرات، ئەمە بەتەواوی دروستە.

کەوابوو، ئەگەر توانیبێتمان دادوەر، شارێکی پڕ داد و دادوەریمان دۆزیبێتەوە ئەوەی باسی دەکەین درۆ نییە. نا، درۆ نییە.

پێویستە.

باشە، ئێستا بەدوای نادادوەرییدا دەگەڕێین.

بێگومان.

بەدڵنیاییەوە، نادادوەری جۆرێکە لە جەنگی ناوخۆ لەنێوان سێ بەشەکانی (دەروون‌دا). تێکەڵکردنی ئیشوکاری بەشەکانە و یاخیبوونی یەکێک لەو بەشانە دژی دەروون تاکو ئەو فەرمانڕەوایی بەشەکانی دیکەش بکات. یاخیبووەکە بە سروشت کۆیلەیە، بەشەکەی دیکەش بە سروشت لە چینی فەرمانڕەوایە. سەرلێشێواندنی ئەم بەشانە نادادوەری، بەرەڵایی، ترسنۆکی و نەزانینە، یان بە کورتیەکەی لە یەک وشەدا خراپەیە.

ئەوانە خراپن.

ئەگەر (واتاکانی) دادوەری و نادادوەری ئاشکرا بێت لە جیاوازیی نێوان کارێکی دادوەرانە و نادادوەرانەش تێدەگەین.

چۆن؟

کاری دادوەرانە و نادادوەرانە، وەکو تەندروستی و نەخۆشین بۆ لەش.

لە چ ڕوویەکەوە؟

شتی باش تەندروستی چاک دەهێننە کایەوە و خراپیش نەخۆشی.

بەڵێ، وایە.

ئایا کاری دادوەرانە، دادوەری و نادادوەرانەش نادادوەری لێوە پەیدا نابێت؟

پێویستە وابێت.

هاوئاهەنگی توخمەکانی لەش دەبێتە هۆی تەندروستمەندی. بەپێچەوانەی ئەم هاوئاهەنگییە سروشتیەشەوە، نەخۆش پەیدا دەبێت.

ڕاستە.

کەوابوو، سەقامگیرکردنی دادوەری لە هاوئاهەنگی بەشەکانی دەروونداا نییە؟ نادادوەرییش شێواندنی ئەم پەیوەندییە نییە؟
دروستە.
وا دەردەکەوێت چاکە جۆرێک بێت لە تەندروستی و بارودۆخی باش و خۆشگوزەرانی دەروون. خراپەش نەخۆشی و بارودۆخی خراپ و زەبوونی دەروون بێت.
ئەوە ڕاستە.
ئایا ڕێگەی چاکەکردن لە ژیاندا نابێتە هۆی چاکە و خراپیش خراپە؟
وایە.
ئێستا دێینە سەر ئەو خاڵەی بزانین، داخۆ کارێکی دادوەرانە ژیان سوودبەخشتر دەکات، گرنگیش نییە ئەو کەسە بناسین.
سوکرات، ئەم لێکۆڵینەوەیە پاش تێگەیشتنمان لە (واتاکانی) دادوەری و نادادوەری بۆ من، گاڵتەبازییە. تەنانەت ئەگەر کەسێک پارەیەکی زۆری هەبێت، خواردن و خواردنەوەی زۆری لەبەردەستدا بێت، هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی بۆ فەرمانڕەوایی مسۆگەر کردبێت، مادامەکی سروشتی لەشی شێواوە ژیانی بێکەڵکە. ئەگەر ئەو کەسە هەموو شتێک بۆ سەقامگیرکردنی دادوەری بکات و خۆی لە نادادوەری بپارێزێت، دەروونی شێوابێت چۆن دەژی؟
بەڵێ، گاڵتەبازییە. لەگەڵ ئەمەشدا واز لەوە ناهێنین، کە پاش ڕێگەبڕینێکی دووردرێژ پێی گەیشتووین. بێگومان، هەرگیز ئەو کارە ناکەین.
کەوابوو، بزانە چەند فۆرمی خراپە هەن، کە من دەمەوێت لێیان بکۆڵمەوە.
من شوێنت دەکەوم، باسیان بکە.
لە گۆشەنیگایەکەوە وا دەردەکەوێت لە گفتوگۆکەماندا تەنیا جۆرێک چاکە و خراپەی لە ژمارەبەدەر هەبن، کە پێویستە چوار لەو فۆرمە خراپانە باس بکەین.
چۆن؟
وا دەردەکەوێت بەقەد ژمارەی دەستوورە ڕامیارییەکان جۆری

دەروونیش هەبێت.

چەند؟

پێنج جۆر دەستوور، پێنج جۆر دەروون.

ئەوانە چین؟

یەکێک لەوان ئەو دەستوورەیە ئێمە باسمان کرد. ئەویش دوو ناوی هەیە. ئەگەر لەنێو فەرمانڕەواکاندا کەسێک لەنێویاندا فەرمانەکانی بەرقەر بکرێت بە پاشاگەردانی ناوزەد دەکرێت. لە یەک کەسیش زۆرتر فەرمانڕەوایی بکەن دەبێت بە ئەرستۆکراسی.

ڕاستە.

کەوابوو، ئەمە جۆرێکە لە دەستوور. گرنگ نییە یەک کەس یان چەند کەسێک فەرمانڕەوایی بکەن. ئەگەر پەیڕەوی بەرنامەی پەروەردە و فێرکردنەکەمان بکرێت، یاسا سەرەکییەکان شارەکە ناگۆڕێت.

دەشێت نەگۆڕێت.



ئەمە ئەو جۆرە شارە و دەستوورە و مرۆڤەیە من بە چاک و ڕاستیان دادەنێم. ئەگەر ئەمە جۆرێکی ڕاست بێت، جۆرەکانی دیکە بە خراپ دادەنێم. خراپییەکەشیان چوار جۆرن.

ئەویش پرسی و گوتی چ جۆرێکن؟

من ویستم ناویان بهێنم و ڕوونی بکەمەوە چۆن لەنێو یەکدیدا سەرهەڵدەدەن، بەڵام پۆلیمارکۆس، کە دوورتر لە ئەدیمەنتۆس دانیشتبوو دەستی خستە سەرشانی پۆلیمارکۆس و بە چرپە شتێکیان بە یەکدی گوت. ئێمە تێنەگەیشتین چیان گوت، تەنیا ئەوە نەبێت، کە "ڕێگەی بدەین باسی بکات".

ئەدیمەنتۆس بە دەنگێکی بەرز گوتی: ڕێگە نادەین بڕوات.

منیش گوتم: ڕێگەی چی نادەیت بڕوا؟

گوتی: ڕێگەی تۆ نادەم.

بۆچی؟

بە بیروڕای ئێمە تۆ پات لێ درێژ کردووە و هەڵتخەڵەتاندووین. ناتەوێ باسی بەشێکی گرنگی کێشەکە بکەیت. تۆ ئەو بەشە بە گرنگ دانانێیت. وا دەزانیت ئێمەش نازانین. ئەویش سەبارەت بە ژنەکان و منداڵەکانە. هەموو کەسێک دەزانێت پێویستە هەموو شتێک لەنێوان هاوڕێکاندا هاوبەش بێت.

ئەدیمەنتۆس، تۆ ئەمە بەڕاست نابینیت؟

بەڵێ، ڕاستە، بەڵام ئەم "ڕاست" بوونە، وەکو ئەوانی دیکە پێویستە ڕوون بکرێتەوە. تۆش نابێت ڕەچاوی نەکەیت. زۆر چاوەڕوان بووین کێشەی منداڵبوونمان بۆ باس بکەیت. چۆن لەدایک دەبن و پەروەردە دەکرێن و هاوسەرییبوونی هاوبەش چۆنە.

بە بۆچوونی ئێمە، ئەم کێشەیە کارێکی گەورە دەکاتە سەر ڕاستی و ناڕاستیی دەستوور. پێش ئەوەی ئەم کێشانە ساخ بکەیتەوەو بڕیاریان

لەسەر بدەیت باسی جۆرێکی دیکەی دەستوورمان بۆ مەکە. ئێمە ڕێگەت نادەین، تاکو باسی نەکەیت.
گلاوکۆن گوتی: منیش لەگەڵ ئێوەم.
تراسیماکۆس ڕووی کردە سوکرات و گوتی: ئەمە بڕیاری هەمووومانە.
من گوتم، بۆچی منتان ڕاوەستاند؟ من خۆشحاڵ بووم بەوەی لەسەر باسەکە ڕازین. ئێوە نازانن چی دیکە بۆ خستنە سەر مشتومڕەکەمان پێویستە. من نەمویست خۆمان تووشی ئەم گرفتە بکەین.
تراسیماکۆس گوتی: ئێمە بەدوای زێڕدا دەگەڕێین، یان گوێ لە باسەکەتان بگرین؟
من گوتم، دووەمیان، بەڵام بە ڕێکوپێکی.
گلاوکۆن ڕووی لە سوکرات کرد و گوتی: کارێکی بەجێیە حەز بکەین گوێمان لە باسەکە بێت. نیگەران مەبە. خۆت بێزار مەکە. باشترە بە درێژی بۆچوونەکەتمان لەسەر هاوبەشیکردنی ژنان و منداڵە ساواکان، تاکو کاتی فێرکردنیان دەستپێدەکات، کە کاتێکی دژوارە چۆن پەروەردە دەکرێن بۆ ڕوون بکەیتەوە.
ئەمە بابەتێکی ئاسان نییە. لە بابەتەکەی پێشوو زۆرتر تووشی کێشەمان دەکات. لەوانەیە خەڵکی باوەڕ بە بۆچوونەکەی ئێمە نەهێنن و بە گونجاوی دانەنێن. لەبەرئەمە لە باسکردنی دوودڵ بووم.
دوودڵ مەبە. بیسەرەکانی تۆ لاسار و بڕوانەکەر و ڕقاوی نین.
ئایا بەم وشانە هانم دەدەیت باسەکەم دەستپێبکەم؟
بەڵێ، دەمەوێت هانت بدەم.
باشە، هاندانەکەت بەجێیە. ئەگەر زانیاریم لەبارەوە هەبێت بە دڵنیاییەوە لەنێو کەسانی لێزان و هاوڕێی خۆشەویستدا دەدوێم، بەڵام وەکو ئێستای من کەسێک نەزانێ و بەدوای ڕاستیدا بگەڕێت ترسناکە. من لەوە ناترسم گاڵتەم پێبکەن و بە ساویلکەم دابنێن. لەوە دەترسم ئەگەر نەمتوانی ڕاستی بدۆزمەوە، نەک خۆم، بەڵکو هاوڕێکانیشم بەرەو ڕووخان دەبەم. لەبەرئەمە، بۆئەوەی بڵێم تاوانی کوشتنی کەسێک بەبێ حەز و ئارەزووی خۆت کەمترە لەوەی خەڵکی بەهەڵە بەرەو چاکە و دەزگاکانی دادوەرییدا بەرێت. لەبەردەم (ئەدرستیا)دا

دەچەمێمەوە. ئەم کارە لەگەڵ دوژمندا نەک لەگەڵ هاوڕێکانتا چاکە بکرێت.
گلاوکۆن بە پێکەنینەوە گوتی: ''باشە، سوکرات، هەر کاتێک ناڕاستیت بە ئێمە ناساند ئازادت دەکەین. لە تاوانەکەت خۆش دەبین. دەستەکانت بە پیس دانانێین و ئێمەش هەڵناخەڵەتێنیت. لەبەرئەمە ئازایانە بدوێ. من ئازایانە دەدوێم. بەگوێرەی یاسا، ئەوەی کەسێک بەئەنقەست نەکوژێت ویژدانی تاوانباری ناکات. ئەمە بۆ منیش دەبێت''.
کەوابوو، باسەکەت دەستپێبکە.
من بۆ باسەکانی پێشوو دەگەڕێمەوە و بە ڕێز ئاماژەیان بۆ دەکەم. پاش باسکردن لەسەر درامای پیاوان دێمە سەر درامای ژنان.
بۆ ئەو پیاوانەی (نێرینە) لەدایک دەبن و پەروەردە دەکرێن، بە دیدی من، هیچ ڕێگەیەک بۆ پەیوەندییان لەگەڵ ژن و منداڵدا لەوە باشتر نییە، کە ئێمە باسمان کردووە. هەروەها، هەوڵمان دا ئەم پیاوانە بکەین بە پاسەوانی مێگەلەکەمان.
بەڵێ.
پێویستە شێوەی لەدایکبوون و پەروەردەکردنەکەیان لەگەڵ ئەم کارەدا ڕێک بکەوێت.
چۆن؟
بەم شێوەیە: لەو باوەڕەدای ژنە هاوسەرەکانی پاسەوانەکان، وەکو پاسەوانەکان بەهەمان کاروبار هەستن و لەگەڵیاندا ڕاو بکەن؟ یان ئەو ژنانە لەبەر لاوازی و بێ دەسەڵاتیان لە ماڵەوە دانیێن منداڵ دروست بکەن و بەخێویان بکەن. پیاوەکانیش پاسەوانێتی بکەن و دانیشتووانی نێو شارەکە بپارێزن؟ بێجگە لەوەی پیاو لە ژن بەهێزترە، پێویستە هەمان شتیان هەبێت. ئایا ئاژەڵەکان بەبێئەوەی یەک جۆر پەروەردەیان بۆ دابنێیت، دەتوانن بە یەک جۆر کار هەستن؟ نا، ناتوانن.
کەوابوو، ئەگەر ژنان بە کاری پیاوان هەستن، پێویستە یەک جۆر پەروەردەیان هەبێت.
بەڵێ.
ئێمە مۆسیقا، هۆنراوە و وەرزشمان بۆ پیاوان دانا.

بەڵێ.

پێویستە ئەمانە فێری ژنانیش بکرێت تاکو پیاوان بەکاریان بهێنن.

وادیارە.

ئەوەی دەمانەوێت بیکەین لەگەڵ نەریتدا ڕێک ناکەوێت. لەبەرئەمە، گاڵتەی پێ دەکرێت.

بەدڵنیاییەوە.

چ شتێک (لەم بەرنامەیەدا) زۆر جێگەی گاڵتەیە؟ ئەوە نییە، کە ژنانیش بە ڕووتـی لەگەڵ پیاواندا وەرزش دەکـەن؟ ئەمەش تەنیا بۆ ژنی گەنج نییە، ژنە پیرەکانیش، وەکو پیاوە پیرەکان دەچن بۆ وەرزشگا. لەشیان چرچەو تەماشاکردنیان خۆش نییە، بەڵام حەزیان لە وەرزشکردنە.

بەڵێ، ئەوە جێگەی گاڵتەبازییە.

بەڵام نابێت لەم گۆڕانکارییانەدا، لە مۆسیقا، هۆنراوە و وەرزش، هەروەها لە ئەسپسواری و چەکهەڵگرتندا لە گاڵتەی خەڵکی بترسین.

تۆ ڕاست دەڵێیت.

ئێستا بەرەو لایەنێکی سەختتری باسەکە دەڕۆین. داوا لە خەڵکی دەکەین گاڵتە نەکەن و بە جیددی بڕواننە کێشەکە. نابێت لەبیریان بچێت، تاکو ماوەیـەک لەمەوبـەریش لای یۆنانیەکان (هـەروەهـا بەربەرییەکانیش) شـەرم بـوو پیاوێک بە ڕووتـی ببینرێت. کاتیک کریتیەکان و لەسیدامۆنیەنەکان وەرزشگایان کردەوە گاڵتەیان پێ دەکرا. وانەبوو؟

وابوو.

پاش ئەوەی دەرکەوت باشترە بە ڕووتی وەرزش بکرێت ئەوەی جێگەی گاڵتەبازی بوو لەبەرچاو ون بوو. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت هیچ شتێک بێجگە لە خراپە جێگەی گاڵتەبازی نییە. کەسێکی گەمژەش بەپێچەوانەی ئەمەوە بیر دەکاتەوە. نابێت گاڵتە بە شتی چاک و جوان بکرێت.

ئەوە بەتەواوی ڕاستە.

پێویست ناکات لەسـەر ئـەوە ڕێکـەوین، کە داواکارییەکانمان دەگونجێن یان نا؟ نابێت ڕێگە بدەین سەبارەت بە سروشتی ژن و

خەسڵەتە هاوبەشەکانی لەگەڵ سروشتی پیاودا بە گاڵتە، یان بە جیددی، پرسیارمان لێ بکرێت؟ هەروەها (ژنانی) نێو چ چینێکی کۆمەڵ جەنگیان پێ دەکرێت؟ ئایا ئەم سەرەتا باشە ئاکامێکی باشمان ناداتێ؟
هەڵبەتە.
پێویست دەکات لە جێگەی ئەو جۆرە کەسانە ئێمە ڕەخنەکان لە خۆمان بگرین و پرسیارەکانیان لە کەموکورتی بپارێزین؟
هۆیەک نییە ڕێگەمان لێ بگرێت.
با لە جێگەی ئەوان بڵێین: "سوکرات و گلاوکۆن، پێویست ناکات کەسانی دیکە گفتوگۆتان لەگەڵدا بکەن، چونکە لە سەرەتاوە، کە شارەکەتان دامەزراند ڕێکەوتن هەرکەسە بەگوێرەی سروشتی خۆی کاری بدرێتێ".
دڵنیام لەسەر ئەو خاڵە ڕێکەوتین.
"ئایا کارێکی شیاو نییە هەرکەسە و بەگوێرەی سروشتی خۆی کار بکات؟"
بەدڵنیاییەوە.
چۆن تۆ بەهەڵەدا ناچیت ئەگەر ژن و پیاو سروشتیان جیاواز بێت و هەمان کاریان بەسەردا بسەپێنیت؟ هیچ بەڵگەیەکت دژی ئەم ڕەخنەیە هەیە؟ من ئێستا (بەپەلە) وەڵامێکم نییە. داوای ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەی خۆمانت لێ دەکەم.
ئەمە و زۆر شتی دیکەش لە سەرەتاوە منیان لە باسکردنی (پەیوەندیی پیاوان) لەگەڵ ژنان و منداڵان و پەروەردەکردنیان دوودڵ کرد.
بەخوا، باسێکی ئاسان نییە.
ئاسان نییە. گرنگیش نییە دەکەویتە حەوزێکی بچووک، یان دەریایەکی گەورەوە. دەبێت بە مەلەکردن خۆت دەرباز بکەیت.
پێویستە.
پێویستە مەلە بکەین، خۆمان لە دەریای مشتومڕەکە ڕزگار بکەین. بەو ئومێدەوە بین دۆلفین، یان کەسێک دێت فریامان دەکەوێت.
دیارە.
باشە، وەرە. با بزانین چۆن خۆمان ڕزگار بکەین. ئێمە گوتمان

سروشتە جیاوازەکان کاری خۆیان پێ دەدرێتێ. سروشتی ژن و پیاویش جیاوازن. ئێستاش دەڵێین، ئەو سروشتە جیاوازانە یەک جۆر شێوەی ژیانیان دەدرێتێ. ئایا ڕەخنە لەم خاڵە ناگیرێت؟

بەتەواوی.

ها، گلاوکۆن، هونەری گفتوگۆکردن هێزێکی گەورەی هەیە.

بۆچی؟

چونکە زۆر کەس بەبێ خواستی خۆیان دژی ڕادەوەستن. وا دەزانن مشتومڕیان لەسەر نییە و تەنیا گفتوگۆیان کردووە. ناتوانن بەوردی بزانن چ فۆرمێکی وەرگرتووە. خۆیان تووشی ناکۆکییە زمانەوانیەکان دەکەن. ئەمە تووشی زۆر کەس دەبێت، بەڵام ئێمە تووشی نەبووین. وایە؟

زۆر کەس وایە. من هەست دەکەم، ئێمەش بەبێ خواستی خۆمان کەوتووینەتە نێو مشتومڕەکەوە.

چۆن؟

ئێمە ئازایانە و شەڕەنگێزانە بە وشەی ڕازاوەشەوە جەخت لەسەر ئەو یاسایە دەکەین، کە سروشتە جیاوازەکان کاری جیاوازیان هەیە، بەڵام شێوەی جیاوازییەکان و لێکچوونەکانمان دیاری نەکردووە.

نا، دیاریمان نەکردووە.

کەوابوو، لە خۆمان دەپرسین، سروشتی پیاوی سەرڕووتاوە و قژدرێژ وەکو یەکن، یان جیاواز. ئەگەر لەسەر جیاوازییان ڕێکەوتین و گریمان سەرڕووتاوەکە پینەچی بێت، ئەوا نابێت ڕێگە بە قژدرێژەکە بدرێت پینەچێتی بکات. ئەوە گاڵتەبازییە.

ئایا هۆی ئەم گاڵتەبازییە ئەوە نییە ئێمە بێئەوەی جەخت لەسەر هەموو جۆرە جیاوازی و لێکچوونەکان بکەین تەنیا ڕوومان لە یەک جۆر جیاوازی و لێکچوونی تایبەتی کردوە؟ مەبەستمان ئەوە بوو دەروونـی ژن و پیاوی پزیشک جۆرێک سروشتیان هەیە. وا بۆی ناچیت؟

بەڵێ، وا بۆی دەچم، بەڵام سروشتی پزیشک و دارتاش جیاوازن؟

بەتەواوی جیاوازن.

کەوابوو، ئەگەر بینیمان لە جۆرێک پیشە و شێوەیەکی تایبەتی

ژیاندا نێرینە لە مێینەوە جیاواز بوو داوای جیاوازییەک دەکەین، کە لە هەموویان شیاوتر بێت. ئەگەر جیاوازییەکە تەنیا لەوەدا بێت مێینە منداڵی دەبێت، ئەوا هیچ بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی جیاوازییان بەگوێرەی پاسەکەمان دانەمەزراندووە. ئیمەش واز لەو باوەڕە ناهێنین، کە پاسەوانەکان و ژنەکانیان هەمان جۆر پیشەیان بدرێتێ.

ڕاستە.

دواتر، هەر کەسێک وەکو ئێمە بیری نەکردەوە داوای لێ دەکەین لە چ ڕوویەکەوە لەسەر ئەو دەستوورەی لە شارەکەدا بەرقەرارە سروشتی ژن و پیاو لە یەکدییەوە جیا دەکاتەوە؟

ئەوە پرسیارێکی ڕەوایە.

بێگومان ئەویش، وەکو تۆ دەڵێت بەم کتوپڕییە وەڵامدانەوەکە ئاسان نییە، بەڵام پاش بیرکردنەوە دەستمان دەکەوێت.

بەڵێ، دەشێ بەم جۆرە وەڵام بداتەوە. پێویستە، داوای لێ بکەین شوێن ئێمە بکەوێت تاکو بۆی بسەلمێنین، کە بەڕێوەبردنی شارەکە لەلایەن ژنەوە ڕەوایە.

بێگومان.

وەرە، ئێمە دەڵێین، "وەڵاممان بدەرەوە: ئایا مەبەستت ئەوە نییە هەر تاکە بە سروشت بۆ کارێک ئامادەکراوە؟ تاکێک ئاسانتر لەوی دیکە فێر دەبێت؛ تاکێک پاش ڕاهێنانی کەم دەتوانێت ڕێگاکانی خۆی بدۆزێتەوە، تاکێکی دیکەش پاش ڕاهێنانێکی زۆر شتەکانی لەبیر دەچێتەوە و فێر نابێت؛ مێشکی تاکێک بۆ فێربوون لە مێشکی تاکێکی دیکە لایەقترە. وانیە؟ چی دیکە بێجگە لەمانە هەیە جیاوازیی نێوان سروشتی ئەوانەی بۆ کارێکی دیاریکراو دەگونجێن و ئەوانەی ناگونجێن دەستنیشان بکات؟

کەس لەو باوەڕەدا نییە شتێکی زیاتر هەبێت.

هیچ جۆرە کارێک هەیە لە ئەنجامدانیدا نێرینە لە مێینە پلە بەرزتر بێت؟ پێویست دەکات باسی تەونکردن، نان دروستکردن و سەوزەلێنان بکەین، کە مێینە تیایاندا لە نێرینە وەستاترە و بە پلەنزم دانانرێت؟ دروستە یەکێک لەو دوو ڕەگەزە لە هەموو کارەکاندا لەوی دیکە چاکترە. مێینەش لە نێرینە باشتر هەندێک کار بەجێ دەهێنێت.

بەگشتی بەو شێوەیەیە تۆ بۆی دەچیت.
کەوابوو، ژن ناتوانێت شار بەڕێوە بەرێت، چونکە ژنە و پیاویش پیاوە و بەمجۆرە سروشتی جیاوازیان بەسەردا دابەش کراوە. ژن، وەکو پیاو هەموو خەسڵەتەکانی هەیە، بەڵام لە هەموویاندا لە پیاو نزمترە.
بەدڵنیاییەوە.
پێویستە، هەموو کارەکان بدەینە دەست پیاو، ژنی لێ بێبەش بکەین؟
چۆن دەبێت؟ ئێمە دەڵێین، ژنێک بە سروشت پزیشکە، ئەوی دی پزیشک نییە. مۆسیقازانە، ئەوی دی مۆسیقازان نییە. بێگومان.
بەهەمان شێوە، ژنێک وەرزشزانە، یان جەنگاوەرە، ئەوی دی وانیە و حەزی لە وەرزش نییە.
وا بۆی دەچم.
لەسەروو ئەمەوە ئایا نابێت ژنێک فەیلەسووف بێت و یەکێکی دیکەش ڕقی لە فەلسەفە بێت؟ ژنێک ورەبەرز و ئازاو ئەوی دی ترسنۆک بێت؟
ئەوەش ڕاستە.
کەوابوو، دەگونجێت ژنێک بە سروشت پاسەوان بێت و ژنێکی دیکە وانەبێت. ئایا سروشتی پاسەوانێتی نەبوو کە پیاوی (لە شارەکەماندا) کرد بە پاسەوان؟
بێگومان.
لێرەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی ژن و پیاو بە سروشت بۆ پاسەوانێتی لە شارەکەماندا جیاواز نەبن. هەرچەندە  یەکێکیان بەهێز و ئەوی دی لاوازە.
وا دیارە. لێرەدا ئەو ژنانەی بە سروشت، وەکو پیاوە پاسەوانەکان توانای ئەم کارەیان هەیە لە شارەکەماندا دەچنە ڕیزی پیاوە پاسەوانەکانەوە.
بەدڵنیاییەوە.
ئایا نابێت بۆ ئەو ژنانەی هەمان سروشتی پیاویان هەیە، وەکو پیاو هەمان کارو پیشەیان بدرێتێ؟

پێویستە.

ئێمە بۆ خاڵەکەی پێشوومان دەگەڕێینەوە، کە گوتمان، ژنی پاسەوانەکان مۆسیقا و هۆنراوە بخوێنن و فێری وەرزش بکرێن.

بەتەواوی دروستە.

کەوابوو، ئێمە یاسایەک دانانێین نەتوانین بیچەسپێنین و باسەکەشمان حەزێکی ڕووت نییە. یاساکەمان بەگوێرەی سروشتە و ئەوەی دەمانەوێت دژی سروشت نییە.

دیارە.

ئێستا، مەبەستمان لەوەدا نییە، کە داواکارییەکانمان گونجاو و پەسەندکراو بن؟

بەڵێ.

نابێت بگەینە ئەو خاڵە هاوبەشەی داواکارییەکانمان شتێکی پەسەندکراون؟

ئاشکرایە.

پێویست دەکات بۆ ژنان و پیاوانی پاسەوان، کە هەردووکیان یەک جۆر سروشتیان هەیە، دوو جۆری جیاواز لە سیستەمی پەروەردە و فێربوونیان بۆ دامەزرێنین؟

نا.

تۆ سەبارەت ئەم خاڵە چ دەڵێیت؟

کام ؟

پیاوێک لە پیاوێکی دیکە چاکترە، یان بە دیدی تۆ هەموویان وەکو یەکن؟

بەدڵنیاییەوە، هەموویان وەکو یەک نین.

بە دیدی تۆ کێ لە شارەکەماندا چاکترە؟ ئەو پاسەوانەی ئێمە پەروەردەمان کردوون، یان پینەچییەک، کە خۆی فێری کارەکەی بووە؟

پرسیارەکەت سەیرە.

تێدەگەم. ئایا پاسەوانەکان لەنێو هاوڵاتیاندا چاکترین نین؟

دڵنیام چاکترینن.

ئەی ژنە پاسەوانەکان؟ لەنێو ژناندا چاکترین نین؟

چاکترینن.
چ شتێکی دیکە لە چاکترین ژن و پیاو، وەکو هاوڵاتی بۆ شارەکەمان باشترە؟
هیچ شتێک لەوە باشتر نییە.
ئایا مۆسیقا و هۆنراوە و وەرزش نین، کە ئەم (ژن و پیاوانە) پێدەگەیەنن؟
هەڵبەتە.
دەتوانین بڵێین یاساکەمان تەنیا گونجاو نییە، بەڵکو شتێکی پەسەندکراویشە.
بەڵێ.
کەوابوو، ژنانی پاسەوان لە مەشقکردن و وەرزشکردندا دەبێت خۆیان ڕووت بکەنەوە، چونکە ئەوان چاکەیان لەبەردایە نەک جلوبەرگ. دەبێت بچنە جەنگەوە و کاری پاسەوانێتی بکەن، بەڵام لەبەر لاوازیی هەندێک لە بەشی لەشیان کاری ئاسانیان پێ دەسپێرین. ئەو پیاوەی بەو ژنە ڕووتانەش پێدەکەنێت، کە خزمەتی شارەکە دەکەن، میوەی کاڵ دەخوات. نازانێت چی دەکات و بە چی پێدەکەنێت. گوتەیەکی چاک هەیە، دەڵێت: ئەوەی سوودبەخشە جوانە و زیانبەخشیش ناشرینە.
بەتەواوی دروستە.
دەتوانین بڵێین، خۆمان لەو ڕەخنەیە سەبارەت بە دانانی یاسا بۆ ژن دەرباز کردووە و لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشتینە ئەو بڕیارەی، مێینەو نێرینەی پاسەوان لە هەموو ڕوویەکەوە هاوبەشن. بۆچونەکەمان لەوێدا بەجێیە، کە دەڵێت، ئەمە سوودبەخش و کارێکی گونجاویشە. خۆمان لە شەپۆلی ڕەخنەیەکی بچووک دەرباز کردوە. ئەگەر تەماشای ئەمەیان بکەیت، (شەپۆلی) پێشوو بە گەورە دانانێیت.
بۆم باس بکە و منیش پێت دەڵێم، کامیان گەورەترە.
بە دیدی من، ئەم یاسایە لە دوا یاساوە دەردەچێت، کە دامان نا. ئەوانی دیکەش بەدوای ئەمدا دێن.
کام یاسایە؟
ئەم ژنانە بۆ هەموو پیاوەکانن. کەسیان بە تەنیا لەگەڵ هیچ پیاوێکدا هاوسەر نابێت. منداڵەکانیش بۆ هەموویانە. کەس نابێت منداڵی خۆی

بناسێت و منداڵیش دایک و باوکی ناناسێت.
ئەم شەپۆلە لەوەی پێشوو گەورەترە، چونکە گومان لەوە دەکرێت سوودبەخشیش بێت.
ئەگەر ئەمە بگونجێت گومانیش لە سوودبەخشینەکەی ناکرێت، بەڵام مشتومڕی زۆر لەسەر گونجاندنەکەی دەکرێت.
مشتومڕ لەسەر هەردوو لایەنەکەی دەکرێت.
مەبەستت ئەوەیە کەسانێکی دوو لایەن ڕەخنەم لێ دەگرن. ئەگەر تۆ لەو باوەڕەدا بیت داواکارییەکەم سوودبەخشە، ئەوا خۆم لە لایەنێکیان ڕزگار کردووە. دوایی مامەڵە لەگەڵ لایەنەکەی دیکە دەکەم.
چۆن خۆت دەرباز دەکەیت و بەرامبەر هەردوو لایەنەکە بە بەڵگەوە ڕادەوەستیت؟
باشە، کەوابوو، بە سزاکە ڕازیم. بەڵام وەکو ئەوانەی پشوو دەدەن و کارناکەن بە تەنیا بۆ پیاسەکردن و بیرکردنەوە دەڕۆن و خۆیان لە ماندووبوون دەدزنەوە. ئەم چاکەیەم لەگەڵدا بکە. گوایە ئەوەی دەیانەوێت بیدۆزنەوە، لەبەردەستدایە، پێویست ناکات خۆیانی بۆ ماندوو بکەن و تەمبەڵ دەبن. من لەم حاڵەتەدا دڵنەرمم و حەز دەکەم شێوەی جێبەجێکردنی داواکارییەکەم دوا بخەم. ئەگەر تۆ ڕێگەم بدەیت وا بۆی دەچین، کە (داواکارییەکەمان) بەجێیە و هەوڵ دەدەین بزانین چۆن فەرمانڕەواکان خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن. هەروەها نیشانی دەدەم، کە هیچ شتێک لەمە زۆرتر سوودی بۆ شارەکە و پاسەوانەکانمان نییە. من لەگەڵ تۆدا چارەی ئەم کێشانە دەکەم و دوایی وەڵامی پرسیارەکەی دیکە دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر تۆ ڕێگەم بدەیت.
ڕێگەت دەدەم، فەرموو لێکۆڵینەوەکەت بخەرە گەڕ.
من وا بۆی دەچم فەرمانڕەواکان و یاریدەدەرەکان ئامادەن فەرمان دەربکەن و پەیڕەویشی بکەن. لە چەند حاڵەتێکدا فەرمانڕەواکان خۆیان پەیڕەوی یاساکانمان دەکەن. لە حاڵەتی دیکەدا، لەو حاڵەتانەدا ڕێگەیان پێ دەدرێت خۆیان هەڵسوکەوت بکەن، بەگوێرەی شێوازی سیستەمەکەمان دەجووڵێینەوە.
وایە.
تۆ یاسادانەری شارەکە و ئەو ژنانەی سروشتی لێکچوویان لەگەڵ

پیاواندا هەیە هەڵدەبژێریت و لەگەڵ ئەو (جۆرە) پیاوانەدا دایان دەنێیت. لەبەرئەوە خانووی هاوبەشیان بۆ دروست دەکەیت و کەس ماڵی تایبەتی خۆی نابێت. هەموو پێکەوە دەژین و فێر دەبن. دڵنیام لەوەی حەز لە سێکسیش لەگەڵ یەکدی دەکەن. لەو باوەڕەدا نیت ئەمەش پێویست بێت؟

ڕاستە .

هەنگاوی دووەممان، دانانی یاسایە بۆ هاوسەریبوون. هاوسەریبوونی پیرۆزیش سوودبەخشە.

بەتەواوی دروستە.

سوودبەخشترین چۆنە؟ گلاوکۆن پێم بڵێ: تۆ تانجی و چەند باڵندەیەکی چاکت لە ماڵەوە ڕاگرتووە.

هیچ لەبارەی جووتبوونیانەوە دەزانیت؟

چۆن ؟

پیشەکی، دەزانین ئەو زیندەوەرانە چاکن. ئایا لەنێویاندا چاکترین زیندەوەر نادۆزیتەوە؟

چاکترینیان تێدایە.

هەموویان لەگەڵ یەکدا جووت دەکەیت، یان چاکترینەکانیان پێکەوە دادەنێیت (زاوزێ بکەن)؟

چاکترینەکان پێکەوە بۆ زاوزێ دادەنێم.

ئایا گەورەکان و بچووکەکان، یان ئەوانەی گەیشتوونەتە تەمەنێک بۆ زاوزێ ئامادە بن، جووتیان دەکەیت؟

ئەوانەی بە تەمەنەکە گەیشتوون.

لەو باوەڕەدای ئەگەر ئەم کارە نەکەیت ڕەگەزی زیندەوەرەکانت بەرەو خراپی بڕۆن؟

لەو باوەرەدام.

لەبارەی ئەسپ و زیندەوەرەکانی دیکەوە چ دەڵێیت؟ ئەمان جیاوازن؟

سەیرە ئەگەر جیاواز بن!

ئەمە بۆ مرۆڤیش ڕاستە. پێویستمان بە چاکترین فەرمانڕەوا هەیە.

ڕاستە، بەڵام چۆن؟

لەبەرئەوە، فەرمانڕەواکانمان دەبێت دەرمانی زۆر بخۆن. بۆ ئەمەش

دەبێت پزیشکی لێزانمان هەبێت.
ڕاستە، بەڵام مەبەستت چیە؟
لەوە دەچێت پێویست بکات فەرمانڕەواکانمان بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵات درۆ لەگەڵ هاوڵاتیان بکەن. ئەم درۆکردنانەش، وەکو دەرمان سوودیان هەیە.
ئێمە ڕاست بۆی چووین.
ئێمە لەبارەی هاوسەریبوون و منداڵبوونیشەوە ڕاست دەڵێین.
چۆن؟
لەبەر ڕۆشنایی باسەکەی پێشوودا یەکەم، چاکترین پیاو دەبێت لەگەڵ چاکترین ژندا جووت بێت و سێکس بکات. بەپێچەوانەشەوە، نزمترین پیاو لەگەڵ نزمترین ژندا جووت دەکەین. دووەم، ئەو منداڵانەی لە چاکترین ژن و پیاو دەبنەوە، نەک منداڵی ژن و پیاوە نزمەکان، بۆئەوەی لە داهاتوودا، کە دەبن بە پاسەوان، لە بەڵاو ئاژاوە دوور بن لە شوێنی نادیاردا لەژێر چاودێریی فەرمانڕەواکان پەروەردە دەکرێن.
دروستە.
کەوابوو، یاسا بڕیار لەسەر ئاهەنگگێڕان و قوربانیدان بۆ جووتبوونیان دەدات. بە شاعیرەکانمان دەڵێین هۆنراوەیان بۆ بهۆننەوە. ئەم کارە دەدەینە دەست فەرمانڕەواکان. ئەوانیش بیر لە هێشتنەوەی ژمارەیەکی پێویست لە پیاوان دەکەنەوە، چونکە جەنگ و نەخۆشی ژمارەکە دەگۆڕێت. نامانەوێت شارەکەمان لە ژوور ڕادەی خۆیەوە گەورە یان بچووک بێت.
ڕاستە.
بۆ هەڵبژاردنی ژنان بۆ پیاوانیش جۆرە یارییەک دادەنێین تاکو کەسە نزمەکان گلەیی لە بەختی خۆیان بکەن و ڕەخنە لە فەرمانڕەواکان نەگرن.
باشە.
لاوە قارەمانەکانیش دەبێت ڕێگەیان بدرێتێ لەگەڵ ئەو ژنانەدا جووت بن و ببن بە باوکی ژمارەیەکی زۆر لە منداڵەکان.
ڕاستە.

منداڵەکان دەدرێن بە دایەنەکان.
بەڵێ.
بە بیری من، منداڵی دایک و باوکە چاکەکان بۆ بەخێوکردنیان دەبرێن بۆ شوێنی دیاریکراو. منداڵی دایک و باوکە نزمەکان، یان ئەوانەی بە کەمئەندامی لەدایک دەبن لە شوێنێکی نهێنی دەیانشارینەوە.
ئەمەش بۆ ئەوەیە نەوەی پاسەوانەکان بە پاکی بمێننەوە. نابێت بەخێوکەرەکان منداڵەکان بۆ شیرخواردن بۆ لای دایکەکانیان بهێننەوە تاکو هیچ دایکێک منداڵەکەی خۆی نەناسێتەوە. بەخێوکەرەکان ئاگایان لەو منداڵانە دەبێت، کە گرفتیان هەیەو شەونخونییان دەکەن؟
تۆ منداڵبوون بۆ ژنانی پاسەوانەکان ئاسان دەکەیت.
ئەوە کارێکی ڕەوایە. با لەسەر داواکاری دووەم بدوێین. گوتمان پێویستە دایک و باوکی منداڵەکان لە تەمەنێکی گونجاودا بن.
ڕاستە.
تۆ لەگەڵ ئەو بیرەدای، کە تەمەنی ژن (بۆ منداڵبوون) بیست ساڵ و پیاویش سی ساڵە؟
لە چ تەمەنێکەوە ئەم ساڵانە دەستپێدەکەن؟
ژن لە شارەکەماندا لە تەمەنی بیستەوە بۆ چل منداڵی دەبێت. پیاویش لەو ڕۆژەوە، کە دەبێت بە ڕاکەرێکی چاک تاکو تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵ بۆی هەیە منداڵ دروست بکات.
بەهەرحاڵ، ئەوە باشترین کاتە بۆ لەش و مێشکی ئەوان.
ئەو پیاوەی لەژێر یان لە ژوور ئەم تەمەنەوەیە منداڵ بۆ شارەکەمان دروست دەکات، دەبێت پێی بڵێین ئەو کارە دادوەرانە و بڕواکەرانە نییە. منداڵەکەی لەنێو تاریکییدا لەدایک دەبێت و کەمویست دەردەچێت. هیچ نوێژ و قوربانیدانێک بۆ جووتبوونەکەش لەلایەن مرۆڤە ئایینییەکانەوە ئامادە ناکرێت. ئێمە هەمیشە لەو باوەڕەداین نەوەی مرۆڤە چاکەکان دەبێت چاکتر بن و زۆرتر سوودبەخش بن.
ئەوە ڕاستە.
ئەم یاسایە بەسەر ئەو پیاوەشدا دەسەپێنرێت، کە بیەوێت بەبێ ڕەزامەندی فەرمانڕەواکان لەگەڵ ژندا جووت بێت و منداڵ دروست بکات. ئەو منداڵێکی زۆڵ و لە یاسابەدەر و ڕێگەپێنەدراو دەهێنێتە

کایەوە.
بەتەواوی ڕاستە.
ئەم یاسایە بەسەر ئەو پیاوەشدا دەسەپێنریت، کە بیەوێت بەبێ ڕەزامەندی فەرمانڕەواکان لەگەڵ هەرچی کەسێکدا بیانەوێت سێکس بکەن. پیاو نابێت لەگەڵ کچی، کچەزاکانی، دایکی، پشتی دایکی جووت بێت. ژنیش نابێت لەگەڵ کوڕی و کوڕەزاکانی، باوکی و پشتی باوکی جووت بێت. پاش دانانی ئەم یاسایە نابێت (لەم کەسانە) منداڵیان هەبێت. ئەگەر منداڵ پەیدا بێت، دەبێت بزانن، کە بەخێو ناکرێت.
ئەوە ڕەوایە. چۆن باوکیان یان کچی خۆیان دەناسنەوە؟
ئەو منداڵانەی حەوت یان دە مانگ پاش زەماوەندی پیاوێک لەدایک دەبن هەموویان دەبن بە زادەی ئەو پیاوە؛ نێرینەکان بە کوڕی و مێینەکانیش بە کچی. منداڵەکانیش ئەو پیاوە بە باوکی خۆیان دادەنێن. هەموو ئەو پیاوانە نەوەی دوای خۆیان بە منداڵ و منداڵی منداڵیان دادەنین. منداڵەکانیش ژن و پیاوانی پێش خۆیان بە دایک و باوک و باپیرەو داپیرە دادەنێن. ئەوانەی لە یەک کاتدا لەدایک بوون خوشک و بران. بەمجۆرە هەر یەکێک لەم دەستە مرۆڤانە دەزانن لەگەڵ کێدا جووت بن، بەڵام لە ڕێگەی بەختبازییەکەوە (ئەگەر ناوی خوشک و برا دەرچوو) هەروەها "پیتیا" ڕازی بێت ، خوشک و برا دەتوانن لەگەڵ یەکدا جووت بن39.
ڕاستە.
بەمجۆرە، گلاوکۆن، پاسەوانەکانی شارەکەمان ژن و منداڵیان بە هاوبەشی دەبێت. پێویستە بزانین ئەم ئامادەکردنە لەگەڵ دەستوورەکەماندا ڕێک دەکەوێت و باشترینە، یان ڕێگەیەکی دیکە هەیە بیگرینەبەر؟
تەنیا ئەو ڕێگەیە هەیە.
ئایا ئەمە باشترین نەخشەدانان بۆ شارەکەمان نییە؟ ئایا پێویست ناکات بزانین چۆن ئەم نەخشەیە بەرەو چاکە نەک خراپەمان دەبات؟
پێویستە.
هیچ خراپەیەک لە تێکشکاندن و دابەشبوونی شارێک بۆ چەند شارۆچکەیەک گەورەتر هەیە؟ چ چاکەیەکیش لەوە مەزنترە، کە

یەکێتیی شارەکە دەپارێزێت؟40.
وایە.
ئەگەر هەندێک لە هاوڵاتیان لە ناخۆشیدا بن و ئەوانی دیکەش لە خۆشیدا، ئایا ئەم ناکۆکییە نابێتە هۆی ڕووخانی شارەکە؟
هەڵبەتە.
ئەمە لەوێدا ڕوونادات، کە زاراوەی "ئەوی من" و " ئەوی من نا" بەشێوەیەکی نالەبار بەکاردەهێنرێن؟ هەروەها زاراوەی "بۆ ئەوان"یش؟
بەتەواوی وایە.
باشترین شار ئەوەیە زۆرینەی دانیشتووانی بۆ هەمان شت و بەهەمان شێوە پێکەوە بڵێن "ئەوەی من" و "ئەوەی من نا"؟
بێگومان.
ئەو شارە چۆنە، کە لە تاکە کەسێک دەچێت؟ بۆ نموونە، کە پەنجەیەکمان دەیەشێت هەموو لەشمان هەست بە ئازار دەکا.
بەدڵنیاییەوە، سەبارەت بە پرسیارەکەشت شارێک چاکترین فەرمانڕەوای هەبێت لەو کەسە دەچێت.
کەوابوو، لە کاتی خۆشی و ناخۆشی هاوڵاتیەکدا ئەو شارە خۆی دەکات بە خاوەنی هاوڵاتیەکە و هەموو بەشەکانی دیکەی لە خۆشی و ناخۆشی ئەو کەسەدا هاوبەشی دەکەن.
ئەگەر دەستوورێکی چاکی هەبێت پێویستە بەمجۆرە بێت.
ئێستا، دەگەڕێینەوە شارەکەی خۆمان و بزانین ئەم خەسڵەتانەی تێدایە یان نا.
پێویستە بزانین.
شارەکانی دیکە چۆنن؟ ئایا ئەوانیش، وەکو شارەکەی ئێمە فەرمانڕەواو هاوڵاتیانی تێدا ناژین؟
تێیدا دەژین.
چۆن هاوڵاتیان ناو لە فەرمانڕەواکان دەنێن؟
بە هەندێکیان دەڵێن زۆردار و ئەوانی دیکە دیموکرات، یان دادوەر.
ئەی دانیشتووانی شارەکەی ئێمە؟ چی بە فەرمانڕەواکان دەڵێن؟

پارێزەر و یاریدەدەرەکان.
ئەوان چ ناوێک لە خەڵکی دەنێن؟
دابینکەری دارایی و مووچە.
فەرمانڕەوای شارەکانی دیکە چ ناوێک لە خەڵکی دەنێن؟
کۆیلەکان.
چۆن فەرمانڕەواکان لە یەکدی دەگەن؟
هاوفەرمانڕەوا.
ئەوانەی ئێمە؟
هاوپاسەوان.
فەرمانڕەوای شارەکانی دیکە کەسێک بە خزم و ئەوی دی بە بێگانە دادەنێن؟
بەڵێ، لەوانەیە.
خزمەکەی بە کەسی خۆی و ئەوی دیکە بە دوور لە خۆی دانانێت؟
دایدەنێت.
پاسەوانەکانی تۆ چۆنن؟ یەکدی بە بێگانە دادەنێن؟
بەهیچ جۆرێک بە بێگانەی دانانێت. بە دایک و باوک، خوشک و برای خۆی دادەنێت.
تۆ باش بۆ کێشەکە چوویت، بەڵام پێم بڵێ: ئایا ئەم ناوانەی لێیان دەنێت بەگوێرەی یاسای (شارەکەمانە)؟ ئایا پێویست ناکات ڕێز لە گەورە بگرن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن؟
نابێت بەبێ پەیڕەویکردنی یاسا ناو لە شتێک بنێن.
کەوابوو، لە شارەکەی ئێمەدا، زۆرتر ئەو زاراوە هاوسەنگانە بەکاردێت. کاتێک یەکێک کارێکی باش یان خراپ دەکات هەموو پێکەوە دەڵێن: "ئەوەی من" باشە یان خراپە.
ئەوە ڕاستە.
ئێستا باس لەوە نەکرا، کە هاوڵاتیان هاوبەشن لەوەی هەیانە؟ ئەمەش نابێتە هۆی ئەوەی لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوبەش بن؟
هەڵبەتە.
لەسەروو ئەمەشەوە ژنان و منداڵان بۆ پاسەوانەکان هاوبەشن؟

ئەوەش ڕاستە.
ئێمە گوتمان هاوبەشیکردن لە خۆشی و ناخۆشیدا بەرزترین چاکەیە. فەرمانڕەوایی چاکمان لەگەڵ لەشی تاکە کەسێک لە ئاستی ئازار و خۆشی بەشێکیدا بەراورد کرد.
ڕێکەوتنەکەمان، لەسەر ئەم خاڵە دروست بوو.
سەرچاوەی گەورەترین چاکە، لە شارەکەماندا، هاوبەشیکردنی ژن و منداڵانە لەلایەن یاریدەدەرەکانەوە.
وایە.
ئەمەش لەگەڵ باسەکەی پێشوودا کۆکە. گوتمان پاسەوانەکان ماڵ و سامان و موڵکی خۆیان نییە، بەڵام مووچە لە هاوڵاتیان وەردەگرن و بەشی دەکەن.
ڕاستە.
ئەمە لەگەڵ ئەو ڕایەدا کۆک نییە، بۆئەوەی شارەکە وێران نەکەن ڕێگەیان نەدرێتێ ئەو شتەی هەیانە بە موڵکی خۆیانی دابنێن؟ ئەگەر خەڵکی جیاواز زاراوەی "ئەوەی من" بۆ زۆر شت بەکاربهێنن، ئەوا کەسانێک بەئارەزووی خۆیان کەلوپەلی خەڵکی دەبەنە ماڵەوە، یان دەبەنە ئەو ماڵانەی ژن و منداڵەکانیان تێدا داناوە و بۆ حەز و چێژی خۆیان بەکاریان دەهێنن. لەلایەکی دیکەوە، دانیشتووانی شارەکەمان ئەو شتانە بە موڵکی هەموویان دادەنێن و هەموویان ئامانجێکیان هەیە و پێکەوە هەست بە خۆشی و ناخۆشی دەکەن.
دروستە.
ئایا لەبەرئەمە، شکاتکردن و تاوانبارکردنی یەکدی لەنێو ناچن؟ هەموو ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵ لەبەر دەستبەسەراگرتنی ژن و منداڵ و موڵکە.
ئەوانە، لەنێو دەچن.
دادگاییکردن لەسەر کێشەی بریندار بوون و لێدانیش لەنێو دانیشتوواندا نامێنێت، چونکە فێریان دەکەین، کە چاکە کەسێک دژی هاوتەمەنی بەرگری لە خۆی بکات. ئەمەش لەشیان بە باشی ڕادەگرێت.
ڕاستە.
ئەم یاسایە لەبەر هۆیەکی دیکەش دروستە: ئەگەر کەسێکی هەڵچوو

ڕقەکەی بەم جۆرە دەربڕێت، کێشەی گەورەتر دروست ناکات.
بەدڵنیاییەوە.
بەڵام مرۆڤیکی بەتەمەن دەسەڵاتی دەدرێتێ فەرمانڕەوایی کەسانی کەم تەمەن بکات و سزایان بدات.
ئاشکرایە.
لاوێکیش زیان بە مرۆڤێکی بەتەمەنتر لە خۆی ناگەیەنێت. لە ئاستیدا بێ ڕێز ڕەفتار ناکات تاکو فەرمانڕەواکە ئەو فەرمانەی پێ نەدات. دوو هۆ لە ئاستی ئەم کارەدا ڕێگری دەبن: شەرمکردن و ترس. شەرم نایەڵێت منداڵ دەست لە ئاستی دایک و باوکیدا بەرز بکاتەوە. لەوەش دەترسێت کەسانی دیکە، وەکو خوشک و براکانی، یان منداڵەکان دژی ڕاوەستن.
ئەوە کاریگەرە.
ئایا لە هەموو حاڵەتەکاندا یاسا نیشانی مرۆڤی نادات بە ئاشتی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بژی؟
زۆر وایە.
ئەگەر پاسەوانەکان لەنێو یەکدا ناکۆک نەبن مەترسی جەنگی ناوخۆش لەنێو خۆیان و کۆیلەکاندا سەرهەڵنادات.
بەڵێ، سەرهەڵنادات.
بە دوودڵیەوە دەمەوێت بڵێم، مادامەکی پاسەوانەکان زۆر کەم کاری خراپیان لێ دەوەشێتەوە ناکەونە ژێر کاریگەرێتی پێداهەڵدانی دەوڵەمەند و ئاڵۆزی و ماندووبوون لە بەخێوکردنی منداڵ و نانپەیداکردن، قەرزکردن، قەرزدانەوە و پارەدان بە ژن و کۆیلەکانی. ئەو ناخۆشی و ئازارەی مرۆڤ لەمانەوە سەرهەڵدەدەن و پێویست ناکات باسیان بکەم. تەنانەت کوێریش دەیانبینێت.
(پاسەوانەکانمان) لەم خەم و ئازارانە دوور دەبن. ژیانیان لە یاریزانە سەرکەوتووەکانی ئۆڵەمپیک خۆشتر دەبێت.
چۆن؟
بەختەوەریی یاریزانە ئۆڵەمپیەکان بە سەرکەوتنێکی بچووکەوە بەستراوە. سەرکەوتن بۆ پاسەوانەکانمان گەورەترە و مووچەیان زۆرترە. سەرکەوتنیان لەپێناوی پاراستنی شارەکەدایە. پاداشتی

ئەمەش مسۆگەرکردنی ژیانە. شارەکەی خەڵاتیان دەکات، کە مردیشن بە ڕێزەوە دەنێژرێن.

ئەو مامەڵەکردنە لەگەڵیاندا چاکە.

لەبیرتە، کەسێک، نازانم کێ بوو! لە پێشتر ڕەخنەی لێ گرتین، کە گوایە ئێمە پاسەوانەکانمان بەختەوەر نەکردووە. گوتی ئەوان بۆیان هەیە هەموو شتێکیان هەبێت و هیچیشیان نییە؟ ئێمە گوتمان، دوایی باسی ئەم خاڵە دەکەین، چونکە ئێستا پێویستە بزانین چۆن بیانکەین بە پاسەوانی چاک و شارەکە بەختەوەر بکەین.

من لەبیرمە.

ئەگەر ژیانی یاریدەدەرەکانمان لە ژیانی یاریزانە سەرکەوتووەکانی ئۆڵەمپیک چاکتر بێت پێویست دەکات لەگەڵ شێوەی ژیانی پینەچیەکان، جووتیارەکان و خاوەن پیشەکانی دیکەدا بەراوردی بکەین؟

بە دیدی من پێویست ناکات.

باشترە گوتەکەم دووبارە بکەمەوە: ئەگەر پاسەوانێک بە شوێن بەختەوەری لە جۆرە ژیانێکی دیکەدا بگەڕێت و بەوەی خۆی ڕازی نەبێت- بەرەڵایانە و بە ئارەزووەوە هەوڵی بەختەوەری بدات، پەلاماری ئەو شتانە بدات حەزیان لێ دەکات، لە فەلسەفەکەی هیزیۆد تێبگات، کە دەڵێت: "نیوە لە هەموو زۆرتر دەهێنێت".

بەڕای من واز لە ژیانەکەی خۆی ناهێنێت.

لەگەڵتا هاوڕام.

ئێمە بۆمان نییە ئەم پەیوەندییەی لەنێوان ئاژەڵەکاندا هەیە بۆ مرۆڤەکانیشی دیاری بکەین؟

تۆ گوتەکەی سەرزاری منت دربڕی.

ئەوان دەزانن چۆن بچنە جەنگەوە.

چۆن؟

ژن و پیاو پێکەوە خۆیان ئامادە دەکەن. منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەبەن تاکو بەپێچەوانەی منداڵی خاوەن پیشەکانی دیکەوە بزانن چۆن خۆیان بۆ جەنگ ڕێک دەخەن. لەگەڵ تەماشاکردنەکەشدا منداڵان دەتوانن یارمەتی دایک و باوکیان بدەن. نەتبینیوە چۆن منداڵی گۆزەسازێک لەبەردەستدا کاردەکات تاکو فێری گۆزەدروستکردن ببێت؟

بینیومه.
دەبێت ئەم خاوەن پیشانە زۆرتر لە پاسەوانەکان بایەخ بە فێربوون و مەشقکردنی منداڵەکانیان بدەن؟ بێگومان نابێت. ئەوە گاڵتەبازییە.
لەگەڵ ئەمەشدا هەموو ئاژەڵێک لەبەردەم بێچووەکەیدا باشتر شەڕ دەکات.
بەڵێ وایە، بەڵام، سوکرات، ئەگەر دۆڕان، کە ئەمەش لە جەنگدا ڕوودەدات ژیانی منداڵەکان دەکەوێتە مەترسییەوە و زیانێکی گەورەش لە شارەکە دەکەوێت.
ئەوە ڕاستە. ئایا پێویست ناکات هەموو مەترسییەک دوور بخەینەوە؟
وایە.
ئەگەر خەڵکی ڕوو لە مەترسیەک بکەن و بەسەریدا سەرکەون باشتر نابن؟
ئاشکرایە باشتر دەبن.
لەو باوەڕەدای ئەوانەی دەبن بە پاسەوان دەبێت لە منداڵییەوە تەماشای جەنگ و خۆئامادەکردنەکەی بکەن؟ مەترسییەکەی ئەمەش لە چوونە نێو جەنگ کەمتر نییە؟
بەڵێ کەمترە.
ئەنجا، باوکیان لەبارەی خۆئامادەکردن و مەترسییەکانەوە بێ ئاگا نین. زانیاری زۆریان لەبارەوە هەیە. ڕاستە.
بۆ هەموو جۆرە خۆئامادەکردنێک منداڵەکان نابەن؟
دروستە.
کەسانی لێزان بەدیاریانەوە دادەنێن تاکو ئاگایان لێیان بێت.
دەبێت وابێت.
بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەکراوە ڕوودەدات.
بێگومان.
لەبەرئەمە لە منداڵییەوە باڵیان بۆ دروست دەکەین تاکو بفڕن و خۆیان ڕزگار بکەن.
مەبەستت چیە؟
پێویستە فێری ئەسپسوارییان بکەین. دەبێت فێری سواری ئەسپی

سپی و خێرا بن و تەماشای جەنگ بکەن. ئەوان بەو تەماشاکردنە فێری جەنگ دەبن. ئەگەر حاڵەتێکی خراپیش ڕوویدا دەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن.

بە بڕوای من بۆچوونەکەت دروستە.

لەبارەی جەنگەوە چ دەڵێیت؟ سەربازەکان بەرانبەر خۆیان و دوژمن چ هەڵوێستێکیان هەیە؟ ئایا بۆچوونەکانم دروستن؟

پێم بڵێ بۆچوونەکانت چین؟

ئەگەر پاسەوانێک واز لە کارەکەی بهێنێت، قەڵغانەکەی دانێت، یان لە ترسا کارێکی نابەجێ بکات پێویست ناکات پیشەیەکی دیکەی بدرێتێ، یان بکرێت بە جووتیار؟

پێویستە.

دیلیش وازلێدەهێنین، وەکو دیارییەک، بۆ ئەو کەسەی دەیگرێت؟

وایە.

نابێت ئەوەی لەو پلەبەرزەدایە خۆی بۆ جەنگەکە ئامادە دەکات، منداڵەکانی و ئەوانەی لەگەڵیان تاجی ڕێزلێنانی لەسەر دابنێن؟

پێویستە وابێت.

تەوقەکردن بە دەستی ڕاست چۆنە؟

ئەوەش دەبێت.

بەڵام لەوانەیە تۆ ئەمەت بەدڵ نەبێت؟

چیە؟

یەکدی ماچ بکەن.

ئەمەش دەکەم بە یاسا: لە ماوەی خۆئامادەکردنەکەدا نابێت کەس نارەزابێت لەوەی ماچی بکرێت. ئەگەر یەکێک یەکێکی دیکەشی خۆشویست، کوڕ بێت یان کچ، دەبێت بەو (ماچە) خەڵات بکرێت.

نایابە.

هەروەها گوتمان، کەسێکی چاک دەتوانێت چەند هاوسەرێکی هەبێت و نەوەی زۆریش بخاتەوە.

بەڵێ، ئەوەمان گوت.

بە دیدی هۆمیرۆسیش وایە. لاوە چاکەکان خەڵات دەکرێن. کاتێک ئەجاکس لە جەنگ گەڕایەوە "ئێسقانێکی گەورەیان بە خەڵات دایە."

ئەوە ڕێزلێنان بوو لە لاوێکی قارەمان و هاوکات لە شیشی بەهێزتر دەکات.
ئەوە ڕاستە.
ئێمە شوێن بۆچوونەکەی هۆمیرۆس دەکەوین. چەند ئەو کەسانە بە چاکی بمێننەوە ئێمە بە خەڵات و هۆنراوە ڕێزیان دەگرین، سەکۆی ڕێزلێنان و گۆشت و پەرداخی شەرابیان بۆ دەڕازێنینەوە. لەگەڵ ڕێزلێناندا و بەردەوام فێریان دەکەین.
ئەوە کارێکی نایابە.
باشە، نابێت ئەوانەی لە خۆئامادەبوونەکەدا دەمرن بیانخەینە ڕیزی کەسانی نێو ڕەگەزی زێڕینیەوە؟
دەبێت.
لەگەڵ هزیۆدا لەسەر ئەو خاڵە ڕێک ناکەوین، کە کاتێک ئەم جۆرە مرۆڤانە دەمرن دەبن بە:
دێوە پیرۆزەکانی سەر زەمین.
پارێزەر دژی خراپە و پاسەوانی مرۆڤەکان؟
ئەوە باوەڕمانە.
پرسیار لە خوا دەکەین چۆن بەڕێزەوە دێوەکان و ئەو مرۆڤە خوائاسایانە بنێژین. شوێن وەڵامەکەی دەکەوین. هەڵبەتە.
دواجاریش گۆڕەکانیان دەڕازێنینەوە و بایەخیان پێ دەدەین. ئەمە بۆ هەموو مرۆڤە چاکەکان دەکەین گرنگ نییە هۆی مردنەکەیان چی بێت.
ئەوە کارێکی چاکە.
ئێستا، سەبارەت بە دوژمنەکانمان بیروڕات چۆنە؟ چۆن سەربازەکانمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن؟
لە چ ڕوویەکەوە؟
یەکەم، بە کۆیلەکردنیان. تۆ لەو باوەڕەدای ڕەوا بێت یۆنانییەک شاری یۆنانییەکی دیکە داگیر بکات؟ پێویست ناکات یاریدەی ئەو شارانەش بدات بەهێز بن و بەربەرییەکان داگیریان نەکەن؟
باشترە ڕەگەزی یۆنانی بەهێز بکات.
باشتر نییە پاسەوانەکانمان کۆیلەی یۆنانییان نەبێت؟ ئەمەش بۆ

هاوڵاتیان دەکەین بە یاسا.
بەتەواوی باشترە. لەم حاڵەتەدا یەخەی یەکدی ناگرن و هەموویان دژی بەربەرییەکان ڕادەوەستن.
لەبارەی لاشەی کوژراوەکانیانەوە چ دەڵێیت؟ شتێکی چاکە لاشەکان ڕووت بکرێنەوە و بێجگە لە چەکەکانیان هەموو شتێکیان لێ بکەینەوە (بۆ خۆمانی بەرین)؟ ئایا زۆرجار، لەشکر لەسەر ئەم کارە تووشی هەڵە نەبووە؟
بەڵێ، تووش بووە.
ئایا ڕووتکردنەوەی لاشە کوژراوەکان کاری کۆیلە و ئەوانە نییە، کە حەز لە پارە دەکەن؟ ئەمە لە ڕەفتاری ئەو سەگە هارە ناچێت، کە بەردی تێدەگریت پەلاماری بەردەکە دەدات؟
لەوە دەچێت.
کەوابوو، دەبێت سەربازەکانمان لاشەی مردووی دوژمنەکەمان ڕووت بکەنەوەو ڕێگەی ناشتنیان بگرن؟
نا، نابێت ئەم کارە بکەن.
لەسەروو ئەمەوە، چەک و تفاقی جەنگی دوژمنەکانمان نابەینە نێو پەرستگاکانمانەوە. ئەگەر بۆ هەموو یۆنانییەک نیگەران بین چەکەکانیان بۆ خۆمان داگیر ناکەین. بەبێ فەرمانی خوا ئەم کارە ناکەین، ئەگینا پەرستگاکانمان گەندەڵ دەبن.
ئەوە ڕاستە.
لەبارەی داگیرکردنی زەوی یۆنانییەکان و ماڵسوتاندنیان چ دەڵێیت؟ ئایا سەربازەکانت ئەم کارانە دژی دوژمنەکانیان دەکەن؟
حەزدەکەم بۆچوونی تۆ بزانم.
بە بۆچوونی من، وەکو چۆن جەنگ و جەنگی ناوخۆشمان هەیە، دوو جۆر ڕێنەکەوتنیش خۆیان قوت دەکەنەوە. ئەم دووانەش یەکەمیان شتێکە لە خۆتەوە نزیکە، دووەمیان دوورە و بێگانەیە. جەنگی ناوخۆ دوژمنایەتی و (ڕێنەکەوتنی) ناوخۆیە. دووەمیش ڕێنەکەوتنە لەگەڵ کەسانی دوور و بێگانە.
ئەو بۆچوونە دروستە.
تەماشاکە و بزانە داخۆ ئەم خاڵەش دروستە: من دەڵێم ڕەگەزی

یۆنانی (خۆ)یەو نزیکە و بەربەرییەکانیش بێگانەن.
ئەوە ڕاستە.
کاتێک یۆنانییەکان دژی بەربەرییەکان ڕادەوەستن دەبن بە دوژمنی ئاسایی بەرانبەر یەکدی. ئەمە بە جەنگ ناوزەد دەکەین. یۆنانییەکانیش لەنێو خۆیاندا بە سروشت هاوڕێن و کە لەگەڵ یەکدیدا شەڕ دەکەن یۆنان دابەش دەکەن، ئەمە بە جەنگی ناوخۆ دادەنێین.
من بە هەموو شێوەیەک لەگەڵتا هاوڕام.
ئێستا، تەماشاکە، لە هەر شوێنێکدا جەنگی ناوخۆ هەڵگیرسێت شارەکە دابەش بکرێت، یەکێک لە لایەنەکان پەلاماری زەوی و ماڵی لایەنەکەی دیکە بدات، ئاگریان تێبەردات، بە کارێکی قێزلێکراوە دادەنرێت، چونکە ئەوە دەردەخات هیچ لایەنێک شارەکەی خۆش ناوێت. ئەگینا چۆن دایک و دایەنی خۆی تالان دەکات. ئێمە گوتمان دەشێت خەرمانی ئەو ساڵەی دوژمنەکەی لەناو بەرێت، بەڵام نابێت ئەوەشی لەبیر بچێت، کە ڕۆژێک ئەم لایانانە ئاشت دەبنەوە و شەڕ ناکەن.
ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە شارستانیترە.
ئەو شارەی تۆ دایدەمەزرێنیت یۆنانییە؟
بەڵێ.
ئەی هاوڵاتیانی چاک نابێت شاری بن؟
وایە.
ئایا یۆنانیان خۆش ناوێت؟ یۆنان بە (خاکی) خۆیان دانانێن؟ هەموویان شوێن یەک ئایین ناکەون؟
بەڵێ ، بێگومان.
ئایا جیاوازییەکانیان لەگەڵ یەکدیدا بە جەنگی ناوخۆ نابینن؟
هەڵبەتە.
ئایا بەو بیرۆکەیەوە شەڕ ناکەن، کە ڕۆژێک دەبێت ڕێکەون؟
بەدڵنیاییەوە.
کەوابوو، بەتووندی دژی یەکدی ڕاناوەستن و یەکدی داگیر ناکەن، چونکە دوژمنی یەکدی نین.
ڕاستە.
خاکی یۆنان داگیر ناکەن و ماڵی یۆنانی ناسوتێنن. هیچ هاوڵاتیەکی

یۆنانی: ژن، پیاو و منداڵ بە دوژمنی خۆیان دانانێن.
ئەوانەی دەبن بەهۆی ئاژاوە و دووبەرەکی سزا دەدرێن.
پێویستە هاوڵاتیان بەم جۆرە مامەڵە لەگەڵ دوژمندا بکەن. پێویستە: "وڵات داگیر مەکە و ماڵ مەسوتێنە" بۆ پاسەوانەکان بکەین بە یاسا؟
وا بیر بکەوە پێویستە و ئەمەش، وەکو یاساکانی دیکە شتێکی چاکە، بەڵام، سوکرات، من وا بۆی دەچم ئەگەر لەسەر باسەکەت بەردەوام بیت، ئەو خاڵەت لەبیر دەچێت، کە چۆن ئەم دەستوورە بهێنینە کایەوە و بەرقەراری بکەین. من لەگەڵتام، هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن چاکن. من خاڵێکی دیکەشی دەخەمە سەر، کە تۆ باست نەکرد، ئەویش ئەوەیە، کە پاسەوانەکان جەنگاوەری چاکن و لە جەنگدا یەکدی جێناهێڵن، چونکە باوک و برا و کوڕی یەکدین. ئەگەر ژنانیش لەگەڵیاندا بچنە جەنگەوە، یان لە پشتەوە یارمەتیان بدەن هیچ دوژمنێک لەبەردەمیاندا خۆی ڕاناگرێت.
گریمان لەگەڵ دانانی ئەم دەستوورەدا ئەم شتانە هاتوونەتە کایەوە، بەڵام پێویستە بزانین چۆن ڕوودەدات. ئەمە دژی باسەکەم پەلاماردانێکی کتوپڕە، چاوەڕوانی من ناکەی تاکو ڕوونی بکەمەوە. من خۆم لە دوو شەپۆلەکەی پێشوو دەرباز کرد، بەڵام تۆ ڕەخنەیەکی دیکەم لێ دەگریت. ئەمەش گەورەترین و سەختترین شەپۆلە. ئەگەر بزانیت چەند گەورەیە بەزەییت بە حاڵما دێتەوە و تێدەگەیت چۆن بە نابەدڵی و ترسەوە دەڕوانمە ناکۆکییەکان.
ئەگەر بەمجۆرە بدوێیت ئێمە زۆرتر حەز دەکەین بزانین چۆن ئەو دەستوورە دێتەکایەوە. باشترە کاتمان نەکوژیت و باسی بکەیت.
پێویستە، بەڵام چی؟
هیچ. ئەگەر بزانین دادوەری چیە، ئایا دەتوانین بڵێین مرۆڤێکی دادوەر و خودی دادوەری دوو شتی جیاواز نین. ئەو مرۆڤە لە هەموو ڕوویەکەوە لە دادوەری دەچێت؟ یان ڕازی دەبین ئەگەر ئەو خۆی زۆر لە دادوەری نزیک بکاتەوەو جێبەجێی بکات؟
ڕازی دەبین.
ئێمە بەدوای شێوازێک بۆ دادوەری دەگەڕاین. هەوڵمان دا بزانین دادوەری چیە و کەسێکی دادوەریش چۆنە. مرۆڤی دادوەر چ جۆرێکە.

بەهەمان شێوە، ئەم هەڵوێستەشمان بەرانبەر نادادوەری هەبوو. بیرمان کردەوە، کە بە دیاریکردنی پەیوەندییان بە بەختەوەری، یان نابەختەوەرییەوە تێدەگەین ئەوەی لەوان بچێت بەشێکی بەختەوەرییان بەرکەوتووە، بەڵام نەمانویست ئەوە بسەلمێنین چۆن ئەم جۆرە مرۆڤانە دێنە کایەوە.

ڕاستە.

تۆ لەو باوەڕەدایت خراپترین هونەرمەند پۆرترێتی جوانترین مرۆڤمان، وەکو خۆی بەوردی بۆ دروست دەکات بێئەوەی ئەو مرۆڤەی بینیبێت؟

نا، لەو باوەڕەدا نیم.

لەبارەی کێشەکەی خۆمانەوە چ دەڵێیت؟ نەمانگوت ئێمە بیر لە دامەزراندنی شارێکی چاک دەکەینەوە؟

بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، لەو باوەڕەدای گفتوگۆکەمان لەبار نەبێ ئەگەر نەتوانین دامەزراندنی ئەو شارەی لەبیرماندایە بسەلمێنین؟

نا، وا بۆی ناچم.

ئەوە ڕاستیەکەیەتی. ئەگەر لەبەر دڵی تۆ هەوڵ بدەم ئەو بارودۆخانە باس بکەم، کە شارێکی وای تێدا دروست دەبێت تۆش دەبێت لەبەر دڵی من شتێک بکەیت.

وەکو چی؟

ئایا ئەوەی بە کردەوە دەکرێت بەگوێرەی بیردۆزە نییە؟ یان کردەوە لە بیردۆزە کەمتر ڕاستیناسە؟ لەوانەیە هەندێک لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا هاوڕا نەبن. ئایا تۆ لەسەر ئەمە ڕێدەکەویت؟

من ڕێدەکەوم.

کەوابوو، ناچارم مەکە بۆت بسەلمێنم ئەوەی لە بیردۆزەدا باسی دەکەین، وەکو خۆی بیهێنینە کایەوە. ئەگەر ئێمە بزانین ئەو شارەی باسمان کرد چۆن بەڕێوە ببرێت یان بەو جۆرەی تۆ لەسەری ڕێکەوتیت، دەگونجێت ئەو شارەش بەڕاستی دامەزرێنین. ئایا تۆ بەمە ڕازی نیت؟ من بەش بەحاڵی خۆم ڕازیم.

هەروەها منیش.

پاش ئەمە هەوڵ دەدەین ئەوە بدۆزینەوە چ شتێکی خراپ لە شارەکاندا دەکرێت. ئەو گۆڕانکاریانەش چین شار بەرەو ئەو دەستوورەی ئێمە دەبەن.

ئەوە ڕاستە.

بە بۆچوونی من ئەو گۆڕانکارییە هەیە و شیاوی ئاوڕلێدانەوەیە. ئەمەش نە گەورە و نە بچووکە، بەڵام گۆڕانکارییەکە، کە ڕوودەدات.

ئەو گۆڕانکارییە چیە؟

ئێستا بە شەپۆلە گەورەکە گەیشتووین. من ئەوە باس دەکەم، کە دەمەوێت لەسەری بدوێم و گوێ نادەمێ شەپۆلەکە پڕ پێکەنینیش بێت و من لەنێو دەریای گاڵتەبازییدا نوقم بکات. لەبەرئەمە گوێ بگرە و بزانە دەڵێم چی.

بڵێ.

تاکو فەیلەسووفەکان، وەکو پاشا فەرمانڕەوایی نەکەن یان فەرمانڕەواکان خەریکی فەلسەفەکاری نەبن و فەلسەفە و دەسەڵاتی ڕامیاری یەک نەگرن، گلاوکۆن، شارەکان و ڕەگەزی مرۆڤیش لە خراپە ناپارێزین. تاکو ئەم کارە نەکەین دەستوورەکەشمان بۆ شارەکە جۆر نابێت.

سوکرات، پاش دەربڕینی ئەم بیروڕایە دەبێت چاوەڕوانی هێرش و پەلاماردانی ئەو کەسانەش بە هەموو چەکێکەوە بکەین، کە (بەگوێرەی تۆ) لەو پلەیەدا نین شیاوی فەرمانڕەوایی بن. تاکو بەڵگەیان بۆ نەهێنیتەوە و ڕازییان نەکەیت بە سزای خۆتت دەگەیەنن.

تۆ یەکێک بووی لەوانەی داوات لێ کردم ئەم بۆچوونەم دەربڕم.

من نامەوێت پشتت چۆڵ بکەم، بۆیە داوات لێ دەکەم وەڵامی باشتر ئامادە بکەیت و کێشەکە زۆرتر ڕوون بکەیتەوە.

هەوڵ دەدەم، بەتایبەتی پاش ئەوەی زانیم، تۆ پشتم چۆڵ ناکەیت و لەگەڵمای. بۆئەوەی لە دەست ئەو خەڵکە ڕزگارمان بێت پێویستە پێناسەی فەیلەسووف، ئەوەی فەرمانڕەوایی پێ دەدرێت، بکەین. پاش ئەمە ڕوونی دەکەینەوە، کە ئەوانەی بە فەیلەسووف دادەنرێن بە سروشت توانای فەرمانڕەواییان هەیە. هاوڵاتیانی دیکەش بە سروشت لەم تواناییە بێبەشن و دەبێت شوێن فەرمانی فەیلەسووفەکان

بکەون.
ئێستا، کاتی پێناسکردنەکە هاتووە.
لەگەڵما هەوڵ بدە ڕێگەیەک بۆ پێناسکردنەکە بدۆزینەوە.
تۆ پێش بکەوە.
دەبێت بیرت بخەمەوە یان لەبیرتە گوتمان ئەوەی شتێکی خۆش دەوێت دەبێت هەموو بەشەکانی ئەو شتەی خۆش بوێت؟
من تێناگەم، لەبەرئەوە بیرم بخەوە.
لەوانەیە، کەسێکی دیکەش، وەکو تۆ وەڵامم بداتەوە. کەسێکی پڕ حەز و ئارەزووی وەکو تۆ چاک دەزانی هەموو کوڕێکی لاوی جوان، لەو تەمەنەدا ئارەزووی عاشقەکانیان دەجووڵێنن. ئایا لەگەڵ لاوێکی پێستسپی، لوتپان، لوتقولاپی، یان ئەو لاوەی لە شازادە ناچێت، پێستی زەرد، یان هەنگوینی بێت، بەمجۆرە (ئارەزووت) بۆی ناجووڵێت؟ بێ بیانو ناتەوێ هەموو گوڵێکت لەو باخەدا دەست بکەوێت؟
ئەگەر بەو جۆرە تەماشای من بکەیت لەبەر گفتوگۆکەمان لەگەڵتا ڕێدەکەوم.
بێجگە لەمەش، ئەوانەی شەراب خۆرن بەمجۆرە ڕەفتار ناکەن؟ ئەوان حەزیان لە هەموو جۆرە شەرابێک نییە؟
بەدڵنیاییەوە.
بەمجۆرە ئەوانەی حەزیان لە ڕێزە وەکو سەرلەشکرەکان، کەشتیەوانەکان، ئەگەر کەسانی مەزن و گرنگ ڕێزیان نەگرن داوای ڕێزلێنان لە کەسانی نزمیش دەکەن، چونکە مەبەستی ئەوان ڕێزلێنانە بەگشتی.
وایە.
باشە، ئێستا لەسەر ئەم خاڵە ڕێدەکەویت یان نا؟ کاتێک، کەسێک حەزی لە شتێکە، حەز لە بەشێکی یان هەموو ئەو شتە دەکات؟
ئێمە دەڵێین، حەز لە هەمووی دەکات.
ڕاستە بڵێین، فەیلەسووف حەز لە هەموو بەشەکانی زانایی دەکات؟
بەڵێ، ڕاستە.
ئەو کەسەی لاوەو دەیەوێت فێر بێت هێشتا سوودی فێربوونەکەی

بۆ دەرنەکەوتووە، بە خۆشەویستیی فێربوون، یان فەیلەسووفی ناوزەد دەکەین.

ئەوەش ڕاستە.

ئەوەی ئامادەیە هەموو شتێک فێر بێت حەز لە فێربوون دەکات، بە فەیلەسووف دادەنرێت. وانیە؟

زۆر کەس، لەم حاڵەتەدا، دەبن بە فەیلەسووف، تەنانەت ئەوانەی حەز لە تەماشاکردنیش دەکەن دێنە ڕیزەوە، چونکە ئەوانیش خۆشی لە فێربوون وەردەگرن. هەروەها ئەوانەی حەز لە دەنگ دەکەن، چونکە بەزۆر گوێ ناگرن و بە ئارەزووی خۆیان بەشداری میهرەجانی دایۆنیسس لە شار و گوندەکان دەکەن، گوێ لە هەموو کۆڕاڵەکان دەگرن. ئایا ئەم جۆرە کەسانە فەیلەسووفن؟

نەخێر، بەڵام لە فەیلەسووف دەچن.

کێ فەیلەسووفی ڕاستەقینەیە؟

ئەوانەی حەزدەکەن ڕاستی بناسن.

مەبەستی تەواوت چیە؟

ئاسان نییە باسی بکەم، بەڵام هەست دەکەم تۆ لەگەڵما ڕێدەکەویت.

لەسەر چی؟

مادامەکی جوانی دژوەستاوی ناشرینییە، جوانی و ناشرینی دوو شتن.

هەڵبەتە.

مادامەکی دوو شتن، هەریەکە لەوانەش یەک فۆرمی هەیە.

لەگەڵ ئەوەدام.

ئەمە بۆ دادوەری و نادادوەری، چاکە، خراپە و فۆرمەکانی دیکەش دروستە، بەڵام لەبەرئەوەی پەیوەندییان بە کردەوە و تەنەکان و شتی دیکەوە هەیە، کە تیایاندا بەرجەستە دەبن، هەریەکێک (لەو فۆڕمانە) بە چەند شێوەیەک خۆی دەردەخات. ڕاستە.

من جەخت لەسەر جیاوازیی نێوان ئەوان دەکەم تۆ بە خۆشەویستیی بینین و بیستن، یان پیشەکانی دیکە داتنان و ئەوانەی منیش بە فەیلەسووف ناوزەدم کردن.

ئەمە چۆن دەکەیت؟

ئەوانەی حەز لە بینین و بیستن دەکەن، دەنگ، ڕەنگ و شێوەی جوانیان خۆش دەوێت لە بیردا ناتوانن لە ناوەڕۆکی جوانی تێبگەن.

بەدڵنیاییەوە.

ئەو کەسە چۆنە، کە باوەڕی بە شتی جوان هەیە، جوانی ڕەت دەداتەوە و شوێن ئەو کەسەش ناکەوێت، کە زانیاری سەبارەت بە جوانی دەداتێ؟ لەو باوەڕەدا نیت ئەو کەسە لە خەوندا بژی؟ ئەوە خەوبینین نییە. گرنگ نییە خەوت بێت، یان چاوکراوە، ئەو تەنیا ئەو شتانە دەبینێت، کە لە یەکدی دەچن؟

بێگومان، ئەو کەسە خەو دەبینێت.

ئەوەی بەپێچەوانەوە بۆی دەچێت باوەڕی بە خودی جوانی هەیە و لەنێو شتەکانیشدا جوانی دەبینێت، بەڵام جوانی بە شتە جوانەکان دانانێت. ئەو کەسە خەو نابینێت؟

نا، ئەو بەئاگایە.

کەوابوو، دروستە ئەگەر بیرەکانی بە زانین دابنێین، چونکە ئەو دەزانێت. بیری کەسەکانی دیکەش، بە بۆچوون ناوزەد دەکەین، چونکە ئەو بیرانە بۆچوونی ئەوانە.

دروستە.

چۆن ئەو کەسە دەبینیت، کە تەنیا بۆچوونی هەیە و زانینی نییە. ڕەخنە لە ئێمە دەگرێت و ڕاستی باسەکەمان ڕەت دەداتەوە؟ دەتوانین بەبێئەوەی پێی بڵێین، ئەو هەڵەیە، بە نەرمی لەگەڵیا بدوێین و ڕازی بکەین؟

پێویستە.

بیر بکەوە، چی پێ بڵێین. بەمجۆرە پرسیاری لێ ناکەین؟ یەکەم، دەڵێین کەس ناڵێ ئەو هیچ نازانێت. پێمان خۆشە بزانین چ جۆرە زانیارییەکی هەیە. ئەنجا دەڵێین: ئایا ئەوەی زانایە شتێک دەزانێت یان هیچ نازانێت؟ تۆ بۆ ئەو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەوە.

شتێک دەزانێت.

زانینەکەی لەبارەی شتێکەوەیە، کە هەیە یان نییە؟

لەبارەی شتێکەوەیە، کە هەیە. چۆن شتێکی نەبوو دەناسرێت؟

کەوابوو چاک تێدەگەین، کە: گرنگ نییە چەند ڕێگەی لێکۆڵینەوە هەبێت. ئەوەی بەتەواوی هەیە بەتەواوی دەناسرێت و ئەوەی نییە ناناسرێت.
زۆر دروستە.
باشە. ئێستا، ئەگەر شتێک لە ڕوویەکەوە هەبێت و نەبێت، ناکەوێتە نێوان ئەو شتانەوە، کە لە هیچ ڕوویەکەوە نین و لە هەموو ڕوویەکەوە هەن؟
بەڵێ، دەکەوێتە نێوانەوە.
لەبەرئەوەی زانین پەیوەندی بە هەبووەکانەوە هەیە، نەزانینیش بەوانەوە، کە نین، پێویست ناکات بزانین چی دەکەوێتە نێوان زانین و نەزانینەوە؟
بێگومان.
ئایا بۆچوون شت نییە؟
بێگومان شتە.
لە زانینەوە جیاوازە، یان نا؟
بۆچوون و زانین هەریەکێکیان پەیوەندییان بە بابەتەکانەوە هەیە.
ڕاستە.
ئێستا، زانین پەیوەندی بە (چیەتی) یەوە نییە؟ ئایا نایەوێت چیەتی بابەتەکە بناسێت؟
پێویستە ئەم کێشەیە زۆرتر ڕوون بکەینەوە.
چۆن؟
هێز جۆری شتەکانە، کە دەسەڵات یان کاریگەرێتی خۆی دەنوێنێ. بینین و بیستن، بۆ نموونە جۆرێکن لە هێز کە ئێمە هەمانە.
وایە.
من وا بۆ کێشەکە دەچم. هێز ڕەنگ و شێوەی نییە، یان خەسڵەتی شتەکانی نییە و جیاوازە. بۆ ناسینی هێزێک دەڕوانمە کاریگەرێتی و ئاکامەکەی. منیش دەیناسمەوە ئەگەر هەمان کاریگەرێتی خۆی بنوێنێتەوە. دەڵێم هەمان هێزە. ئەگەر جیاوازیش بوو دەڵێم جیاوازە. ئایا لەگەڵ ئەم بۆچوونەمدا هاوڕایت؟
من هاوڕام.

ئایا زانین هێزە؟
مەزنترین هێزە.
ئەی بۆچوون هێزە، یان شتێکی دیکە؟
بۆچوونیش هێزە.
تۆ پێشتر زانین و بۆچوونت لە یەکدی جیاکردەوە و بە دوو شتی جیا داتنان. کێ لەو باوەڕەدایە هێزێکی تێکشکاو لەگەڵ هێزێکی تێکنەشکاودا یەک بن؟
ڕاستە. ئێمە گوتمان بۆچوون و زانین جیاوازن.
هەریەکێک لەوان بە سروشت کاریگەرێتی خۆی بەسەر بابەتەکەوە دەگێڕێ و بابەتەکانیش جیاوازن.
وایە.
بۆچوون بیروڕایە؟
بەڵێ.
بیروڕایە لەسەر بابەتی زانین. ئەوەی بە بیروڕا ناسراوە، وەکو زانراوەکەیە، یان وانیە؟
بەگوێرەی ڕێکەوتنەکەی پێشوومان ئەمە کارێکی مەحاڵە. ئەوان دوو هێزی جیاوازن و بابەتەکانیشیان جیاوازن. ئەوەی زانراوە لەو بابەتەوە جیاوازە، کە لە بۆچووندایە.
کەوابوو، ئەوەی زانراوە لە بابەتی بۆچوونەوە جیاوازە؟
پێویستە جیاواز بێت.
ئایا بۆچوونمان بۆ شتێکە، کە نییە؟ ناگونجێت بۆچوونمان لەسەر شتێکی هەبوو هەبێت؟ ئایا بۆچوون لەسەر شتێکی هەبوو یان نەبوو سەرهەڵدەدات؟
نا.
بەڵام ئەوەی بیروباوەڕی خۆی دەردەبڕێت، بۆچوونی لەسەر شتێک دیاری دەکات.
بەڵێ.
باشترین زاراوە بۆ ئەو شتەی نییە ”هیچ“ ە بەکاری دەهێنین.
وایە.
بەڵام ئێمە نەزانینمان بەو شتەوە بەستەوە، کە نییە و زانینیش بە

بوونەوە. کەوابوو بۆچوون بەم دووانەوە نەبەستراوەتەوە.
دەبێت وابێت.
لەم ڕووەوە، بۆچوون زانینە و نەزانینیش نییە.
هیچ کامیان نییە.
ئایا بۆچوون لە زانین تاریکتر و لە نەزانین ڕۆشنترە؟
بەڵێ.
کەوابوو، شتێکە لەنێوانیاندایە.
بەڵێ.
ئێمە گوتمان ئەو شتەی بسەلمێنرێت هەیە و لەهەمانکاتدا نییە. دەکەوێتە نێوان بوون و نەبوونەوە. ئەو شتە بە ڕێگەی زانین و نەزانینەوە نادۆزرێتەوە. دەبێت (هێزێکی دیکە) لەنێوان زانین و نەزانیندا هەوڵی دەرخستنی بدات.
ڕاستە.
بۆچوون، لەم حاڵەتەدا، ئەو هێزەی نێوانیانە.
وایە.
ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بزانین چی لە بوون و نەبووندا بەشداری دەکات و لەهەمانکاتدا هیچیشیان نییە. ئەگەر ئەو شتە هەبێت، بەهەڵەدا ناچین، بە بابەتی بۆچوون ناوزەدی بکەین.
وایە.
من دەمەوێت پاش گەیشتن بەم ئاکامانە پرسیار لەو هاوڕێیەمان بکەم، کە باوەڕی بە بوونی خودی جوانی نییە و تەنیا شتە جوانەکان دەبینێت. ئەوەی حەزی لە بینینە و نایەوێت بڕوا بەوە بکات، کە خودی جوانی، یان خودی دادوەری یەک شتە، دەڵێین: هاوڕێی خۆشەویست لەنێو هەموو شتە جوانەکاندا دانەیەکیان لە هەموویان ناشرینتر نییە؟ لەنێو هەموو دادوەرییەکاندا یەکێکیان نادادوەر خۆی دەرناخات؟
پێویستە.
جووتەکان چۆن دەبینیت؟ هیچ تاکێکیان لە نیوە کەمترە؟
نا.
سەبارەت بەو شتانەی گەورە و بچووک، سووک و گرانن، هیچ کامیان لە لایەنە دژەکەی زیاتر دەبێت؟

نا، هەریەکێکیان لە هەردوو لایەنە ناکۆکەکاندا هەیە.
کەوابوو، دەزانیت چۆن مامەڵە بکەیت. هیچ شوێنێکی دیکە بێجگە لەنێوان بوون و نەبووندا دەبینیت، تاکو ئەم جۆرە بابەتەی لێ دابنێیت؟ بێگومان ئەو جۆرە بابەتە لەوە زۆرتر نابێت بەوەی هەیە، یان نییە. هیچ شتێک لە نەبوون تاریکتر و لە بوونیش ڕۆشنتر نییە.
زۆر ڕاستە.
دەردەکەوێت زۆربەی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە جوانی و (چەمکەکانی) دیکە هەیە لەنێوان بوون و نەبووندا دەسوڕێنەوە.
بەڵێ، بەم باوەڕە گەیشتووین.
هەروەها، ئەمەشمان بە بۆچوون نەک زانین ناوزەد کرد.
وایە.
ئەوانەی خودی جوانی نادۆزنەوە تەنیا شتە جوانەکان دەبینن. ئامادەش نین گوێ لەو کەسە بگرن دەیەوێت فێریان بکات. هەروەها، هەمان هەڵوێستیان بەرانبەر (چەمکی) دادوەریش هەیە. ئەوان خاوەنی بۆچوونن نەک زانین.
پێویستە وابێت.
ئەی ئەو کەسانەی لە خودی شتەکان، ئەو شتانەی نەگۆڕن دەکۆڵنەوە چ دەڵێن؟ ئایا ئەو کەسانە نین، کە دەزانن، بەڵام خاوەنی بۆچوون نین؟
ئەویش پێویستە وابێت.
ئایا دەتوانین بڵێین، ئەم جۆرە کەسانە حەزیان لە بابەتی زانینە و دەیانەوێت بیناسن؟ لەبیرت نەچێت گوتمان ئەوانەی خاوەنی بۆچوونن حەزیان لە دەنگ و ڕەنگە جوانەکانە، بەڵام خودی جوانی ناناسن.
ڕاستە، ئەوەم لەبیرە.

بەهەڵەدا ناچین ئەم جۆرە کەسانە بە خۆشەویستی بۆچوون، نەک فەیلەسووف، یان خۆشەویستەکانی زانین دابنێین؟
ئایا بەم ناولێنانە تووڕە دەبن؟

ئەگەر شوێن ڕاوێژی من بکەون خۆیان توڕە ناکەن. نابێت بەرانبەر ڕاستیناس توڕە بیت.

ئەوانەی دەیانەوێت خودی شتەکانیش بناسن فەیلەسووفن و خۆشەویستی بۆچوون نین؟

زۆر ڕاستە.



من بە گلاوکۆنم گوت، پاش ئەم لێکۆڵینەوە درێژخایەن و سەختە، فەیلەسووف و ئەوانەی فەیلەسووفیش نین، دەرکەوتن کێن.
ئەو لە وەڵامدا گوتی: هەڵبەتە لە لێکۆڵینەوەیەکی کورتدا ئەمەمان بۆ دەرنەدەکەوت.
بێگومان، بەڵام بە بۆچوونی من باشتر وابوو ئەم هەموو شتانەمان باس نەکردبایە و تەنیا هەوڵی ڕوونکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان دادوەری و نادادوەرییمان، بدایە.
پاش ئەمە باسی چی بکەین نین، پێویستە بزانین کامیان شیاوی ئەوەن لە شارەکەماندا فەرمانڕەوایی بکەن؟ چ وەڵامێکی ڕاست بۆ ئەم پرسیارە دەدۆزینەوە؟
ئەوانەی دەتوانن پاسەوانێتی بکەن و یاسا و ژیانی شار بپارێزن دەبن بە پاسەوان.
ئەوە ڕاستە.
هەروەها پێویست دەکات ئەو پاسەوانەی چاودێری هەموو شتێکە، چاوی باش بڕوانێت و کوێر نەبێت؟
ئەوە شتێکی ئاشکرایە و نکوڵی لێ ناکرێت.
لەو باوەڕەدایت جیاوازیی لەنێوان کوێرێک و نەزانێکدا هەبێت؟ ئەوانەی نەزانن شێوازێکی دیار (بۆ زانین) لەنێو دەروونیاندا نابینرێت- وەکو هەندێک هونەرمەندی شێوەکاری، کە ناتوانن بەتەواوی وێنەی (مۆدێلەکەیان) بکێشن، ئێمەش ناتوانین بەتەواوی لە واتای دادوەری و چاکە تێبگەن و سەقامگیریان بکەن.
نا، جیاوازیی لەنێوانیاندا نییە.
کوێر دەکرێت بە پاسەوان؟ یان ئەوانەی زانیارییەکی تەواویان سەبارەت بە هەموو شتێک هەیە بۆ ئەم کارە باشترن؟
گەمژەییە ئەگەر فەیلەسووفەکان هەڵنەبژێرم.

پێویست دەکات بزانین کەسێک چۆن ئەو خەسڵەتانەی تیدایە؟
بەدڵنیاییەوە.
ئێمە لە سەرەتای باسەکەمانەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، کە دەبێت لە سروشتی فەیلەسووفەکان بکۆڵینەوە. پاش ئەمە لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەوین، کە ئەوان شیاوی ئەوەن فەرمانڕەوایی شارەکەمان بکەن.
چۆن؟
لە سەرەتاوە دەڵێین سروشتی فەلسەفیانە حەزکردنە لە فێربوونی ئەو شتانەی نەگۆڕن و خۆی بەو بابەتانەوە ماندوو ناکات، کە پەیدا دەبن و لەناو دەچن.
هەروەها خۆشەویستییان بۆ ئەم جۆرە زانینە، وەکو خۆشەویستی ئەو کەسانەیە بۆ ڕێز، یان ئارەزووی سێکس، کە بەهیچ جۆرێک دەستبەرداری نابن.
ڕاستە.
ئەنجا بیر بکەرەوە، ئەم جۆرە کەسانە ئەم سروشتەیان هەبێت.
چ سروشتێک؟
درۆزن نین و بەهیچ شتیکی ناڕاست ڕازی نین و ڕاستییان خۆش دەوێت.
ئەمە دروستە.
ئەمە دروست نییە، بەڵکو پێویستە. ئەو پیاوەی ئارەزوویەکی سێکسی بۆ کوڕێکی جوان هەیە هەموو شتێکی ئەو کوڕەی خۆش دەوێت.
ڕاستە.
هیچ شتێک بێجگە لە ڕاستی هەیە لە زانایییەوە نزیک بێت؟
هیچ شتێکی نزیکتر نییە.
ئایا دەگونجێت فەیلەسووف حەزی لە زانین و ناڕاستیش بێت؟
نابێت.
کەوابوو، ئەوەی فێربوونی خۆش دەوێت لە منداڵییەوە هەوڵی دۆزینەوەی ڕاستیەکان دەدات؟
بەتەواوی ڕاستە.

ئێستا، ئەوەش دەزانین، ئەوەی شتێکی زۆر خۆش دەوێت ئارەزووی بۆ شتەکانی دیکە کەم دەبێتەوە. ئەمەش وەکو ئەو جۆگە ئاوەیە، کە بە لایەکی دیکەدا دەڕوات.

هەڵبەتە.

ئەوەی حەزی لە فێربوونە چێژ لە فێربوون وەردەگرێت، گوێ ناداتە چێژ و ئارەزووی لەش. بێگومان ئەگەر ئەو کەسە فەیلەسووفێکی ڕاستەقینە بێت و ساختە نەبێت.

پێویستە وابێت.

ئەم کەسە ڕێگەیەکی مامناوەندی (لە ژیاندا) دەگرێت و حەزی لە پارە نییە. کەسانی دیکە، بێجگە لە ئەو بۆیان هەیە حەزیان لە پارە بێت و سامانیان هەبێت، بەڵام ئەو بۆی نییە.

ڕاستە.

ئایا بیریارێک دەتوانێت هەموو کاتێک لە هەموو شتێک بکۆڵێتەوە؟

ناتوانێت.

مردن بە شتێکی ترسناک دادەنێت؟

نا.

کەوابوو، سروشتی کۆیلانە و ترسنۆک لە فەلسەفەوە دوورە.

بە بۆچوونی من دوورە.

ئایا کەسێکی بەتەمەن حەز لە پارە ناکات؟ ئەگەر ترسنۆک و سروشتێکی کۆیلانەی نەبێت دەبێت بەزۆردار؟

نا.

بێجگە لەمە، لە دۆزینەوەی سروشتێکی فەلسەفیانەدا بەدوای کەسێکدا دەگەڕێین، کە لە لاوێتیەوە دادوەر و ڕەوشتبەرزە، نەک دڵڕەق و دڕندە.

بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، نابێت ئەم خاڵە ڕەچاو نەکەیت.

ئەو خاڵە چیە؟

ئەو کەسە خێرا، یان هێواش فێر دەبێت. تۆ دەتەوێت ئەو کەسەی شتێکی خۆش دەوێت ئەو کاتە هەوڵی بۆ دەدات دەستی بکەوێت، کە بیری دەکات، یان هەوڵی زۆری بۆ دەدات و کەم دەستی دەکەوێت؟

نا، ئەوە نابێ وابێت؟
چۆنە هیچ فێر نەبێت شتەکانی لەبیر بچێتەوە؟ ئەو بە نەزان دادەنرێت؟
لەوانەیە.
ئەگەر هیچ فێر نەبێت، لە ئاکامدا، ڕقی لە خۆی و فێربوونیش نابێت؟
هەڵبەتە.
ئایا ئەو خەسڵەتانەی ئاماژەمان بۆ کردن، بۆ ئەو دەروونەی شتەکان بەتەواوی دەناسێت پێویست نییە؟
بە پێویستیان دادەنێم.
لەسەر ئەو خاڵە ڕێک ناکەویت، کە هەموو کەسێک دەبێت بە سروشت توانای بیرکەوتنەوە، فێربوونی خێرا، بیرکردنەوەی قووڵ و بەخشندەیی هەبێت. هاوڕێ و خزمی ڕاستی، دادوەری، ئازایەتی و مامناوەندێتی بێت؟ تەنانەت (مۆموس)یش لەسەری ڕێدەکەوێت41. کاتێک ئەم جۆرە کەسانە دەگەنە تەمەنی تێگەیشتن و پێگەیشتن، شارەکەیان نادەیتە دەستیان؟ ئەدیمەنتۆس وەڵامی دایەوە و گوتی: سوکرات.. کەسێک دەتوانێت دژی تۆ هەڵباتێ، بەڵام ئەوانەی بەرانبەرت وا هەست دەکەن شارەزاییان لە پرسیارکردن و گفتوگۆکردندا نییە، بۆیە هەرجارە لایەنێکی بچووکی گفتوگۆکانت بە نالەبار دەبینن. ئەگەر ئەم لایەنانە بخەنە سەر یەک بەشێکی گەورە پێک دەهێنن. ئەوان لەو یاریزانانە دەچن، کە لە یاری دامەدا بەرانبەر کەسێکی لێزان دانیشتوون و ناتوانن خانەکانیان بگۆڕن. نازانن چ بڵێن. لەوانەیە کەسێک وا تێبگات ئێمە نەتوانین وەڵامی پرسیارەکانت بدەینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین ئەوانەی فەلسەفە دەخوێنن، ئەوانە نا، کە لە تەمەنی لاوێتیدا زۆر دەیخوێنن و دوایی وازی لێ دەهێنن، بەڵکو مەبەستت ئەوانەیە لەسەری بەردەوامن، هەندێکیان لەڕووی ڕەوشتبەرزییەوە دەگۆڕێن، بەڵام زۆر دڕندە نابن و ئەوانەی بە ڕێزەوە دەمێننەوە تۆ کاری فەرمانڕەواییان دەدەیتێ، بێکەڵکن.
منیش گوتم: تۆ وا دەزانی ئەوەی باسی دەکرێت ناڕاستە.
من نازانم. حەزدەکەم بە ڕاست دایبنێم.

چۆن ڕاستە، ئەگەر بڵێین کۆتایی بە خراپە لە شارەکەماندا نایەت تاکو فەیلەسووفەکان- ئەوانەی بێکەڵکن فەرمانڕەوایی- نەکەن؟ وەڵامی ئەو پرسیارەی تۆ بە بزەی لێو دەردەبڕێت. تۆش فێری بزەی لێو نەبوویت.

تۆ من بەوە تاوانبار دەکەیت، کە نەتوانم بۆچوونەکەم بسەلمێنم؟ کەوابوو گوێ بگرە. من وەڵامەکەت وەکو ئەو هونەرمەندە وێنەی بزنەکێوییەک، لە چەند شتێکی دیکەوە وەردەگرێت و دروستی دەکات بۆ ئامادە دەکەم. ئەم وێنەیە بێنە بەرچاوت، گریمان ڕووداوێک لەنێو کەشتیەکدا ڕوودەدات. خاوەنی کەشتیەکە لەوانەی نێو کەشتیەکە، گەورەتر و بەهێزترە، بەڵام گوێی گرانە، چاوی کزە و لە کەشتیەوانیش چاک نازانێت.

هاوکارەکانی ژێردەستی لەنێو یەکدا، لەسەر ڕەوتی کەشتیەکە مشتومڕیانە. هەر یەکێک لەوان، کە کەشتیەوانیش بەتەواوی فێرنەبووە، دەیەوێت ببێت بە کەشتیەوان. لە دەوری خاوەنی کەشتیەکە کۆدەبنەوە. هەریەکەیان داوای لێ دەکات، وە دەپاڕێتەوە، بکرێت بە سەرۆکی کەشتیەوانەکان و سوکانەکەی بدرێتێ. ئەوانەی کارەکەیان پێ نادرێتێ، ئەو کەسە دەکوژن، کە سوکانەکەی دەدرێتێ و خاوەنی کەشتیەکەش دەرمانخوارد دەکەن. کەشتیەکە داگیر دەکەن. یەکێکی زیرەکیش، لە خۆیان دەکەن بە ڕابەرو سەرۆکی خۆیان و ئەوانی دیکە، بە بێکەڵک دادەنێن. ئەوان نازانن، کە کەشتیەوان دەبێت زانیاری لەبارەی وەرزەکانی ساڵەوە، ئاسمان و ئەستێرەکان، هەڵکردنی با و کەشتیسازییەوە هەبێت. لەو باوەڕەدا نیت ئەوانەی نێو کەشتیەکە، ئەم کەسە بە زۆربڵێ و بێکەڵک دابنێن؟

بێگومان.

وابزانم پێویست بەوە ناکات، بزەی لێوم جارێکی دیکە، لەسەر ئەو خاڵەش ببینیت، کە ئەو کەشتیە، لەگەڵ شارەکەماندا بەراورد بکەین، چونکە تۆ لە مەبەستەکەم تێدەگەیت.

تێدەگەم.

کەوابوو، تۆ بزەی لێو بۆ ئەو کەسە دانێ، کە تێناگات، لەوەی فەیلەسووفەکانمان بە فەرمانڕەوای شارەکەمان داناوە. بۆی ڕوون

بکەرەوە لەپێناوی چیدایە.
بۆی ڕوون دەکەمەوە.
دواجار پێی بڵێ ئەوەی باسی دەکات ڕاستە. چاکترین فەیلەسووف بۆ زۆرینە بێکەڵکە. پێی بڵێ، ڕەخنە لەو کەسە بەڕێزانەش، لەسەر ئەم خاڵە نەگرێت. پێویستە لۆمەی ئەوانە بکات، کە کەڵکی لێ وەرناگرن. سەرۆکی کەشتیەوانێک، لەوانەی ژێردەستی دەپاڕێتەوە گوێڕایەڵی بن، بەڵام ئاسایی نییە، زانایەک لە - دەرگای دەوڵەمەندێک بدات.
ئەمە هەڵەیە.
ئاساییە نەخۆشێک، هەژار یان دەوڵەمەند بێت، لە دەرگای پزیشک بدات، ئەوەی دەیەوێت فەرمانڕەوایی بکرێت لە دەرگای فەرمانڕەوا بدات، بەڵام ئاسایی نییە بۆ فەرمانڕەوایەکی ڕاستەقینە دەرگای فەرمانڕەواییکراوەکانی بکوتێ. بەو کەسە بڵێ بەهەڵەدا ناچێت، ئەگەر فەرمانڕەوای شارەکەمانی خۆش بوێت.
ئەوە ڕاستە.
کەوابوو، بۆ ئەو کەسانەی نرخی ژیانێکی بەرز نازانن، ئاسان نییە ڕێزی لێ بگرن. لەگەڵ ئەمەشدا، ناوزڕاندنی فەلسەفە لەو کەسانەوە دەکەوێتەوە، کە شێوەی ژیانیان فەلسەفیانەیە.
مەبەستت ئەوەیە، کە دەڵێین ژمارەیەکی زۆریان دڕندەن و زۆریشیان، بەڕێز و بێکەڵکن.
منیش لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بووم. وانەبوو؟
بەڵێ.
باسمان نەکرد، بۆچی بەڕێزەکانیان بێکەڵکن؟
باسمان کرد.
حەز دەکەی بزانیت، بۆچی زۆریان دڕندەن؟ هۆی ئەمە بۆ فەلسەفە ناگەڕێتەوە.
بەدڵنیاییەوە.
با بگەڕێینەوە سەر ئەو خاڵەی، گوتمان، کەسێکی چاک، دەبێت سروشتی چاکی هەبێت. ئەگەر لەبیرت بێت گوتمان، ئەو کەسە ڕاستیناسە و هەمیشە شوێن ڕاستی دەکەوێت، ئەگینا ناتوانێت فەلسەفە بخوێنێت.

ئەوەمان باس کرد.

ئایا ئەوە، لەگەڵ ئەو خاڵەی ئێستا باسمان کرد، ناکۆک نییە؟

بێگومان ناکۆکە.

پێویست ناکات بەرگری (لە فەیلەسووف) بکەین و بڵێین، گەڕان بەدوای ئەو شتەی هەیە، لە سروشتی فەیلەسووفدایە و تاکو نەگاتە ئەو شتانە کۆڵ نادات. ئەوەی بە ڕاستیش بگات و لە واتاکەی تێبگات، دەزانێت چۆن بەڕاستی بژی. ئەمەش وەکو ئەوە وایە، لە ئازار و ژانی منداڵبوون ڕزگاری بووبێت.

ئەوە بەرگریکردنی، چاکە.

باشە، ئەو کەسە، بەشێکی ناڕاستی خۆش دەوێت؟ یان بەتەواوی ڕقی لە ناڕاستیە؟

ڕقی لێیەتی.

ئەگەر، ڕاستی بەرقەرار بێت، ناتوانین بڵێین، کە بەشێک لە خراپە دەکەوێتە ڕێگەی.

چۆن ئەوە ڕوودەدات؟

(لە جێگەی خراپە) هەڵوێستی تەندروست و دادوەرانە و مامناوەندی دەبێت.

ئەوە ڕاستە.

چ پێویست دەکات، جارێکی دیکە، لە سەرەتاوە، دەسەڵات بەسەر سروشتی فەلسەفی خۆیدا بگرێت؟ لەبیرت نەچێت، ئەو کەسە خەسڵەتەکانی، وەکو ئازایەتی، بیرکردنەوەی بەرز، خێرا فێربوون و بیرکەوتنەوەی چاکیشی هەیە. لەسەروو ئەمەشەوە تۆ دەڵێیت، سەرنجدانێکی ورد نەیارەکانمان دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی زۆر لەم (فەیلەسووفانە) بێکەڵک و هەندێکیشیان خراپ بن. ئێمە هۆی ئەم ناوزڕاندنەمان باس کرد. گەیشتینە ئەو خاڵەی زۆریشیان بە خراپ دادەنرێن. لەبەرئەمە هەوڵم دا، سروشتی فەیلەسووفی ڕاستەقینەت بۆ باس بکەم.

ڕاستە.

ئێستا، کاتی ئەوە هاتووە بزانین، ئەو سروشتە چۆن گەندەڵ دەبێت. چۆن لای زۆر کەس لەناو دەچێت و ژمارەیەکی کەمیان

(ئەوانەی تۆ بە بێکەڵک ناوزەدت کردن) بە پاکی دەمێننەوە. پاش ئەمە، دەڕوانینە سروشتی ئەو دەروونانەی، لاسایی سروشتی فەیلەسووفانە دەکەنەوە و خۆیان بە فەیلەسووف نیشان دەدەن. هەوڵ دەدەین بزانین، چۆن ئەمانە دەگەنە ئەو پلەی ژیانەی شیاوی نین و لە ژوور توانای ئەوانەوەیە، چونکە خۆیان لە ناڕاستی نەپاراستوە. ئەمەش ئەو ناوزڕاندنە بە فەلسەفە دەدات، کە تۆ باست کرد.

لە چ ڕوویەکەوە، گەندەڵن؟

هەوڵ دەدەم بیانژمێرم. گریمان هەموو لەسەر ئەو خەسڵەتانە ڕێدەکەوین، کە دەبن بە مەرج بۆ بوونی فەیلەسووفی ڕاستەقینە. ئەم خەسڵەتانەش بەدەگمەن لەنێو هەموو کەسێکدا دەدۆزرێنەوە. وانیە؟

بەدڵنیاییەوە وایە.

بیر لەو هۆیانە بکەوە، کە ئەم ژمارە کەمە لە خەڵکی تووشی گەندەڵی دەکەن.

ئەوانە چین؟

بۆ تۆ جێگەی سەرسوڕمانە، ئەگەر ببیستیت هەریەکێک لەو خەسڵەتانە ستایشمان بۆ کرد، دەبێتە هۆی گەندەڵی و ئەو دەروونەی هەیەتی لە فەلسەفەی دووردەخاتەوە. مەبەستم لەو خەسڵەتانەش ئازایەتی، مامناوەندێتی و ئەوانی دیکەیە، کە ئاماژەمان بۆ کردن.

ئەوە سەیرە.

هەروەها، هەموو ئەو شتانەی بە چاکمان دانان، ئەم دەروونە گەندەڵ دەکەن و لە فەلسەفەش دووری دەخەنەوە- بۆ نموونە: جوانی، تەندروستی، هێزی لەش، خزم و کەسی خاوەن دەسەڵات لە شاردا، هەموو ئەوانەی دیکەی لەم جۆرەن. تۆ دەزانی، من بیر لە چی دەکەمەوە؟

من دەزانم، بەڵام خۆشحاڵ دەبم ئەگەر زۆرتر فێر بم.

ئەگەر بەتەواوی لە مەبەستم تێبگەیت، کێشەکەت لا ڕوون دەبێتەوە. خاڵەکەی پێشووت بە لاوە سەیر نابێت.

تۆ چیت لەمن دەوێت؟

ئێمە دەزانین، تۆوێک خێرا گەورە بێت و ببێت بە ڕووەک، یان ئاژەڵێک لە خۆراک یان وەرز و شوێنی گەشەکردنی خۆی بێبەری

بێت، کەموکورتی تێدا سەرهەڵدەدات. ئەوەی خراپە دژی چاکەیە نەک ناچاک. بێگومان وایە.

کەوابوو، دەشێ چاکترین سروست، بەبێ پەروەردەیەکی ڕێک وپێک خراپ ببێت.

وایە.

ئەدیمەنتۆس پێم بڵێ، ئایا ئەمە بۆ ئەو دەروونە چاکانەش ناشێت، کە بە پەروەردەکردنێکی خراپ زۆر خراپ دەبن؟ یان دەڵێیت، خراپە و نادادوەری لەنێو دەروونە ئاساییەکانە و لە پەروەدەی خراپی دەروونە چاکەکاندا نییە؟ یان دەروونێکی لاواز هۆی خراپە یان چاکەیە؟

نا، تۆ ڕاست دەڵێیت.

ئێستا، بەگوێرەی بیرکردنەوەی من، دەروونـی فەلسەفی، پاش پـەروەردەکـردنـی، هـەمـوو خەسڵەتێکی چـاک هەڵدەگرێت. ئەگەر پەروەردەکەی خراپ بوو، (وەکو تۆوێک) لە زەوی خۆیدا نەنێژرا خراپ دەردەچێت، مەگەر خوا ڕزگاری بکات. تۆ لەگەڵ ئەو بۆچوونەدای، کە گوایە سۆفیستەکان لاوان تووشی گەندەڵی دەکەن؟ ئایا ئەوانەی ئەمە دەڵێن خۆیان سۆفیست نین، کە لاوان، ژن و پیاو یان مرۆڤە بەتەمەنەکان، بەو جۆرە فێر دەکەن ئەوان دەیانەوێت؟

کەی ئەو کارە دەکەن؟

کاتێک پێکەوە لە ئەنجوومەنەکان، دادگا، شانۆ یان لەشکرگاکاندا دادەنیشن. لەنێو خەڵکدا بە دەنگی بەرز نارەزایی یان بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن. ئەوانەی شوێنیان دەکەون چەپڵەیان بۆ لێدەدەن و هاوار دەکەن. ئەم حاڵەتانە، چ کاریگەرییەکی لەسەر دەروونی لاوان هەیە؟ چ مامۆستایەکی تایبەت ستایشی پێ خۆش نییە، یان نایەوێت لۆمەی بکرێت؟ ئەو دەیەوێت خواردنی بخرێتە بەردەم و بۆ هەر شوێنێک بڕوا، بە دڵی خەڵکی باسی جوانی و ناشرینی دەکات. وەکو ئەوان دەژی و لەوانیش جیاواز نییە؟

سوکرات، ئەو مامۆستایە لەژێر زەبرێکی زۆردایە.

هێشتا باسی سەخترین زەبرمان نەکردووە.

ئەوە چیە؟

ئـەگـەر ئـەم فـێـرکـەرانـە، یـان سۆفیستانە، بـزانـن گوتەکانیان

(بەرانبەرەکەیان) ڕازی ناکات، بە کردەوە دەیسەپێنن. نازانی سزای ئەوانە دەدەن لەسەر بۆچوونەکانیان ڕێک ناکەون؟
دەبێت ئەوە بکەن.
چ جۆرە سۆفیستێک دژی ئەمانە سەرهەڵدەدات؟
لەو باوەڕەدا نیم سەرهەڵبدات.
نا، بێگومان. کارێکی گەمژانەیە دژیان ڕاوەستیت، چونکە لە ڕابردوو، ئێستا و داهاتووشدا نییە و نابێت ئەو خەسڵەتە نائاساییە هەبێت. کەس نییە فێری چاکەکردن کرابێت و بەو جۆرە دەرنەچێت. هەرکەسێک بووبێت بەو کەسەی لە دەستوورەکەماندا بۆی دانراوە، دەتوانێت بڵێت، هێزێکی پیرۆز بەخشیوێتی و ڕزگاری کردوە.
من لەگەڵتام.
کەوابوو، دەبێت لەسەر ئەم خاڵەش لەگەڵما بیت.
چ خاڵێک؟
ئەو مامۆستایانەی بە پارە وانە دەڵێنەوە و بە سۆفیست ناسراون، هیچ شتێکی جیاوازتر لەوەی خەڵکی دەیزانن و باوەڕیان پێیەتی فێری خوێندکاران ناکەن. سۆفیستەکان ئەو جۆرە زانینە بە فەلسەفە دادەنێن. ئەمەش وەکو ئەوە وایە، فێری مەزاج و ئارەزووەکانی دڕندەیەکی گەورە ببین، کە دەنەڕێنێ. دەمانەوێت بزانین چۆن لێی نزیک ببینەوە و مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، لە کاتێکدا زۆر سەختە نزیکی بکەوینەوە.
چ دەنگێک بێزاری دەکات، یان هێمنی دەکاتەوە. پاش فێربوونی ئەم شتانە وماڵیکردنی دڕندەکە، زانیارییەکان کۆدەکەینەوە و ناوی دەنێین فەلسەفە و خەڵکی فێر دەکەین. ئەم جۆرە فێرکەرانە، لەبارەی چاکی و خراپی، دادوەری و نادادوەری زانینەکە نازانن، بەسەر ئەو کەسانەدا دەیسەپێنن، کە دەیانەوێت مامەڵە لەگەڵ دڕندەکەدا بکەن. ئەوەی دڕندەکە توڕە دەکات، بە خراپ و ئەوەی هێمنی دەکاتەوە بە چاک دایدەنێن. بێجگە لەمە چی دیکەی پێ نییە. ئەوەی دەیسەپێنێت بە دادوەر ناوزەدی دەکات، چونکە بێجگە لەمە چی دیکە نابینێت. ئایا ئەم جۆرە فێرکردنەت لا سەیر نییە؟
بەلامەوە سەیرە.
ئەمە لەو کەسەوە جیاواز نییە، کە تێگەیشتنی مەزاج و خۆشی،

زۆربەی خەڵک بەلاوە گرنگ نییە، لەبارەی هونەری شێوەکاری، مۆسیقا یان ڕامیارییەوە بێت، بە فەلسەفە دابنێت؟

ئەگەر شاعیرێک هۆنراوە بۆ کۆمەڵێک بخوێنێتەوە، یان کەسێکی دیکە بەهرە و پیشەی خۆی نیشان بدات و فێریان بکات، وەکو دەڵێن، دەکەوێتە ژێر زەبری دایۆمیدیانەوە و ئەو کارە دەکات خەڵکی دەیانەوێت. ئایا نەتبیستوە ئەم شتانە بەڕاستی جوان و چاکن و بەتەواوی گاڵتەبازی نین؟42.

نا، نامەوێت گوێم لەوەش بێت.

ئەم خاڵانەت لەبیر نەچێت، بیر لە وەڵامی ئەم پرسیارەش بکەوە: ئایا زۆرینە بە خودی جوانی، بەرانبەر شتە جوانەکان، یان هەر جوانیەک بە تەنیا، ڕازی دەبن، یان ڕەتی دەدەنەوە؟

نا، بەهیچ جۆرێک ڕازی نابن.

کەوابوو، زۆرینە ناتوانێت فەلسەفیانە بیر بکاتەوە.

هەمان کات، لەگەڵ ئەو کەسانەدا نین، کە فەلسەفەکارن.

بەدڵنیاییەوە.

هەروەها، ئەو کەسانەی شوێن بیروباوەڕی زۆرینەی خەڵک دەکەون، دەیانەوێت دڵی زۆرینە خۆش بکەن.

ئاشکرایە.

باشە، ئەو کەسەی بە سروشت فەیلەسووفە، دەیەوێت بە ڕاستی تاکو کۆتایی ژیانی فەلسەفیانە بژی، ڕزگاری دەبێت؟ بیر لەوەش بکەوە گوتمان فێربوونی خێرا، بیرهاتنەوەی چاک، ئازایەتی و بیرکردنەوەی بەرز، خەسڵەتی سروشتی فەلسەفین.

بەڵێ.

هەر کەسێک ئەم سروشتەی هەبێت، لەنێو منداڵاندا لە هەموو ڕوویەکەوە لە پێشتر نابێت؟ بەتایبەتی ئەگەر باری لەشیشی هاوتەرازی ئەم دەروونە بێت؟

چۆن نابێت؟

ئەم کەسە چەند بە تەمەندا بڕوات، ئەوەندە زۆرتر ئەندامانی خێزانەکەی و هاوڵاتیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباریان سوودی لێ وەردەگرن.

هەڵبەتە.
داوای ڕاوێژکاری لێ دەکەن.
ئەوە ڕوودەدات.
ئەگەر کەسێک بەمجۆرە بێت، لە شارێکی گەورەدا بژی، دەوڵەمەند بێت و لە خێزانێکی چاکەوە پەیدا بووبێت، باڵابەرز و جوان بێت، دەڵێی چی؟ لەو باوەڕەدا نیت ئەو کەسە، لە خۆی ڕەوا دەبینێت، نەک کاروباری یۆنانییەکان، بەڵکو بەربەرییەکانیش بەڕێوەبەرێت؟ لە ئاکامدا، بەبێئەوەی تێگەیشتنێکی تەواوی هەبێت خۆی بە گەورە نابینێت؟
بەدڵنیاییەوە، لە خۆی بایی دەبێت.
ئەگەر کەسێک، لەو لاوە نزیک ببێتەوە و ئەو ڕاستیەی پێ بڵێ، کە ئەو خاوەنی تێگەیشتنێکی تەواو نییە، پێویستە زۆرتر تێبگات و بۆ ئەمەش وەکو کۆیلە ڕەنج بکێشێت، هەست دەکەیت لەنێو ئەو هەموو شتە خراپانەی دەوریان داوە، گوێ لەو کەسە بگرێت؟
گوێ ناگرێت.
تەنانەت لاوێکیش، لەبەرئەوەی سروشتێکی چاکی هەیە، فێری فەلسەفە دەبێت و لە هۆشەوە نزیکە، کاتێک خەڵکی سوود لە زانین و هاوڕێیەتیەکەی وەرناگرن، چ دەڵێن؟ هیچ ناکەن، یان نایەڵن ڕازی بێت؟ یان ڕازیکەرەکەی بەرەو دادگای دەبات، تاکو ڕێگەی ڕازیبوونی لێ بگرێت؟
بەدڵنیاییەوە، بەو جۆرە نییە.
بوارێک بۆ ئەو کەسە پەیدا دەبێت، تاکو زانینە فەلسەفیەکەی تێدا بەکاربهێنێت؟
پەیدا نابێت.
ئێستا ئەو خاڵەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە گوتمان ئەو کەسەی خاوەنی سروشتێکی فەلسەفیە بە چاکی پەروەردە ناکرێت. بەشەکانی دیکەی دەروونی، لەگەڵ ئەو شتانەی بە چاکە ناوزەدمان کردن، وەکو سامان و جۆرەکانی دیکە، دەبن بەهۆی دوورخستنەوەی لە ژیانێکی فەلسەفیانە.
من بیرمە و ئەوەش ڕاستە.

ئەوانە ڕێگاکانن، کە تیایاندا سروشتێکی چاک گەندەڵ دەبن و لەناو دەچن. لەنێو ئەم جۆرە کەسانەدا (گەندەڵەکان) ئەو کەسەش دەدۆزینەوە، کە دەتوانێت خراپترین کار بەرانبەر شارەکە و هاوڵاتیان بکات.

ئەوە ڕاستە.

ئەم جۆرە کەسانە، ئەوانەی بۆ فێربوونی فەلسەفە دەشێن و لەو فێربوونە دووردەکەونەوە، ژیانی فەلسەفیانە وێران دەکەن و دەیکەن بە کەلاوە. ژیانێکی ساختە و نالەبار دەبەنە سەر. ئەوانەی شیاوی فێربوونی فەلسەفەش نین، وەکو چۆن یەکێک بەزەیی بە منداڵێکی هەتیوودا دێتەوە و دەیەوێت بیپارێزێت، دێنە لای  فەلسەفە و خۆیان دەکەن بە خاوەنی. ئەم کەسانە فەلسەفە شەرمەزار دەکەن و ئەوانەن، کە تۆ بێکەڵک دایاندەنێیت و زۆرینەش تووشی ناخۆشی دەکەن.

ئەوە ڕوودەدات.

ئەمە لەو تەنەکەچیە سەرڕووتاوەیە ناچێت، کە تازە لە زیندان دەرچووە، لەبەرئەوەی کەمێک پارەی هەیە چۆتە حەمام، جلوبەرگی نوێی لەبەر کردووە و داوای کچی خاوەن ئیشەکەشی دەکات، شووی پێ بکات، چونکە کچەکە هەژارە و کەس بەخێوی ناکات؟

وەکو ئەو وایە.

چ جۆرە منداڵێک، لەو جووتبوونەدا پەیدا دەبێت؟ زۆڵ و کەموکورت نابێت؟

وا دەبێت.

چۆنە ئەو کەسانەی، شیاوی خوێندنی فەلسەفە نین، فەلسەفە بخوێنن و لەگەڵیدا بژین؟ چ جۆرە بۆچوون و بیرکردنەوەیەکیان دەبێت؟ ئەوان سۆفیست نین، کە زانینێکی ڕاستیان لا نییەو ئەوەی دەیزانن ساختەیە؟43.

بەتەواوی ڕاستە.

ئەوەی دەمێنێتەوە، ئەدیمەنتۆس، دەستە و تاقمێکی کەمە شیاوی فێربوونی فەلسەفە بن و ژیانێکی فەلسەفیانە ببەنەسەر: ئەوەی بە سروشت شیاوی ئەم فێربوونەیە نابێت تووشی گەندەڵی بێت. هەندێک ڕقیان لە پیشەکەی خۆیانە، چونکە لەگەڵ سروشتیاندا ناگونجێ و

وازی لێ دەهێنن و فەلسەفە دەخوێنن. هەندێک، وەکو تیاگس، دەتوانێت فەلسەفە بخوێنێت، بەڵام باری لەشی ڕێگەی نادات ڕۆڵی ڕامیاری ببینێت. دواجار، نموونەکەی منیش لەوانەیە شیاوی باسکردن نەبێت. ئەویش نیشانەی دێوەکەیە44، چونکە تەنیا لە مندا یان لە چەند کەسێکی کەمدا ڕوویداوە. ئەندامانی ئەم دەستە و تاقمە بچووکە تامی شیرینی فەلسەفەیان چێژتووە. شێتێتی زۆرینەیان بۆ دەرکەوتووە و دەزانن کەس بە ڕێکوپێکی کارەکان بەڕێوە نابات. بۆ سەقامگیرکردنی دادوەری یاریدەدەریان نییە و پەنا بۆ کەس نابەن. ئەگەر پەنا بۆ خەڵکی بەرن ناگەن بەوەی خزمەتی شارەکە و خۆشیان بکەن، وەکو ئەو کەسەی دەکەوێتە بەردەم چەند ئاژەڵێکی دڕندە خۆیان بێ دەسەڵات دەبینن. هاوکات ئامادەش نین، بچنە ڕیزی ئەوانەوە و لە کارە خراپەکانیاندا هاوبەشی بکەن. ئەوەندەش بەهێز نین دژیان ڕاوەستن. وەکو چۆن کەسێک لە کاتی زریانێکی توونددا، لەبەر دیوارێکی نزمدا خۆی حەشار دەدات، فەیلەسووفیش، پاش بینینی خەڵکی بەو جۆرە، بەوە ڕازییە ژیانی خۆی لە (گەندەڵی) و نادادوەریی بپارێزێت و خۆی لە لۆمە ڕزگار بکات.

ئەوە پێش دەرچوونی کارێکی ئاسان نییە.

کارێکی مەزنیش نییە، چونکە هەلی لە دەستوورەکە وەرنەگرتووە، کە بۆ ئەو دانراوە. بەگوێرەی دەستوورێکی لەبار، ئەو دەتوانێت خۆی و کۆمەڵەکەی ڕزگار بکات. من بزانم نەمانتوانیوە، هۆی ناوزڕاندنی فەلسەفە و خراپی ناوزڕێنەرەکە بدۆزینەوە. مەگەر تۆ شتێکی بخەیتەسەر.

هیچم نییە. بەڵام چ دەستوورێکی ئەمڕۆ، بۆ فەیلەسووفەکان شیاوە؟

هیچ دەستوورێکی ئەمڕۆ شیاو نییە. ئەمە ڕەخنە و گلەیی منە: هیچ دەستوورێکمان شیاوی سروشتێکی فەلسەفی نییە. لەبەرئەمە ڕێگەی گەشەکردنی ئەو سروشتە گیراوە. ئەمەش، وەکو چاندنی تۆوێکە لە خاکێکی بێگانە و نەگونجاودا. سروشتی فەلسەفی بەم جۆرە گەشە ناکات و شتێکی دیکەی لێوە پەیدا دەبێت. ئەگەر دەستوورێکی چاکمان هەبێت، یان چاکترین بێت دەستوورە پیرۆز و سروشتەکانیش مرۆڤانە

دەبن. دەزانم دەتەوێت بپرسیت چاکترین دەستوور چیە؟
لێرەدا بەهەڵەدا چوویت. من ئەو پرسیارە ناکەم. ئێمە لە دامەزراندنی شارەکەماندا، باسی دەستوورمان کرد، یان شتێکی دیکە؟
لە هەندێک ڕووەوە باسی دەستوورمان کرد. هەروەها گوتمان دەبێت کەسانێک هەبن لە دەستووردانان بزانن.
ئەوانەی ڕێگە نیشاندەرن، وەکو پارێزەر لە دانانی یاسادا.
ئێمە ئەوەمان باس کرد.
بەڵێ، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ گوتت، سەلماندنی سەخت، پێویستی بە کاتی زۆرە لەسەری نەدواین.
ئێستاش ئەوەی ماوە. ئاسان نییە ڕوونی بکەینەوە.
ئەوە چیە؟
هەموو شتێکی مەزن. تووشی ڕووخان دەبێت. گوایە دژوارە شتی چاکمان دەست بکەوێت. ئێستاش دەبێت بزانین چۆن، ئەو شارەی فەلسەفەی تێدایە بەردەوام دەمێنێتەوە؟
هەرچۆنێک بێت، پێویستە ئەم خاڵە ڕوون بکەینەوە.
ئەوەی ڕێگرمانە، کەم حەزیمان نییە، بەڵکو کەم تواناییمانە. تۆ دەزانی من چەند حەز دەکەم ڕوونی بکەمەوە، چۆن بەپەرۆشەوە دەڵێم، ئەو شارەی فەلسەفە تیایدا بەرقەرارە، بەپێچەوانەی شارەکانی ئەمڕۆمانەوەیە.
چۆن؟
ئەمڕۆ ئەوانەی فەلسەفە دەخوێنن، کەسانێکن لە تەمەنی لاوێتیدا کارێکی دیکە، وەکو بازرگانی و بەڕێوەبردنیماڵیان نەگرتۆتە دەست. بە گەیشتن بە بەشە سەختەکەی، ئەو بەشەی دەبێت هەڵسەنگاندنی هۆشەکی بەکار بهێنێت، واز لە فەلسەفە دەهێنن. خەڵکیش وا دەزانن، ئەوانە خوێندنی فەلسەفەیان تەواو کردوە و فێربوون. دواجاریش، کە یەکێک بانگیان دەکات ئامادەی کۆڕێکی فەلسەفی بن، دەڕۆن و گوێ دەگرن. فەلسەفە بە کارو پیشەی خۆیان دانانێن. کاتێک پیریش دەبن، تینوێتیان بە فەلسەفە ناشکێ، وەکو خۆرەکەی هیراکلیس دەکوژێنەوە.
ئەوان چی بکەن؟

بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەوەی فێر دەبن، لەبارەی فەلسەفەوە، لە منداڵی و لە لاوێتیدا دەیخوێنن، دەبێت بۆ تەمەنی گەورەییان بەسوود بێت: کاتێک گەورە دەبن، پێویستە ئاگایان لە لەشیان بێت و بۆ خزمەتکردنی فەلسەفە بەکاری بهێنن؛ لەگەڵ گەورەبوونی تەمەن و پێگەیشتنی بیرکردنەوەدا، دەبێت وەرزشە دەروونییەکان زۆرتر بکەن؛ ئەو کاتەی توانای خزمەتکردنیان نەما و نەیانتوانی کاروباری لەشکر بەڕێوەبەرن، کاری سەختیان نادەینێ و دەمانەوێت لێرە (لە شارەکەماندا) بەختەوەرانە بژین.

سوکرات، تۆ چاک بۆ کێشەکە چوویت، بەڵام دڵنیام لەوەی گوێگرەکانت بە تراسیماکۆسیشەوە، دژی بۆچوونەکەتن و بەوە ڕازی نین.

ئاژاوە لەنێوان من و تراسیماکۆسدا دروست مەکە. ئێمە تازە بووین بە هاوڕێ، بەڵام هیچ کاتێک دوژمنی یەکدی نەبووین. من کۆڵ نادەم تاکو تراسیماکۆس و ئەوانی دیکەش ڕازی دەکەم، یان هەوڵ دەدەم کارێک بکەم، جارێکی دیکە ژیانەوە، یان بەجۆرێکی دیکە هەبن سوودی بۆیان هەبێت.

تۆ باسی شتێک دەکەیت، بەمزووانە ڕوونادات.

منیش لە وەڵامدا گوتم، ئەو کاتە لەگەڵ ژیانی هەمیشەییدا، بەراورد ناکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا لەو باوەڕەدا نیم، زۆر کەس باوەڕ ناکات؛ چونکە ئەوەیان نەدیوە، کە ئێمە باسی دەکەین؛ ئەوەی بینیویانە (یان دەیزانن) لاساییکردنەوەی فەلسەفەی (ڕاستەقینەیە)، کە لە ڕیزکردنی وشەی ڕازاوە، بەبێ یەکێتییەکی سروشتی لەنێوانیاندا پێکهاتووە. ئەو مرۆڤەی بە بیرکردنەوە و کردەوە، خاوەنی چاکەیە و فەرمانڕەوای شارێکە، وەکو (فەرمانڕەواکردنەکەی) چاکە. خەڵکی ئەم جۆرە شارەیان نەبینیوە. لەو باوەڕەدای بینیبێتیان؟

نا. بێگومان.

هاوڕێم نا. بەتەواوی نەیانبیستوە، چۆن هەندێک کەس ئازادانە، بۆ دۆزینەوەی ڕاستی خۆیان ماندوو دەکەن. بە بایەخەوە، ئاوڕ لەو مشتومڕانە نادەنەوە، کە ئاکامەکەیان بە بۆچوونمان (نەک زانین) دەگەیەنێت.

ئەو گوتی: ئەو جۆرە کەسانە لە باسەکەی ئێمە تێناگەن.
لەبەر ئەم گرفتانەی، لە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردن، دەترساین ئەم خاڵە باس بکەین، بەڵام ڕاستی هانیداین بڵێین، هیچ شار و دەستوور و تاکێک، ناگاتە پلەی تەواو کۆتایی، تاکو فەیلەسووفەکان، ئەوانەی ئێمە بە بێکەڵک ناوزەدمان کردن و تووشی گەندەڵی نەبوون، فەرمانڕەوایی نەکەن. گرنگ نییە فەیلەسووفەکان بیانەوێت، یان نەیانەوێت فەرمانڕەوایی بکەن، پێویستە هاوڵاتیان ملکەچی فەرمانەکانیان بن. ئەگەر ئەمە نەکرێت، ئەوا دەبێت چاوەڕانی خوداوەند بین، پاشاکانی ئەمڕۆ و منداڵەکانیان، بەرەو خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە بۆ فەلسەفە بەرن. هیچ هۆیەک نابینم، تاکو جەخت لەسەر ئەوە بکەم، ئەم دوو ڕێگەیە مەحاڵ بن ئەگینا، خۆمان دەخەینە بەر گاڵتە و دەبین بە خەوبینەر. ئایا من ڕاست ناڵێم؟
تۆ ڕاستیت.
لەم حاڵەتەدا، ئەگەر لە ڕابردوویەکی دووردا، یان ئێستا و داهاتووشدا هەڵکەوێت، کە فەیلەسووفێکی ڕاستەقینە هەیە، فەرمانڕەوایی شارەکەمان بکات، ئەو کاتە ئێمەش دەڵێین دەستوورەکەمان بەرقەرار بووە. ئەمەش کارێکی گرانە، بەڵام مەحاڵ نییە.
من لەگەڵتا هاوڕام.
دەتەوێت بڵێی، زۆرینەی خەڵک، لەگەڵ ئەم بیروڕایەدا نییە؟
منیش گوتم: هاوڕێ، ڕەخنە لە زۆرینە مەگرە. ئەوان بیروڕاکانیان دەگۆڕن. ئەمەش بەزۆر نابێت، پێویستە لەسەرخۆ و بە نەرمی فێرکرێن. فەیلەسووفی ڕاستەقینەیان پێ بناسێنە و خەسڵەتەکانی سروشتیی فەلسەفیانەیان بۆ ڕوون بکەوە. ئەگەر ئەوان، فەیلەسووفی ڕاستەقینە بناسن، بیروڕاکانیان دەگۆڕێت و جیاوازتر وەڵامی پرسیارەکە دەدەنەوە. کێ دژی خۆشەویستی خۆی ڕادەوەستێت؟ لەو باوەڕەدای کەسێک شەڕخواز و دڵڕەق نەبێت، بەرانبەر کەسێکی نەرم و دڵپاک حەسوود بێت؟ من لە جێگەی تۆ، وەڵامی ئەم پرسیارانە دەدەمەوە. دەشێ چەند کەسێکی شەڕخواز و دڵڕەق هەبن، بەڵام زۆرینەی خەڵک بەمجۆرە بیرناکەنەوە.
من لەگەڵتام.

تۆ لەگەڵ مندا نیت، کە ئەوانەی بەرانبەر فەلسەفە، شەڕخواز و دڵڕەقن، ئەو کەسانەن بەبێئەوەی بانگ کرابن خۆیان دەکەن بە ماڵاندا، زەمی خەڵک دەکەن و ناشرینی لە هەموو شتێکدا دەدۆزنەوە، باسی کەسانی دیکە بە خراپی دەکەن؟

من لەگەڵتام.

ئەدیمەنتۆس، ئەو کەسەی، بیری خستۆتە سەر بوونە ڕاستەکان، کاتی بۆ باسکردنی خەڵکی و دڵڕەقی و حەسوودی نییە. ئەو چاو دەبڕێتە (ڕاستیە) نەگۆڕەکان، کە کەس لەم تێڕوانینەدا بریندار نابێت و هۆش جڵەوی شتەکان دەگرێتە دەست. ئەو بەپێی توانا لاسایی ئەو (ڕاستیانە) دەکاتەوە. کەس هەیە، لەگەڵ ئەو شتانەی حەزیان لێ دەکات، بژی و لاساییان نەکاتەوە؟

کەس نییە.

فەیلەسووفیش، لەبەرئەوەی چاوی خستۆتە سەر بیرەکان و لەگەڵیاندا دەژی، خۆی دەکات بە کەسێکی پیرۆز.

هەڵبەتە.

ئەگەر زۆری لێ بکرێت، ئەوەی دەیزانێت فێری کەسێکی دیکە، یان خەڵکی بکات، لەو باوەڕەدایت لێزان نەبێت و نەتوانێ بیکات؟ لەو باوەڕەدای خۆڕاگر، دادوەر، یان کەسێکی چاک نەبێت؟

لەو باوەڕەدا نیم.

ئەگەر زۆرینە باوەڕ بە ئێمە بکەن، بەرانبەر فەیلەسووفی ڕاستەقینە، شەڕەنگیزانە ڕادەوەستن؟ باوەڕیان بە ئێمە دەبێت، کە دەڵێین شارەکەمان خۆشی بە خۆیەوە نابینێت، تاکو نەخشەی شارەکە، لەسەر مۆدێلێکی پیرۆز هونەرمەندان نەیانکێشابێت؟

ئەگەر تێبگەن شەرەنگێز نابن، بەڵام مەبەستت لەو نەخشەیە چیە؟

ئەوان نەخشەی شار و ڕەفتاری هاوڵاتیان، وەکو وێنەکێشان، لەسەر کانڤاسێکی پاک دروست دەکەن. ئەمەش جیاوازییە لەنێوان ئەمان و (سیاسەتمەدارەکانی) دیکەدا. ئەوان بەبێ ئەو کانڤاسە پاکە، یان پاککردنەوەی کانڤاسەکە، دەست بە کارەکە ناکەن.

ئەو کارەیان دروستە.

لەو باوەڕەدا نیت پاش ئەم کارە دەستوورەکە بنووسن؟

هەڵبەتە.
بۆ ئەم کارە، دەڕواننە هەموو ئەو لایەنانەی، بە دادوەری و جوانی و مامناوەندییان دەناسێنێت. هەروەها ئەوانەی دەیانەوێت، لە ژیانی مرۆڤدا سەقامگیریان بکەن. هەموو ئەم لایەنانە تێکەڵ دەکەن و هەڵدەسەنگێنن، تاکو ئەو نموونەیە دادەهێنن، کە هۆمیرۆس بە"شێوە و نموونەیەکی پیرۆز" ناوزەدی دەکات.
ئەوە ڕاستە.
شتێک دەسڕنەوە و شتێکی نوێی لە جێگە دادەنێن، تاکو بەو نموونەیە دەگەن. خواکانیش خۆشیان دەوێن.
بێگومان، بەم شێوەیە، بە نموونەیەکی چاک دەگەن.
ئایا ئەمە، ئەو کەسانەی دژمان وەستان، دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە ئەو کەسەی باسی دەکەین، توانای دانانی دەستووری بۆ شارەکەمان هەیە؟ ئایا بەرانبەری نەرم نابن؟
ئەگەر تێبگەن نەرم دەبن.
بێگومان. چۆن دژی ڕادەوەستن؟ دەتوانن نکوڵی لەوە بکەن، کە فەیلەسووفەکان خۆشەویستی ڕاستین؟
ئەگەر نکوڵی لێ بکەن گەمژەن.
یان سروشتی (فەلسەفیانە) بەو جۆرەی باسمان کرد، لە بەرزترین چاکەوە نزیکە؟
ناتوانن نکوڵی لەمەش بکەن
پێم بڵێ، ئەوان لەو باوەڕەشدا نابن، ئەگەر ئەو سروشتە پەروەردەکردنێکی لەباری هەبێت زۆر چاک و زانا دەرناچێت؟ یان ئەو سیاسەتمەدارانەیان دەوێت، ئێمە لە شارەکەماندا نامانەوێن؟
بێگومان ئەوە ناکەن.
دەگونجێت تووڕە بن، لەوەی تاکو فەیلەسووفەکان فەرمانڕەوایی شارەکەمان نەکەن و هاوڵاتیان لە خراپە نەپارێزین، ئەو شارە نموونەییەی نەخشەی بۆ دەکێشین، نایەتە کایەوە؟
لەوانەیە هێمن ببنەوە.
ئەگەر ڕازی بیت، من ناڵێم نەرمتر دەبنەوە، بەڵکو بەتەواوی هێمن دەبنەوە و ڕازی دەبن. هیچ نەبێت ڕێنەکەوتنیان لەگەڵ ئێمەدا، تووشی

شەرمەزارییان دەکات.
ئەوە دروستە.
کەوابوو، گریمان لەسەر ئەم خاڵە ڕێدەکەون. کەس دژی ئەوە نییە، کە بڵێین منداڵانی فەرمانڕەواکان، یان پاشاکان خاوەنی سروشتێکی فەلسەفین؟
کەس دژی نییە.
کەس لەو باوەڕەدایە، ئەم منداڵانە گەندەڵ بن؟ ئێمە گوتمان پاراستنیان لە گەندەڵی سەختە، بەڵام دەکرێ بڵێین، کە کەسیان لەو گەندەڵییە ناپارێزرێت؟
چۆن ئەوە دەڵێیت؟
بەڵام یەکێک لەو (فەیلەسووفانە) بەسە فەرمانڕەوایی بکات و کاروباری شارەکە (دەوڵەتەکە) بەڕێوەبەرێت؟
بەدڵنیاییەوە.
ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە، یاساو جۆری ژیان بەو شێوەیەی باسمان کرد، بەرێت بەڕێوە، هاوڵاتیانیش ئامادەن شوێن فەرمانەکانی بکەون؟
بەڵێ.
کەوابوو، ڕازیبوونی ئەوانەی لەگەڵماندا نارێک بوون، کارێکی مەحاڵ نییە؟
هەست دەکەم مەحاڵ نەبێت.
بەڕای من، ڕوونکردنەوەکەی پێشوومان ئەوە دەردەخات، کە ئەم جۆرە ژیانە لە شارەکەماندا باشترینە.
دروستە.
کەوابوو، یاساکەمان چاکترینە ئەگەر بتوانین بیهێنینە کایەوە. لەوانەیە ئەم کارە سەخت بێت، بەڵام مەحاڵ نییە.
دەتوانین.
ئێستا خۆمان لەو گرفتە ڕزگار کردوە. لەسەر کێشەی ئەو کەسانە دەدوێن، کە دەستوورەکەمان بۆ دەنووسن. هەوڵ دەدەین بزانین، چ هۆکار و شێوازێکی ژیان، ئەم جۆرە کەسانە دەهێنێتە بوونەوە. لە چ تەمەنێکدا شیاوی ئەم کارەن.

پێویستە ئەوە بزانین.
زووتر من زیرەکانە خۆم لە باسکردنی ژنهێنان، منداڵبوون و دامەزراندنی فەرمانڕەواکان دزییەوە. دەمزانی دەوڵەتێکی تەواو کۆ چاوی حەسوودی لەسەرە و لەوانەیە دامەزراندنیشی دژوار بێت. وادیارە زیرەکییەکەم فریام ناکەوێت. ئێستا پێویست دەکات باسیان بکەم. ئێمە باسی ژن و منداڵمان کرد، بەڵام دەبێت بەوردی لە کێشەی فەرمانڕەوا بکۆڵینەوە. لەبیرتە گوتم، فەرمانڕەواکان پێویستە لە خۆشی و ناخۆشیدا شارەکەیان خۆش بوێت. لەنێو ترس و زەحمەتکێشانیشدا بیر لە شارەکە بکەنەوە. ئەو فەرمانڕەوایەی ئەمە نەکات دەبێت لاببرێت. ئەوەی وەکو زێڕ لەنێو ئاگریشدا و لەم ژیانە و لە مردنیشدا ڕەنگ ناگۆڕێت لەو جێگەیە دادەنرێت و ڕێزی لێ دەنرێت. ئەمە لە پێشتر باسمان کرد، بەڵام گفتوگۆکەمان گۆڕانی بەسەردا هات و ڕێگەیەکی دیکەی گرتە بەر.
من ئەوەم لەبیرە.
هاوڕێم وابوو. من پێشتر دەترسام باسی بکەم، بەڵام ئێستا بەبێ ترس و دوودڵیەوە جەختی لەسەر دەکەم، کە پاسەوانەکانمان دەبێت فەیلەسووفەکان بن.
بەڵێ دەبێت وابێت.
وا مەزانە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسووف هەن. ئەو سروشتە فەلسەفیەی باسمان کرد، لەنێو دەستەیەکی کەمدا دەدۆزرێتەوە و بەشەکانی بەجیا گەشە دەکەن.
مەبەستت چیە؟
تۆ دەزانیت، کە فێربوونی خێرا، بیرهاتنەوەی تیژ، زیرەکی، سۆزی لاوێتی، بیرکردنەوەی بەرز و زۆر خەسڵەتی دیکەش پێکەوە گەورە نابن. ئەوانەی ئەم خەسڵەتانەیان هەیە، ڕەوشتبەرزن، وا دروست نەبوون بە ڕێکوپێکی و هێمنی بژین. هێزە جووڵێنەرەکانی ناوەوەیان کاریان تێدەکەن و بێقەراریان دەکەن.
ئەوە ڕاستە.
لەلایەکی دیکەوە، دەروونە بەرقەرارەکان، ئەوانەی بەئاسانی ناگۆڕێن، لە جەنگدا ناترسن و لەو جێگەیە دامەزراون، ئەوانەن

دەبن بە جێگەی دڵنیایی و پشت پێبەستن. بۆ فێربوونیش بەهەمان شێوە کەلەڕەقن: وەکو ئەوانەی مێشکیان وەستاوە هیچ وەرناگرن و فێرکردنیان سەختە. کاتێک دەتەوێت فێریان بکەیت خەویان دێت و لەبەردەمتا باوێشک دەدەن.

ڕاستە.

بێجگە لەمە، لەو باوەڕەدا بووین کەسێک هەبێت هەردوو خەسڵەتەکەی هەبێت و بخرێتە بەر فێربوون و بۆ فەرمانڕەوایی ئامادە بکرێت.

بەدڵنیاییەوە.

ئایا چینێک لەم کەسانە دەدۆزرێتەوە؟

بە ڕای من زۆر کەمە؟

وایە.

کەوابوو، ئەم جۆرە کەسانە، بێجگە لەوەی فێر دەکرێن چۆن لە کاری دژوار، ترس، خۆشی و ناخۆشیدا بەرقەرار بن، پێویستە فێری زۆر بابەتی دیکەش بکرێن، کە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ نەکردوون و ئێستا ناویان دەهێنین. ئەمەش بۆئەوەی بزانین ئەو دەروونانە چۆن بەردەوام دەمێننەوە و گەشە دەکەن.

بەڵێ، پێویستە تاقیان بکەینەوە، بەڵام ئەو بابەتانە چین؟

لەبیرتە، بۆئەوەی لە واتاکانی دادوەری، مامناوەندی و ئازایەتی تێبگەین، دەروونمان کرد بە سێ بەشەوە؟

ئەگەر لەبیرم نەبێت، پێویست ناکات گوێ لە تۆ بگرم.

چی؟

گوتمان: من لەو باوەڕەدام بۆئەوەی چاکتر لەم کێشەیە تێبگەین، پێویستە ڕێگایەکی درێژتر بگرینەبەر و زۆرتر ڕوونی بکەینەوە، بەڵام تۆ ڕازی نەبوویت و گوتت، لەوە زۆرتر پێویست نییە. من هەستم کرد باسەکەمان کەموکورتی تێدا بێت. لەبەر دڵی تۆ لەسەری نەدوام.

من و ئەوانی دیکەش هەستمان کرد لەوە زۆرتر ئەو باسە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نەبێت.

بەڵام هەر پێوانەیەک بۆ ئەو باسە بەقەد پانتایی باسەکە نەبێت کورت دەهێنێت. هەرچەندە خەڵکی بەو کارە ڕازی دەبن، بەڵام هێشتا

نابێت، پێوانەیەکی ناتەواو یان کەموکورت بەکاربهێنین.
بێگومان، تەمەڵی هانیان دەدات بەو جۆرە بیر بکەنەوە.
بەڵێ، هیچ شتێک لـەوە خراپتریش لە پاسەوانەکان و یاسای شارەکەدا نییە.
هەڵبەتە وایە.
کەوابوو، پاسەوان دەبێت، ڕێگەیەکی سەخت و درێژتر بۆ فێربوون بگرێت. خەریکی وەرزشیش بێت، ئەگینا بە بەرزترین پلەی زانین ناگات.
چ زانینێک، لەسەروو زانینەکانەوە سەبارەت بە چاکە و دادوەری بەرزتر دادەنێیت؟ لەبارەی چاکەکانیشەوە نابێت بەسەر پێوە سەرنجیان بدەین، پێویستیان بە ڕوونکردنەوە هەیە. کارێکی نالەبارە، ئەگەر ئێمە مێشکی خۆمان بۆ ڕوونکردنەوەی شتە کەم بایەخدارەکان ماندوو بکەین و ئاوڕ لەو بابەتانە نەدەینەوە، کە شیاوی ئەوەن، بیانناسین و ڕوونیان بکەینەوە.
بەدڵنیاییەوە دروستە. لەو باوەڕەدای لێرەدا وازت لێبهێنین، پرسیار لەبارەی ئەو بابەتە گرنگەوە نەکەین تۆ هێندە بایەخی پێ دەدەیت؟
بێگومان نا. تۆ دەتوانی بپرسیت. دڵنیام وەڵامەکەیت بیستوە، بەڵام بیرت ناکەوێتەوە یان دەتەوێت گرفتم بخەیتە بەر و داوام لێ دەکەیت، جارێکی دیکە ڕوونی بکەمەوە. من هەست دەکەم دەتەوێ جارێکی دی ڕوونی بکەینەوە. شتەکانی دیکەش لە پەیوەندییاندا لەگەڵ ئەم فۆرمەدا، بە چاک و سوودبەخش دادەنرێن. تۆ لە پێشتر ئەمەت دەزانی، بەڵام هێشتا زانیارییەکی تەواومان لەبارەیەوە دەست نەکەوتووە. هەروەها دڵنیام ئەوەش دەزانیت، ئەگەر ئەو (فۆڕمە) نەناسین زانیاری تەواومان سەبارەت بەو شتانەی سوودیان بۆ ئێمە هەیە لا دروست نابێت. لەو باوەڕەدای پێویستە هەموو شتێکمان هەبێت، بێئەوەی سوودەکانیان بزانین؟ یان بێجگە لە چاکە لەبارەی هەموو شتێکەوە، زانیارییمان هەبێت و لێرەدا نەزانین، چ شتێک چاک یان خراپە؟
نا، من بەو جۆرە بیرناکەمەوە.
لەسەروو ئەمەوە، تۆ دەزانیت، کە چێژوەرگرتن بۆ زۆربەی خەڵک، چاکەیە و هەندێکیش زانین بە چاکە دادەنێن.

بەڵێ.
هەروەها دەزانیت، ئەوان ناتوانن ڕوونی بکەنەوە، ئەو زانینە چیە و تەنیا ئاماژەی بۆ دەکەن.
ئەوە سەیرە.
بەڵێ سەیرە. ئەوان لۆمەی نەزانینەکەی ئێمە دەکەن. بەجۆرێک لەگەڵمان دەدوێن وا دەزانن ئێمە پێناسەی ئەو زانینەمان لابێت. ئەوان بە زانین لەبارەی چاکەوە ناوزەدی دەکەن و نازانن، کە واتای " چاکە" هێشتا بۆ ئێمە نادیارە.
ئەوە ڕاستە.
لەبارەی ئەو کەسانەوە چ دەڵێیت، کە چێژ وەرگرتن بە چاکە دادەنێن؟ ئایا ئەمان وەکو دەستە و تاقمەکەی دیکە بۆچوونێکی ئاڵۆزیان نییە؟ ئەوان ناڵێن چێژی خراپیش هەیە؟
بێگومان .
لەو باوەڕەدام دەبێت، لەسەر ئەو خاڵە ڕێکەون، کە هەندێک شت چاکە و خراپیشە، ئەمە دروست نییە؟
دروستە.
لێرەدا ڕوون دەبێتەوە، بۆچی خەڵکی مشتومڕی زۆریان لەسەر ئەم کێشەیە کردوە.
وانیە؟
چۆن وانیە؟
ئەمە ڕوون و ئاشکرا نییە؟ زۆر کەس لەو باوەڕەدان دادوەری و جوانی دەناسن بەبێئەوەی بەتەواوی بزانن چین، بەڵام کەس بە ڕواڵەتی چاکە ڕازی نییە و دەیانەوێت بەتەواوی بیناسن.
ڕاستە.
هەموو کەسێک بەدوای چاکەدا دەگەڕێ و دەیەوێت پێی بگات. دەزانێت چاکە شتێکە هەیە، بەڵام هێشتا نازانێت ئەو شتە چیە و سوودەکەشی نابینێت. دەگونجێت ئەوانەی لە شارەکەماندا پشتیان پێ دەبەستین و (فەرمانڕەوایی) دەکەن، سەبارەت بە (واتای) چاکە، بەم نەزانینیەوە لە تاریکیدا بژین؟
بێگومان ناگونجێت.

دڵنیام، ئەوانەی دادوەری، جوانی و چاکە ناناسن پاسەوانێکی چاکیان لێ پەیدا نابێت. هەروەها ئەوەی لە ئاستی چاکەدا نەزان بێت دادوەری و جوانیش ناناسێت.
ئەوە گومانێکی زیرەکانە و بەجێیە.
ئەگەر پاسەوانەکەمان، لەم ڕووەوە زانا بێت، شارەکەمان ناتەواو نابێت؟
ئا، زوو بۆم دەرکەوت، تۆ شوێن بۆچوونی خەڵکی ناکەویت.
سوکرات من بەڕاستی نازانم تۆ بۆچوونی خەڵکیم بۆ باس بکەیت و لەبارەی خۆتەوە هیچ نەڵێیت. بەتایبەتی، پاش ئەوەی کاتێکی زۆرمان بۆ ئەم کێشەیە تەرخان کردوە.
چی؟ تۆ بە ڕەوای دەبینیت کەسێک باسی ئەو شتانە بکات، کە نایزانێت. وا خۆشی نیشان بدات، کە ئەو شتانە دەزانێت؟ نەک بەو شێوەیە، کە دەیانزانێت، بەڵام دەبێت ئامادە بێت بۆچوونی خۆی دەربڕێت.
چی؟ نازانیت بۆچوون بەبێ زانین ناشرین و شەرمە؟ چاکترینیان کوێرە. تۆ کوێر و ئەوانەی بۆچوونی خۆیان بەبێ زانین دەردەبڕن، وەکو یەک دادەنێیت؟
لەو باوەڕەدایت ئەوانە ڕێگەیەکی ڕاستیان گرتبێت؟
وەکو یەک، دەیانبینم.
تۆ شوێن شتە ناشرین و پڕ شەرم و فێڵاوییەکان دەکەویت، لە کاتێکدا کەسانێک هەن، بە زانین ڕۆشنت دەکەنەوە؟
گلاوکۆن گوتی: سوکرات، بە خوا، لەم قۆناغەدا نابێت وازبێنیت. حەزدەکەین بەو جۆرەی لە دادوەری و مامناوەندی دوایت باسی چاکەشمان بۆ بکەیت.
من گوتم، هاوڕێ بەوە ڕازیم، بەڵام دەترسم نەتوانم ڕوونی بکەمەوە و شەرمەزار بم. لەبەرئەمە واز لەو پرسیارە سەبارەت بە خودی چاکە لەم قۆناغەدا دەهێنین. ئەمە کێشەیەکی گەورەیە. دەتوانم ئاکامی چاکەکردن ڕوون بکەمەوە و باسی بکەم چ شتێکی لێوە دەردەچێت. ئایا بەمە ڕازیت، یان واز لە هەموو شتێک بهێنین؟ باشە. لەوێوە دەستپێدەکەین. چیرۆکی منداڵەکەمان بۆ بگێڕەوە، کە تەواوت نەکرد.

خۆزگە تۆ لە باسەکە تێدەگەیشتیت. دەمەوێت بەپەرۆشەوە گوێ لە باسەکە بگریت. ئەمەش، کە باسی دەکەم منداڵی چاکەیە. دڵنیابە نامەوێ فێڵت لێ بکەم.

باشە. بە پەرۆشەوە گوێمان لە تۆیە. دەست بە باسەکەت بکە.

من بیرت دەخەمەوە لە پێشتر چیمان باس کردوە.

چی؟

شتی جوان و چاک زۆرن لە یەکدیان جیا دەکەینەوە.

وایە.

لەم شتە زۆرە جوان و چاکانەوە بۆ دواوە دەڕۆین تاکو بۆ هەر دەستەیەک لەوان دەگەینە یەک فۆڕم. ئەو فۆڕمە بە "بوون"ی ئەوان دادەنێین.

وایە.

هەروەها شتە جوان و چاکەکان دیارن و هەستیان پێ دەکرێت، بەڵام فۆڕمەکان هەستپێکراو نین و بە بیرکردنەوە دەدۆزرێنەوە.

بەتەواوی ڕاستە.

بە چ ئەندامێکی لەش شتەکان دەبینین؟

بە چاو.

هەروەها دەنگەکان، بە گوێ و بە هەستەکانی دیکە شتەکانی دیکە دەناسین.

ڕاستە.

تۆ دەزانی بینین لەنێو هەستکردنەکاندا چەند بەرهەمهێنەرە؟

نازانم.

باشە، بیر لەمە بکەوە. دەنگ و بیستن پێویستیان بە یارمەتی شتێکی دیکە هەیە تاکو دەنگەکە ببیسترێت. بیستنیش دەنگەکە وەردەگرێت.

وایە.

کەم شت هەن ئەم پێویستیەیان هەبێت. دەتوانیت نموونەیەکم بۆ بهێنیتەوە؟

ناتوانم.

لەو باوەڕەدا نیت بینین و بینراو ئەم پێویستیەیان هەبێت؟

چۆن؟

بینین، لەوانەیە، لەنێو چاودا بێت. ئەوەی چاوی هەیە بەکاری دەهێنێت. ڕەنگەکان لەنێو شتەکاندا هەن. بەبێ سێیەم چاو هیچ شتێک ناتوانێ ببینێت. تەنانەت ڕەنگەکانیش بە نەبینراوی دەمێننەوە.

مەبەستت لە سێیەم چیە؟

مەبەستم، لە ڕووناکییە.

تۆ ڕاست دەڵێیت.

ئەوە هەست و هێزی بینین پێکەوە دەبەستێتەوە، گرنگە و لە پەیوەندییەکانی دیکە بایەخدارترە.

ڕووناکی بە بایەخە.

بێگومان، بایەخی زۆری هەیە.

چ خوداوەندێک، هۆ و سەرچاوەی ڕووناکییە؟ ئەو خوداوەندەیە، کە ڕووناکی ئەو دەبێتە هۆی بینین و شتەکانمان بۆ دەردەخات؟

ئەو خوداوەندەیە، تۆ و کەسانی دیکەش باسی دەکەن. بەدڵنیاییەوە لە وەڵامی پرسیارەکەتدا دەڵێم (ئەو خوداوەندە) ڕۆژە.

ئەی لەم ڕێگەیەوە، بینین پەیوەندی بەو خوداوەندەوە نییە؟

چ ڕێگەیەک؟

ڕۆژبینین و چاو نییە.

بێگومان .

بەڵام، لەنێو ئەندامە هەستکەرەکاندا چاو لە ڕۆژ دەچێت.

زۆر وایە.

چاو لە ڕۆژەوە هێز پەیدا دەکات.

بەدڵنیاییەوە.

هەروەها (گوتمان) بینین و چا و ڕۆژ نین.

ڕاستە.

بەوە دەڵێم منداڵی چاکە، کە لە چاکە بچێت لەوەوە پەیدابوبێت. بوون لەنێو جیهانی بینراودا و پەیوەندی بینین بە شتە بینراوەکانەوە لە بوونی چاکە لەنێو جیهانی هۆشەکی و پەیوەندی هۆش بە بابەتی بیرکردنەوەوە دەچێت.

دەتوانیت ئەمە زیاتر ڕوون بکەیتەوە؟

ئەگەر بە شەوی تاریک بڕوانیتە شتەکان ڕەنگەکانیان نابینیت. ئەمە

وەکو کوێری وایە.

بێگومان.

بەم جۆرە لە دەروون تێبگە: کاتێک دەڕوانێتە ئەو شتەی لەژێر ڕووناکی ڕاستیدا دەرکەوتووە دەیبینێت و دەیناسێت. ئەگەر ئەو شتە تەمومژاوی بێت گۆڕانی بەسەردا بێت (پەیدابێت و لەناوبچێت) نایناسێت و بۆچوونی لەبارەیەوە دەبێت، کە ئەویش گۆڕانی تێدا ڕوودەدات.

ئەوە دەردەکەوێت دروست بێت.

ئەوەی ڕاستی بە شتەکان و هێزی زانین بە زانەر دەبەخشێت فۆڕمی چاکەیە. ئەم فۆڕمە دەبێت بەهۆی زانین و ڕاستی و بابەت بۆ زانین. زانین و ڕاستی دوو شتی جوانن، بەڵام چاکە جیاوازە و لەوانیش جوانترە. لە جیهانی هەستەکیدا بینین و ڕووناکی لە ڕۆژ دەچن، بەڵام نابێ بڵێین، کە ڕۆژن. بەهەمان شێوەش زانین و ڕاستی لە چاکە دەچن، بەڵام چاکە نین. بۆچوونەکەت جوانە. دڵنیام ئەو شتەش (چاکە) بە چێژوەرگرتن دانانێت.

با زۆرتر (واتاکەی) ڕوون بکەینەوە.

چۆن؟

لەو باوەڕەدام لەگەڵ مندا لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەویت، کە ڕۆژ هێز بە شتە بینراوەکان دەدات تاکو ببینرێن و هاوکات (هێز) بەو شتانەش دەدات، کە پەیدا دەبن و گەشە دەکەن، بەڵام ڕۆژ خۆی پەیدا نابێت.

چۆن دەبێت؟

کەوابوو، دروستە بڵێین، بابەتە زانراوەکان تەنیا بۆئەوەی بناسرێن قەرزاری چاکە نین، تەنانەت بوونیشیان دەکەوێتە سەر چاکە. هاوکات چاکە بوون نییە. بەهێز و پلە لە ژوور بوونەوەیە.

گلاوکۆن بە گاڵتەوە گوتی: سوێند بە ئەپۆڵۆ دەخۆم ئەمە سەیرە!

گوناهی تۆیە. زۆرت لێکردم بۆچوونی خۆمت بۆ ڕوون بکەمەوە.

من نامەوێ لێرەدا بوەستیت. حەزدەکەم لێکچوونی لەگەڵ ڕۆژدا ڕوون بکەیتەوە و هیچی لێ مەپەڕێنە.

من زۆر شتم پەڕاندوە.

هیچ مەپەڕێنە، تەنانەت شتە بچووکەکانیش باس بکە.

من دەبێت بەشێکی بپەڕێنم، بەڵام بەپێی توانا هەموو شتێک باس دەکەم.

نا، هیچ مەپەڕێنە.
کەوابوو، بەو شێوەیەی گوتمان، تۆش تێبگە. دوو هێز هەن: یەکێکیان بە جیهانی هۆشەکی و ئەوەی دی بە جیهانی هەستەکی دراوە. من بەو جیهانە (هۆشەکییە) ناڵێم بەهەشت. بەمجۆرە دوو بابەتیشمان هەیە؛ هۆشەکی و هەستەکی.
ڕاستە.
ئەمە لەو هێڵە دەچێت لە ناوەڕاستدا دابەش کرابێت. هەر یەکێک لەو بەشانە (هۆشەکی) و(هەستەکی)ن. ئەوانیش لە ناوەڕاستدا کراون بە دوو بەشەوە. یەکێک لە بەشەکانی لایەنی هەستەکی ئەندێشەیە. مەبەستم لە ئەندێشە؛ یەکەم سێبەرەکانە لەنێو شوێندا، تیشکدانەوە لەنێو ئـاودا، لەنێو تەنە ڕەقەکانیشدا لوسی و بریقەدانە. تۆ لەمە تێدەگەیت؟
من تێدەگەم.
لەنێو بەشی دیکەی لایەنی هەستەکیدا ئـەو بابەتانە هەن، کە ئەندێشەکان پەیدا دەکەن، وەکو زیندەوەرەکانی دەوروبەرمان، ڕووەک و هەموو کەلوپەلە دروستکراوەکان.
باشە.
تۆ لەو باوەڕەدایت هەر یەکێک لەم بەشانە ڕادەیەک ڕاستیان تێدابێت. پەیوەندیی نێوان شتێکی وەرگیراو بە شتەکەوە، وەکو پەیوەندیی نێوان بۆچوون و زانین بێت؟
گومانم لەوە نییە.
ئێستا، بیر لە لایەنی هۆشەکیش بکەوە و دابەشی بکە.
چۆن؟
دابەشکردنەکە بەمجۆرەیە: ئەم لایەنەش دەکەین بە دوو بەشەوە، لە بەشی خوارەوە، دەروون هەیە، کە وێنەی شتە وەرگیراوەکان لە (لایەنە هەستەکییەکەوە) وەردەگرێت و لێیان دەکۆڵێتەوە، بەڵام خۆی بە بنەڕەتی یەکەم ناگەیەنێت و مەبەستی ئەو گەیشتنە بە ئاکام. لە بەشی سەرەوەی لایەنی هۆشەکی دەروون ئەو زانیارییانە ڕەت دەکاتەوە، کە لەسەر گریمانە ڕادەوەستن و سوودیش لە وێنەکانی جیهانی هەستەکی وەرناگریت. لە بیرۆکەکانیانەوە گەشتەکەی دەسپێدەکات.

من تێناگەم.
هـەوڵ دەدەم جارێکی دیکە ڕوونـی بکەمەوە؛ چەند خاڵێکت لە سەرەتاوە بۆ باس دەکەم تاکو یاریدەی تێگەیشتنت بدات. تۆ دەزانیت خوێندکارانی ئەندازیاری و ژمێریاری ژمارەی جووت و تاک و شێوە ئەندازیارییەکان، سێ جۆری گۆشە و بابەتەکانی دیکەی ئەم زانستانە باس دەکەن، بەجۆرێک خۆیان دەردەخەن، کە ئەم بابەتانەیان زانیوە و هەموو شتێکیان لا ڕوونە. هەموو جارێکیش لەم زانینەوە بە ئاکامەکان دەگەن؟
من ئەوەندە دەزانم.
هەروەها دەزانیت (ئەم خوێندکارانە) بابەتی بیرکردنەوەیان لە شتە بینراوەکانەوە وەردەگرن، بەڵام بیرکردنەوەکەیان لەسەر ئەو بابەتانە نییە. پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە، کە لە بابەتەکان دەچن. ئەوان باسی خودی چوارگۆشە، یان هێڵێکی کێشراو لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی دیکە دەکەن. ئەم شێوە ئەندازیارییانەی دەیکێشن نموونە و سێبەریان لە (جیهانی هەستەکیدا) هەیە، بەڵام وەکو وێنە بەکارهێنراون. ڕاستە.
ئەمە ئەو شتەیە، کە بە هۆشەکی ناوزەدم کرد. دەروونیش ناچار دەکرێت گریمانە بەکاربهێنێت و ڕاستەوخۆ ناگاتە بنەڕەتی یەکەم، چونکە (لەم قۆناغەدا) دەبێت مامەڵە لەگەڵ گریمانەکان بکات. ئەو نموونانە بەکاربهێنێت، کە لە جیهانی هەستەکییەوە دەستی کەوتوون. بە بەراوردکردنیان لەگەڵ وێنەکانیاندا ڕاستی و ناڕاستیان لا ڕوون دەبێتەوە.
تێدەگەم تۆ باسی ئەندازیاری و زانستە نزیکەکانی دەکەیت.
کاتێک باسی بەشەکەی دیکەی هێڵی هۆشەکی دەکەم بۆت دەردەکەوێت ئاماژە بۆ ئەو جۆرە زانینە هەستەکیە دەکەم، کە بە هێزی دیالێکتیکی دادەنێم. ئەم هێزە ئەو زانینەی لەسەر گریمانە ڕادەوەستێت بە بنەڕەتی یەکەم دانانێت. بۆ ئەو ئەم زانینە تەنیا گریمانەیە و دەیەوێت لەوێوە خۆی بە بنەڕەتی یەکەم بگەیەنێت. لەوێوە دەگاتە ئاکامێک، کە پێویستی بەهیچ شتێکی هەستەکی نییە و مامەڵە لەگەڵ فۆڕمەکاندا دەکات و لەوێدا کۆتایی بە گەشتەکەی دەهێنێت.
من تاکو ڕادەیەک (هەرچەندە باسی زۆر شت دەکەیت) تێدەگەم.

دەتەوێت لایەنی هۆشەکی، ئەو لایەنەی زانستی دیالێکتیکی لەسەر دامــەزراوە، زانستەکان پشتی پێ دەبەستن، گریمانەکانیان تیایدا دەبن بە بنەڕەتی یەکەم، جیا بکەیتەوە. دەتەوێت بڵێی ئەوانەی ئەم زانستانە دەخوێنن مامەڵە لەگەڵ بابەتە هەستەکییەکاندا ناکەن، چونکە لە گریمانەکانەوە گەشتەکەیان دەکەوێتە گەڕ. هەروەها هەست دەکەم ئەندازیاری بە بیر نەک تێگەیشتن دادەنێیت. ئەو بیرکردنەوەیەی دەکەوێتە نێوان بۆچوون و تێگەیشتنەوە. ڕوونکردنەوەکەت دروستە. ئێستا لە دەروونا چوار بەش هەن. هەر یەکێک لەو بەشانە پەیوەندی بە بەشێکی دیکەوە هەیە: تێگەیشتن لە ژوور هەموویانەوەیە. لە خوار ئەمەوە، یان دووەم بیرە، سێیەم بڕوا و چوارەم ئەندێشەیە. بەگوێرەی پلەکانیان ڕوونی هەر یەکێک لەم بەشانە دەکەوێتە سەر ڕادەی ڕاستی لە بابەتەکەیدا.

من تێدەگەم. بەمجۆرە دەتوانین ڕیزیان بکەین.



پاش ئەوەی گوتم بەراوردێکی کاریگەرێتیبوون و نەبوونی پەروەردە بەسەر سروشتی ئێمەوە لەم نموونەیەدا بکە: وای دابنێ کۆمەڵێک لەنێو ئەشکەوتێکدا دەژین. دەرگای ئەشکەوتەکە لە سەرەوەیە و لەوانەوە دوورە. دەرگاکەش بەقەد پانی ئەشکەوتەکەیە و ڕووناکی لەوێوە بەنێو ئەشکەوتەکە دەگات. ئەو کۆمەڵە لە منداڵییەوە لەوێ دانراون. مل و پایان بە زنجیر بەستراوەتەوە و ناتوانن ملیان بسوڕێنەوە. ڕووناکیش بۆ نێو ئەشکەوتەکە لەو ئاگرەوە دێت، کە لە دەرەوە و لە پشتیانەوە هەڵکراوە. لەنێوان ئەوان و ئاگرەکەدا ڕاڕەوێکی درێژ هەیە. وای دابنێ لەبەردەم ئەم ڕاڕەوەدا، وەکو چیغی بەردەم شانۆی بووکەشووشە بۆ هەڵسوڕانی بووکەکان دیوارێکی نزم هەڵچنراوە.

باشە.

وادانێ هەندێک کەس لەودیو دیوارەکەوە پەیکەری مرۆڤ و ئاژەڵیان بە کۆڵەوەیە، کە لە بەرد و تەختە و شتی دیکە داتاشراون و هاتوچۆ دەکەن. هەندێکیان دەدوێن و ئەوانی دیکە بێدەنگن.

ئەوەی باسی دەکەیت سەیرە و کەسانی نێو ئەو زیندانەش سەیرن.

ئەوان لە ئێمە دەچن. ئایا بێجگە لە سێبەری خۆیان و ئەوانەی دیکە، کە ڕووناکی ئاگرەکە لەسەر دیوارەکەی بەردەمیان دەری دەخات، هیچی دیکە دەبینن؟

ئەگەر نەتوانن ئاوڕ بدەنەوە چۆن دەبینن؟

ئەی لەبارەی ئەو بابەتانەوە، کە تەنیا سێبەرەکانیان دەردەکەون؟

بۆ ئەوانیش بەو جۆرەیە.

ئەگەر لەگەڵ یەکدیدا دوان، لەو باوەڕەدا نیت، تەنیا ناوی ئەو شتانە بزانن، کە لەسەر دیوارەکە سێبەرەکەی دەبینن؟

ئەوە ڕاستە.

ئەگەر ئەشکەوتەکە دەنگ بداتەوە، لەو باوەڕەدا نیت، کە لەگەڵ دەنگدانەوەکەدا سێبەرێک ببینن وا هەست بکەن دەنگەکە لەو سێبەرەوە دەرچووە؟

بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، کەسانی نێو ئەشکەوتەکە دەگەنە ئەو باوەڕەی ڕاستی بێجگە لە سێبەرەکانی سەر دیوارەکەی بەردەمیان چی دیکە نییە.

ئەوان بەو باوەڕە دەگەن.

لەو باوەڕەدا نیت دەردی نەزانینیان چارە بکرێت ئەگەر ئەمە ڕوووبدات: یەکێک لەوان زنجیرەکەی دەکرێتەوە و هەڵدەستێتە سەر پێ. ئاوڕ بۆ دواوە دەداتەوە. ڕوو دەکاتە ڕووناکییەکەو بەرەو دەرەوە دەڕوات. چاوەکانی بە تیشکی ئاگرەکە دەکەونە ژان و ناتوانێت ئەو شتانە ببینێت، کە لەوەوپێش سێبەرەکانی بینیوە. بە ڕای تۆ، چ ڕوودەدات ئەگەر بەو کەسە بڵێین ئەو شتانەی لە پێشتر (لەنێو ئەشکەوتەکەدا) بینیویەتی، ڕاست نین و ئێستا لەبەرئەوەی لە شتە ڕاستەقینەکانەوە نزیک بۆتەوە، دەتوانێت بیانبینێت؟ چۆنە ئەگەر ئەو شتانەی یەکە یەکە نیشان دەین و پرسیاری لێ بکەین، کە چین. لەو باوەڕەدا نیت سەری لێ بشێوێت، وا بزانێت بابەتەکانی (نێو ئەشکەوتەکە) لەمانە ڕاستر بن؟

وایە.

ئەگەر داوای لێ بکەین بڕوانێتە تیشکی ئاگرەکە، ئایا چاوی نایەشێت؟ ڕوو لەو شتانە ناکات، کە دەتوانێ بیانبینێژ، چونکە لەو باوەڕەدایە ئەو شتانە چاکتر دیارن؟

ئەوە دەکات.

ئەگەر ئەو کەسە تەماشای ڕۆژ بکات و خۆرەکە لە چاوی بدات بەهەمان شێوە چاوی نایەشێت و بێزار نابێت؟ دەتوانێت ئەو شتانە ببینێت، کە پێشتر بە ڕاستی دادەنان؟

ئەو ناتوانێ بیانبینێت.

هەست دەکەم پێویستی بە کاتە تاکو لەگەڵ ڕاستیەکانی جیهانی بەرزدا ڕابێت. یەکەمجار بەئاسانی سێبەرەکان دەبینێت، دوای ئەوە وێنەی کەسان و شتەکانی دیکە لەنێو ئاودا، دوایی خودی شتەکان

دەبینێت. بە شەو تەماشای ئاسمان دەکات، مانگ و ئەستێرەکان باشتر لە ڕۆژ و تیشکی خۆر دەبینێت.
دروستە.
دواجار، خودی ڕۆژ، نەک ڕەنگدانەوەی لەنێو ئاودا، یان لە شتێکی دیکەدا دەبینێت و بیری لێ دەکاتەوە.
دروستە.
لێرەوە فێر دەبێ و هەوڵ دەدات بیسەلمێنێت، کە ڕۆژ، ساڵەکان و چوار وەرزەکان دەهێنێتە کایەوە. فەرمانڕەوای هەموو شتەکانی جیهانی هەستەکییە. هۆی ئەو شتانەیە ئەم بینیونی.
بەڵێ، ئەم کارە دەکات.
کاتێک کەسانی نێو ئەشکەوتەکە و تێگەیشتنی ئەوانی بیر دەکەوێتەوە، لەو باوەڕەدا نیت، بە گۆڕانەکە لە ژیانی خۆیدا دڵخۆش بێت و بەزەیی بەوانیشدا بێتەوە؟
بەدڵنیاییەوە.
ئەگەر کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بڕیار بدەن خەڵات بەو کەسە ببەخشن، کە سێبەرەکانی سەر دیوارەکە چاک دەناسێتەوە و دەزانێت کامیان پێشتر دێن، لەوێوە باسی داهاتوو بکات، لەو باوەڕەدای ئەم کەسەی لە ئەشکەوتەکە ڕزگاری بووە دڵگران بێت لەوەی خەڵاتەکە بەو نەدراوە؟ حەسوودیش بەو کەسە بەرێت، کە خەڵاتەکە وەردەگرێت؟ لەو باوەڕەدا نیت، لەگەڵ هۆمیرۆسدا بڵێت "چاکترە خزمەتکارێکی هەژاری کەسێکی هەژار بیت". بە ئازارەوە بژیت، بەڵام وەکو ئەوان بیر لە ژیان نەکەیتەوە؟
دڵنیام، ئەو دەیەوێت بە ئازارەوە نەک بەو جۆرە، وەکو کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بژی.
بیر لەمەش بکەوە: ئەگەر ئەم کەسە بۆ نێو ئەشکەوتەکە بگەڕێتەوە، لە شوێنەکەی خۆیدا دانیشتەوە و لەو ڕووناکییەوە بۆ نێو ئەشکەوتەکە بڕوات بەرچاوی تاریک نابێت؟
تاریک دەبێت.
پێش ئەوەی بەرچاوی ڕووناک بێتەوە لەگەڵ کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بۆ ناسینەوەی سێبەرەکان پێشبڕکێ بکات، گاڵتەی پێ

ناکەن؟ ئەوان نالێن، لە جیهانی بەرزەوە گەڕاوەتەوە و چاوی خراپ بووە، لەبەرئەوە چوون بەرەو ئەو جیهانە لەبار نییە؟ ئەگەر کەسێک بیەوێت ڕزگاریان بکات و جیهانی بەرزیان پێ بناسێنێت بەدەستیان بێت نایکوژن؟

بەدڵنیاییەوە دەیکوژن.

ئەم نموونەیە بۆ باسەکەمان لەبارە: جیهانی هەستەکی ئەشکەوتەکەیە. ڕووناکی ئاگرەکەش خۆرە. دەشێ بەهەڵەمدا نەنێیت، ئەگەر بڵێم، گەشتی ئەو مرۆڤەی ڕزگاری دەبێت و دەگاتە جیهانی دەرەوە لە جووڵەی ژێرکێشی دەروون بەرەو جیهانی هۆشەکی دەچێت. نازانم من ڕاست بۆ کێشەکە چووم یان نا، بەڵام لە جیهانی زانراودا فۆڕمی چاکە بەرزترینە و دوا فۆڕمە ببینرێت و بە دژوارییەوە دەدۆزرێتەوە. ئەو کەسەی بتوانێت بیناسێت بەو ئاکامە دەگات، کە فۆڕمی چاکە هۆی هەموو شتێکی دروست و جوانە. سەرچاوەی ڕووناکی و جیهانی هەستەکییە. لە جیهانی هۆشەکیشدا سەرپەرشتی هەموو شتێک دەکات. تێگەیشتن و ڕاستیش لەوەوە دەردەچن. لەبەرئەوە پێویستە هەموو کەسێکی هۆشیار لە ژیانی تایبەتی و گشتیدا بیدۆزێتەوە.

منیش هەمان بۆچوونم هەیە.

وەرە لەسەر ئەم خاڵەش لەگەڵما ڕێکەوە: ئەوانەی بەم پلەیە دەگەن خۆیان بە کاروباری ڕۆژانەی خەڵکیەوە ماندوو ناکەن. ڕوو لە بەرزی دەکەن. ئێمەش چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکەین.

وایە.

چی ڕوودەدات کەسێک واز لەم فێربوونە پیرۆزە بهێنێت، ڕوو لە خراپەی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی بکات؟

تۆ ئەمە بە شتێکی سەیر دادەنێیت، چونکە هێشتا بەرچاوی ڕووناک نەبۆتەوە و فێری تاریکییەکەی چواردەوری نەبووە؟ هەروەها لە دادگا، یان شوێنەکانی دیکە لەسەر نموونەی دادوەری دژانە ڕادەوەستێت، چونکە خەڵکی لە واتای دادوەری ڕاستەقینە ناگەن؟

ئەوە سەیر نییە.

هەموو کەسێک دەزانێت چاو لە دوو حاڵەتدا بەتەواوی نابینێت: کە لە ڕووناکییەوە دەکەوێتە نێو تاریکییەوە، یان لە تاریکییەوە دەکەوێتە

نێو ڕووناکییەوە. ئەمە بەسەر دەروونیشدا دەسەپێت. دەروونێکی شیواو و شپرزە ناتوانێت بە دروستی شتەکان ببینێت. ئەو کەسەی خاوەنی دەروونەکەیە پرسیار لە خۆی دەکات داخۆ دەروونی مرۆڤ لە ژیانێکی پڕ ڕووناکییەوە هاتۆتە کایەوە و ئێستا ناتوانێت شتەکان بەتەواوی ببینێت، چونکە هێشتا چاوی بە تاریکی ڕانەهاتووە، یان لە تاریکییەوە کەوتۆتە نێو ڕووناکییەوە و لەبەر بەهێزی تیشکی ڕووناکییەکە چاوی شتەکان نابینێت. هەروەها خۆی بە بەختەوەر دادەنێ و بەزەیی بە کەسانی دیکەدا دێتەوە. ئەگەر لە ناخەوە بتوانێت بەو دەروونــە پێبکەنێت، کە لە خــوارەوە بــەرەو ڕووناکی هاتووە لەبارترە لـەوەی بەوە پێبکەنێت، کە لە جیهانی بـەرزەوە هاتووە و بەرەو ئەشکەوتەکە دەگەڕێتەوە.

ئەوەی باسی دەکەیت لەبارە.

ئەگەر لەبار بێت پێویستە بیر لەم خاڵانەش بکەینەوە: پەروەردە ئـەوە نییە، کە هەندێک کـەس لە واتـاکـەی تێدەگات، بە پڕکردنی دەروونـی مرۆڤ لە زانیاری دادەنێن و لەگەڵ گەڕانەوەی بینین بۆ کوێر بەراوردی دەکەن.

زۆر کەس بەمجۆرە بیری لێ دەکاتەوە.

بەگوێرەی باسەکەمان دەردەکـەوێـت هێزی فێربوون لە هەموو دەروونێکدا هەبێت. ئامێری فێربوونیش، وەکو چاو وایە تاکو هەموو لەشت لەگەڵیا وەرنەگێڕیت لە تاریکییەوە ڕووناکی نابینیت. ئەو ئامێرە بەبێ وەرگەڕانی هەموو دەروون بەرەو ڕووناکترین بابەت، کە چاکەیە فێر نابێت. وایە؟

بەڵێ، وایە.

پەروەردە ئەو هونەرەیە پەیوەندی بەم جۆرە وەرگەڕانەوە هەیە، کە بەهۆیەوە دەروون ڕۆڵی کاریگەرانەی خۆی دەنوێنێت. ئەمەش هونەری گەڕانەوەی بینین بۆ دەروون نییە. بۆ پەروەردەکردن پێویستە بینین لە پێشتردا هەبێت، بەڵام لە سەرەتادا ڕووی لە ڕاستی نییە و تەماشای ئەو شوێنە ناکات، کە ڕاستی تێدایە. پەروەردە ڕێگای ڕاستی بینین نیشان دەدات.

دەردەکەوێت، ئەمە ڕاست بێت.

چاکەکانی دیکەی دەروون، پێدەچێت، لە خەسڵەتە چاکەکانی لەشەوە نزیک بن، چونکە لە پاشاندا بە ڕاهێنان و مەشقکردن پەیدا دەبن. چاکەی هۆش، دەردەکەوێت، لەسەروو هەموو چاکەکەنی دیکەوە، سەرچاوەیەکی پیرۆزی هەبێت. ئەمە چاکەیە هەرگیز دەسەڵاتی خۆی ون ناکات، بەڵام سوود و زیانی دەکەوێتە سەر شێوەی وەرگەڕان بەرەو ڕووناکی. بیستوتە هەندێک کەس زیرەک و دڕندەن؟ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەم جۆرە کەسانە بینینێکی تیژیان هەیە و بە خراپی بەکاری دەهێنن. چەند دوور و چاک ببینن ئەوەندە خراپەیان لێ دەوەشێتەوە.

بەتەواوی دروستە.

ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە لە منداڵییەوە فێر بکرێن و لە تەوقی چێژوەگرتن، وەکو خواردن و خواردنەوە و چێژە هەستەکییەکانی دیکە ڕزگار بکرێن، کە دەروونیان دەخاتە لێژی و بابەتە نزمەکانی پێ دەناسێت من دەڵێم ئەگەر بخرێنە سەر ڕێگەی ڕاستی ناسین بە باشی ئەو شتانە دەبینن، کە لەوەوپێش پشتیان تێکردبوو.

دەبێت بەو جۆرە بێت.

ئەوەی پەروەردە نەکراوە، نازانێت ڕاستی چیە؟ بەگوێرەی باسەکەمان ئەم جۆرە کەسانە و ئەوانەی بەتەواویش پەروەردە نەکراون قۆناغەکانی فێربوونیان تەواو نەکردووە بۆ فەرمانڕەواییکردنی شارەکەمان لەبار نین؟ یەکەمیان ناتوانێت، چونکە ڕوو لە یەک ئامانج لە ژیانی تایبەتی و گشتی خۆیدا ناکات. دووەمیان تاکو زۆری لێ نەکرێت بەهیچ کارێک هەڵناسێت.

ئەوە ڕاستە.

ئێمەی دامەزرێنەری شارەکە بەرپرسین لەوەی باشترین دەروون، بەو شێوەیەی باسمان کرد، پێش جووڵانە ژوور کێشییەکەی بەرەو ناسینی فۆڕمی چاکە بە قۆناغەکانی پەروەردە و فێربووندا بەرین. کاتێک بەو قۆناغانەدا تێپەڕین و گەیشتنە ئەو پلەیەی مەبەستمانە نابێت ڕێگەیان بدەین بەو شێوەیە بژین، کە ئەمڕۆ ڕێگەیان پێ دراوە.

مەبەستت چیە؟

ئایا ئەمە کارێکی ناڕەوا نییە لەگەڵیاندا دەکرێت؟

تۆ لەبیرت چوو، کە ئەرکی یاساسازکەر تەنیا بەختەوەرکردنی دەستە و چینێکی کۆمەڵ نییە. ئەو دەیەوێت هەموو هاوڵاتیانی شارەکە بەختەوەر بن، هاوتەراز بژین و خۆشی بۆ یەکدی بخوازن. بۆ ئەم مەبەستەش ئەو یاسا دروست ناکات تاکو دڵی هاوڵاتیان لە خۆی ڕازی بکات و هاوڵاتیان بە ئارەزووی خۆیان بژین. ئەو دەیەوێت یاساکانی سوودبەخش بن، شارەکە بهێڵێتەوەو هاوڵاتیان یەکگرتوو بکات.

ئەوە ڕاستە، من لەبیرم چوو.

کەوابوو، گلاوکۆن، تەماشاکە. ئێمە خراپەمان بەرانبەر فەیلەسووفەکانمان نەکردووە. دەمانەوێت ئەوان ئاگایان لە هەموو کەسێک بێت، ئەمەش دادوەرییە. ئێمە دەڵێین: لە شارەکانی دیکەدا فەیلەسووفەکان زۆریان لێ ناکرێت کاری ڕامیاری بکەن. ئەمە دروستە، چونکە ئەوان خۆیان پێدەگەیەنن و دەوڵەت بایەخیان پێ نادات. ئەوەی خۆی پێدەگەیەنێت ڕێز لەو کەلتورە ناگرێت، کە تیایدا بێگانەیە. ئێمە ئەم فەیلەسووفانەمان هێناوەتە کایەوە و پەروەردەمان کردوون و بۆ بەڕێوەبردنی (شار) ئامادەکراون. لەبەرئەوە پێویستە هەریەکێک لەوان بۆ نێو ئەشکەوتەکە بگەڕێتەوە و چاوەکانی بە تاریکی ڕابهێنێت. کاتێک چاوەکانی بە تاریکی ڕاهاتن لە کەسانی نێو ئەشکەوتەکە چاکتر دەبینێت. ئەو سێبەرەکانی سەر دیوارەکە چاک دەناسێتەوە و دەزانێت سێبەری چین، چونکە بابەتە ڕاستەقینەکانی بینیوە. شارەکەی ئێمە، وەکو شارەکانی دیکە بەڕێوە ناچێت، کە خەڵکی تیایاندا لەسەر سێبەرەکان و دەسەڵات دژی یەکدی ڕادەوەستن و جەنگ بەرپا دەکەن. کەسانی بەئاگا نەک خەوتوو شارەکەمان بەڕێوە دەبەن. ئەمەش گوتەیەکی ڕاستە، ئەو شارەی فەرمانڕەواکانی کەمتر ئارەزوومەندی فەرمانڕەوایی بن شەڕی ناوخۆی تێدا هەڵناگیرسێت.

بەتەواوی دروستە.

ئایا فەیلەسووفەکانمان، ئەوانەی بۆ ئەم کارە پەروەردە کراون، پێکەوە لەو بەهەشتەدا دەژین، کە بۆیان دانراوە؟ ڕازی دەبن بە نۆبە ئەرکی بەڕێوەبردنی شارەکە بگرنە دەست؟

چۆن ڕازی نابن. ئەوان دادوەرن و ئەو فەرمانەی بەسەریاندا

دەدرێت لەپێناوی دادوەرییدایە. دڵنیام هەر یەکێک لەوان بەگوێرەی پێویست بە کارەکەی خۆی هەڵدەستێت، وەکو فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ هەڵسوکەوت ناکات.

بەمجۆرە دەبێت. ئەگەر ئەم فەرمانڕەوایانەت هەبێت شارەکەت بۆ دادەمەزرێت. فەرمانڕەواییکردنی پڕ سامان و دەوڵەمەند بە زێڕ دەکەوێتە سەر دەوڵەمەندێتی لە چاکە و بیرکردنەوەی هۆشەکییدا. ئەگەر سواڵکەر و کەسانی چاوچنۆک دەسەڵات بگرنە دەست دامەزراندنی شارەکە مەحاڵ دەبێت. لەم حاڵەتەدا ئەو دەسەڵاتە شەڕی لەسەر دەکرێت و ئاژاوە و جەنگ شارەکە وێران دەکەن.

زۆر ڕاستە.

هیچ کەسێک دەناسیت ئەوەندەی فەیلەسووفی ڕاستەقینە نەیەوێت دەسەڵاتی ڕامیاری هەبێت؟

کەس ناناسم.

ئەوانەی حەز لە فەرمانڕەوایی ناکەن پێویستە فەرمانڕەوایی بکەن. ئەگینا ئەوانەی حەزیان لە فەرمانڕەواییە شەڕی لەسەر دەکەن.

وایە.

بێجگە لەوانەی دەزانن فەرمانڕەوایی چاک چیە و چۆن بکرێت، کێ هەیە شیاوی ئەم کارە بێت؟

کەس نییە.

دەتەوێ بزانیت ئەم جۆرە کەسانە چۆن دێنە نێو شارەکەمان، یان وەکو هەندێک دەڵێن، لە بەرزەخەوە بە خوداوەندەکان دەگەن و ئێمە بە ڕووناکی دەگەیەنین؟

هەڵبەتە دەمەوێت بزانم.

ئەمە یاری شێروخەت نییە. وەرگەڕانی دەروونە لە ڕۆژی تاریکەوە بۆ ڕۆژێکی ڕووناک. جووڵانێکی ژوورکێشییە بەرەو فەلسەفەی ڕاستەقینە.

بێگومان.

پێویست ناکات ئەو زانینانە باس بکەین، کە بەم ئامانجەمان دەگەیەنن؟

هەڵبەتە.

کەوابوو، ئەوە چ زانینێکە، گلاوکۆن، کە دەروون لە جیهانی پەیدابوونەوە بەرەو جیهانی بوون دەبات؟ هەروەها، بیرم کەوتەوە فەرمانڕەواکانمان لە جەنگسازیشدا زانان.

بەڵێ، وایە.

دەبێت لەسەروو ئەزانینەوە ئەمەش بزانن.

ئەوە چیە؟

نابێت شارەزاییان لە جەنگسازی نەبێت.

پێویستە شارەزا بن.

پێش ئەوە فێری مۆسیقا، هۆنراوە و وەرزشمان کردن.

وابوو.

وەرزش پەیوەندی بە پێکهاتن و لەناوچوونەوە هەیە، چونکە وابەستەیە بە گەشەکردن و تێکشکانی لەشەوە.

وادیارە.

ئەو زانینە نییە بەدوایدا دەگەڕێین.

نا، ئەو زانینە نییە.

دەبێت مۆسیقا و هۆنراوە بێت؟

مۆسیقا بەپێچەوانەی وەرزشەوەیە. پاسەوانەکان فێری ژیانێکی هاڕمۆنی دەکات و (زانین)یان ناداتێ. وشەش (لە هۆنراوەدا) جوان ڕازابێتنەوە، یان ڕاستیەک دەربخات هۆنینەوە و هاڕمۆنیان دەدەنێ. دەبینین ئەو چاکەیەی دەمانەوێت بیگەینێ لە مۆسیقادا نییە.

تۆ بە باشی بۆ کێشەکە چوویت. ئەوە لە مۆسیقا و هۆنراوەدا نییە. ئایا لە چیدا پەیدا دەکرێت؟

ئەگەر لەمانەدا نەبێت با بیر لەو بابەتە بکەینەوە پەیوەندی بە هەموویانەوە هەیە.

ئەو بابەتە چیە؟

بۆ نموونە، ئەو شتە هاوبەشەی لە هەموو هونەر و زانست و جۆری بیرکردنەوەیەکدا بەکاردێت دەبێت لەپێش هەموو بنەڕەتەکانی دیکەی فێربوونەوە دابنرێت.

ئەوە چیە؟

جیاوازییەکانی نێوان یەک و دوو لەگەڵ سێدا. بەکورتی، مەبەستم

ژماره و ژماردنه. ئایا هەموو زانست و بەشەکانی دیکەی بیرکردنەوە بەکاری ناهێنن؟

بێگومان، بەکاری دەهێنن.

تەنانەت زانستی جەنگسازییش؟

دروستە.

لە تراجیدیادا، پالەمیدس دەیەوێ بیسەلمێنێت ئاگامەمنون سەرکردەیەکی خراپی لەشکرەکەیە. لەبیرتە دەڵێت، ژمارەی دۆزیوەتەوە و دەزانێ ژمارەی سەربازەکان لە (ترۆجان)دا چەندن و چەند کەشتیی جەنگیان هەیە. گوایە ئاگامەمنون ژماردنی نەزانیوە و تەنانەت نەیزانیوە چەند پای هەیە. دەبێت ئاگامەمنون چۆن سەرکردەیەک بێت؟

ئەگەر ئەوە ڕاست بێت سەرکردەیەکی سەیر بووە!

پێویست ناکات پاسەوانەکانمان ئەم بابەتە بخوێنن و فێری ژماردن و ژمێریاری بن؟

دەبێت بە زۆر فێرکرێن.

حەزدەکەم بزانم بۆچوونی تۆش لەسەر ئەم بابەتە، وەکو بۆچوونەکەی منە؟

بۆچوونی تۆ چیە؟

ئەمە ئەو بابەتەیە، کە بەدوایدا دەگەڕێین و فێری بیرکردنەوەمان دەکات، بەڵام بە دروستی بەکارنەهاتووە. بەکارهێنانی ئەم بابەتە، بە دروستی، دەروون بە بوون دەگەیەنێت.

مەبەستت چیە؟

من بۆچوونەکەمت بەم شێوەیە بۆ ڕوون دەکەمەوە: ئەو شتانەی بەو ڕێگەیەدا ناڕۆن، کە دیاریم کرد، جیا دەکەمەوە. تۆ لەگەڵ مندا لەسەریان بکۆڵەوە و بزانە لەگەڵمدا ڕێدەکەویت یان نا؟

ئەوانە چین؟

مەبەستم ئەوەیە، کە بابەتەکانی هەستکردن دوو جۆرن: هەندێکیان پێویستیان بە بیرکردنەوە نییە و خودی هەستکردن حوکم بەسەریاندا دەدات. لە حاڵەتی دووەمدا، ناتوانین پشت بە هەستکردن ببەستین و پێویستە زۆرتر لە بابەتەکان (دوای هەستپێکردن) بکۆڵینەوە.

تۆ ئاماژە بۆ ئەو بابەتانە دەکەیت دوورن و لەبەر خۆر، یان تاریکی

وێنەیان کێشراوە.

نا، من ئەو مەبەستەم نییە.

مەبەستت چیە؟

ئەوانەی پێویستیان بە تێگەیشتن نییە (تەنیا پشت بە هەستکردن دەبەستن) ئەو بابەتانەن دژوەستاویان نییە. دووری و نزیکی بابەتەکەش لە هەستکردنەوە گرنگ نییە، بۆ نموونە، بڕوانە سێ پەنجەی من: پەنجە بچووک و دووەم و پەنجەی ناوەڕاست.

باشە.

تۆ وابزانە زۆر نزیکن و منیش ئەم خاڵە زۆرتر ڕوون دەکەمەوە.

چۆن؟

لەکوێوە تەماشایان بکەیت ئەو پەنجانەش، ڕەش و سپی، ئەستوور و باریک بن، هەر پەنجەن و ناگۆڕێن؛ پەنجە پەنجەیە و نابێت بە شتێکی دیکە. لێرەدا لە خۆمان ناپرسین پەنجە چیە؟ چونکە ئەو بابەتە (پەنجە) بیرکردنەوە ناوروژێنێت، تاکو نەزانێت ئەو شتە چیە و بەدوای واتاکەیدا بگەڕێت.

ڕاستە.

کەوابوو لێرەدا (ئەم هەستکردنە بۆ ناسینی بابەتەکەی) پێویستی بە یارمەتی هۆش نییە.

بەڵی، پێویستی بە هۆش نییە.

ئەمە بۆ گەورەیی و بچووکی پەنجەش دروستە؟ ئایا بینین دەتوانێت هەستیان پێ بکات؟ دەستلێدان نەرمی و ڕەقی، ئەستووری و باریکی پەنجەکانت پێدەگەیەنێت؟ ئایا هەستەکان بەگشتی زانیاری تەواوت لەم بارەوە لا دروست دەکەن؟ ئایا هەر یەکێک لە هەستەکان بەکاری جیاواز هەڵناسن: ئەو هەستەی ڕەقی و نەرمی بابەتەکە دەدۆزێتەوە بە دەروون دەڵێت، ئەو بابەتە نەرمە و ڕەقە؟

ڕاستە.

ئایا دەروون پاش گەیشتنی ئەو خەسڵەتە هەستەکییانە سەری لێ ناشێوێت، لە کاتێکدا ئەو بابەتە بە ڕەق و نەرم، سووک و گران پێی گەیشتووە؟ یان ئەوەی سووکە بە گران و گرانیش بە سووک دابنرێت؟

بێگومان، ئەمە شتێکی سەیرە، دەروون پێویستی بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو بابەتانە هەیە.

لێرەدا دەروون پەنا بۆ هۆش دەبات. دەیەوێت بزانێت ئەو بابەتە یەک، یان دوو شتە.

ڕاستە.

ئایا جیاواز نابن ئەگەر دوو شت دەرچن؟

بێگومان، جیاواز دەبن.

ئەگەر هەر یەکێک لەو دوو بابەتە جیابێت، دەروون لە جیاوازییەکەیان تێدەگات؟ چونکە دوو شت جیاواز نەبن بە یەک شت دادەنرێن.

ڕاستە.

بینین گەورەیی و بچووکی بابەتێکی، وەکو دوو شتی جیاواز بۆ دەرنەکەوت. ئەو دوو خەسڵەتەی بە تێکەڵاوی لە بابەتەکەدا بینی. وایە؟

بەڵێ وایە.

لێرەدا، تێگەیشتن یارمەتی بینین دەدات، ئەو دوو خەسڵەتە تێکەڵاوە لە یەکدی جیا بکاتەوە و بە دوو شتی ناکۆکیان دابنێت.

ڕاستە.

ئایا پێویست ناکات بپرسین گەورە یان بچووک چیە؟

پێویستە.

لەبەرئەمە بوو شتێکمان بە هۆشەکی و شتێکی دیکەمان بە هەستەکی دانا.

ئەوەش ڕاستە.

ئەمە ئەو خاڵە بوو لە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد. هەندێک بابەت پێویستیان بە بیر هەیە. ئەوانی دیکە لەسەر هەستکردن ڕادەوەستن. ئەو بابەتانەی داوا لە بیرکردنەوە دەکەن بە واتاکانیان بگات و بابەتیش هەن ڕاستەوخۆ بە هەستکردن دەگەن، واتاکانیان ئاشکرایە.

تێدەگەم، لەگەڵتدا هاوڕام.

تۆ لە بۆچوونەکەمان کەمێک وردبەرەوە، هەوڵ بدە باشتر تێبگەیت و وەڵامی پرسیارەکەشت دەست دەکەوێت: لە کاتێکدا بابەتەکە ڕاستەوخۆ لە بینیندا، یان هەستکردنێکی دیکەدا، وەکو یەک

بابەت ناسراوە، هەستکردن داوای یارمەتی لە هۆش ناکات و ئەو زانینەش بەرەو بوونمان نابات، بەڵام لە کاتێکدا لایەنە ناکۆکەکان هەستپێدەکرێت و بابەتەکە وەکو یەک شت خۆی دەرناخات، پێویستیی حوکمدان بەسەر بابەتەکەدا سەرهەڵدەدات. دەروون سەری لێ دەشێوێت و بەدوای وەڵامدا دەگەڕێت و ڕوو لە تێگەیشتن دەکات. ئەمەش هانی دەروون دەدات لە واتای بوون تێبگات45.
بەدڵنیاییەوە، ئەمە ڕوودەدات.

بەڵێ، ئەگەر ئەمە بۆ (یەک) ڕاست بێت دەتوانین بۆ هەموو ژمارەکانی دیکەش بە ڕاستی دابنێین.

بەڵێ .

ژمێریاری پەیوەندی بە ژمارەکانەوە هەیە.

ڕاستە.

کەوابوو بەرەو ڕاستیمان دەبات.

بەڵێ.

ئەمە ئەو جۆرە زانینەیە ئێمە بە پێویستی دادەنێین. دوو جۆر سوودیشی هەیە، لەڕووی سەربازییەوە و فەلسەفیشەوە؛ جەنگاوەر دەبێت ژمارە بناسێت و ڕیزەکان بژمێرێت. فەیلەسووفەکانیش بۆئەوەی کەسانێکی هۆشمەند دەرچن دەبێت ڕاستی بوون بناسن.

ڕاستە.

پاسەوانەکانمان (فەرمانڕەواکان) فەیلەسووف و جەنگاوەریشن؟

بەدڵنیاییەوە.

ئەمە ئەو زانینەیە، کە یاساسازکەرەکانی (شارەکەمان) بە پێویستی دادەنێن؛ پێویستە ئەوانەی دەبن بە فەرمانڕەوای شارەکەمان هان بدرێن ژمێریاری بخوێنن. نەک لەلاوە یان وەکو بازرگانەکان بۆ فرۆشتن و کڕین بەکاری بهێنن. دەبێت ئەوان بە تێگەیشتنەوە بە ناوەڕۆکی ژمارە بگەن. لە جەنگدا و بۆ گەیشتن بە ڕاستی بوون سوودی لێ وەرگرن.

تۆ باش بۆ کێشەکە چوویت.

بێجگە لەمە، دەمەوێت باسی باشی ئەم زانستە بکەم و ڕوونی بکەمەوە لە چەند لایەنەوە سوودبەخشە ئەگەر فەیلەسووف، نەک

دووکاندار بەکاری بهێنێت.

سوودی چیە؟

یاریدەی دەروون لە گەشتە ژوورکێشەکەیدا دەدات. خودی ژمارەکانی پێ دەناسێنێت. لە بابەتە هەستەکییەکان دووری دەخاتەوە. ئەوانەی لەم زانستەدا زیرەکن گاڵتەیان بەو کەسانە دێت ژمارەیەک لە کاتی ژماردندا دابەش دەکات. ئەگەر تۆ دابەشی بکەیت، ئەوان لە ژمارەکانی دیکەی دەدەن، چونکە نایانەوێت ژمارەیەک لەنێو بەشەکاندا ون بێت.

ئەوە ڕاستە.

گریمان کەسێک گوتی: هاوڕێکانم، ئەم ژمارە سەرنجڕاکێشانە بە چیەوە بەستراون، کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە و هەمیشە دەمێننەوە؟

لە وەڵامدا لەوانەیە بڵێین، ژمارەکان پەیوەندییان بە بیرەوە هەیە.

کەوابوو، پێویست دەکات ئەم زانستە بە زۆر بخوێنین، چونکە پەیوەندی بە تێگەیشتنەوە هەیە؟

بێگومان، پێویستە.

لەبارەی ئەو کەسانەوە بە سروشت لە ژماردندا باشن، یان توانای بیرکردنەوەی هۆشەکییان هەیە چ دەڵێیت؟ لەو باوەڕەدا نیت، ئەوانەی بە سروشت لە ژمێرییاریدا زیرەکن زوو فێری زانستەکانی دیکەش دەبن. ئەوانەی نەزانن و فێریان دەکەین ئەگەر ئەو زانستە بۆ مەبەستەکەشی بەکارنەهێنن لە بیرکردنەوەدا تیژتر و خێراتر دەبن؟

ڕاستە.

هەروەها بە بۆچوونی من هیچ زانستێک لە ژمێریاری بۆ فێربوون سەختتر نییە.

نییە.

لەبەر ئەم هۆیانە ئەم زانستە نابێت فەرامۆش بکرێت. دەبێت خاوەن دەروونە چاکەکان فێری بن.

من لەگەڵتام.

کەوابوو، ژمێریاری یەکێکە لەو زانستانەی دەبێت بخوێنرێت. دووەم زانست پاش ژمێریاری، کە بەکەڵک دێت چیە؟

چ زانستێکە؟ مەبەستت ئەندازیارییە؟

بەڵێ، بۆ ئەندازیاری دەچم.

بۆ جەنگیش لەبارە. بۆ دامەزراندنی ئۆردوگا، داگیرکردنی خاکێک، کۆکردنەوەی لەشکر لە شوێنێکدا و بڵاوکردنەوەیان پێویستیمان بە ئەندازیار هەیە، بەڵام بۆ ئەم جۆرە کارانە، زانیارییەکی کەم لەبارەی ژمێریاری و ئەندازیارییەوە بەسە. ئێمە دەمانەوێت بیدۆزینەوە چۆن خوێندنی قووڵی ئەم زانستانە بە فۆڕمی چاکەمان دەگەیەنێت. هەروەها ئەگەر زانستێک دەروون بەو پلەیە بگەیەنێت پێویستە ئاوڕی لێ بدەینەوە.

تۆ ڕاست دەڵێیت.

ئەگەر ئەندازیاریی دەروون بە بوون بناسێ، ئەوا زانستێکی لەبارە بخوێنرێت، بەپێچەوانەشەوە، لەبار نییە.

دروستە.

ئەوەی زانیارییەکی کەمیشی لە ئەندازیارییدا هەبێت تێدەگات ئەم زانستە بەو جۆرە نییە، کە ئەندازیارەکان بەکاری دەهێنن.

مەبەستت چییە؟

سەیر باسی دەکەن. بە کارکردنەوە گرێی دەدەن. باسی دامەزراندن و زیادکردن دەکەن، کە لە کاتێکدا ئەم زانستە لەپێناوی زانینداية.

بەتەواوی دروستە.

پێویست ناکات لەسەر ئەم خاڵەش ڕێکەوین؟

چ خاڵێک؟

زانیارییەکەیان لەبارەی بوونەوەیە، کە هەیە نەک ئەو شتانەی دێنەکایەوە، یان لەناودەچن.

ڕێکەوتنمان ئاسانە، چونکە ئەندازیاری زانینە لەو شتانەی هەن.

کەوابوو، هاوڕێ، ئەندازیاری دەروون بەرەو ڕاستی دەبات. دەروونێکی فەلسەفیانە دادەهێنێت و بەرەوژوور دەیبات. نایەڵێت بەرەوژێر بڕوات.

بەڵێ، بەو جۆرە کاری خۆی دەکات.

کەوابوو، هەرچەندە کاریگەرێتیی ئەندازیاری زۆر گرنگ نابینرێت، ئەم زانستە پێویستە لە شارەکەماندا بایەخی پێ بدرێت46.

ئەو کاریگەرییانە چین، کە گرنگ نین؟

ئەوانەی پەیوەندییان بە جەنگەوە هەیە و تۆ ئاماژەت بۆ کردن، بەڵام دەزانین جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئەوانەی فێری ئەندازیاری بوون و ئەوانەی نەیانخوێندوە هەیە.

بەڵێ، جیاوازییەکی گەورەیە.

پێویستە ئەندازیاری بە دووەم زانست بۆ پەروەردەکردنی لاوان دابنێین؟

پێویستە.

لەبارەی ئەستێرەناسییەوە چ دەڵێیت؟ بە سێیەم زانستی دابنێین؟ یان لەگەڵمدا ڕێناکەویت؟

من لەگەڵتدا ڕێدەکەوم، چونکە زانینی وەرزەکـان، مانگەکان و ساڵەکان بۆ سەرکردەیەکی لەشکر و جووتیار و کەشتیەوانیش گرنگە.

تۆ کەسێکی سەیریت. دەترسیت خەڵکی ڕەخنـەت لێ بگرن و بڵێن، باسی بابەتێکی بێکەڵک دەکات. بێگومان ئاسان نییە تێبگەیت، کە لە هەموو دەروونێکدا ئامێرێکی پاکراوە هەیە بە خوێندنی ئەو بابەتانە، وەکو مۆم داگیرسێت، لە کاتێکدا شێوازەکانی دیکەی ژیان کوێریان کردووە. ئامێرێک، کە لە دە هەزار چاو باشترە، چونکە بەو ڕاستی دەدۆزینەوە. ئەوانەی ئەمە دەزانن بۆچوونەکەتیان پەسەندە. ئەو کەسانەی ئاگایان لێی نییە بۆچوونەکەت بە پووچەڵ و بێ واتا دادەنێن. لە ئێستاوە بڕیار بدە دەتەوێ لەگەڵ چ دەستەیەکیاندا بدوێیت. یان ناتەوێ لەگەڵ هیچ کامیان بدوێیت و بۆچوونەکەت لای خۆت هەڵدەگریت، سوود بە کەس ناگەیەنیت؟

بۆ خۆمی هەڵدەگرم. پرسیار لە خۆم دەکەم. وەڵامەکەشی بۆ خۆم گل دەدەمـەوە. با بگەڕێینەوە سەر خاڵەکەی پێشوو. هەروەها، لە دۆزینەوەی زانستی سێیەمدا پاش ئەندازیاری بەهەڵەدا چووین.

هەڵەکەمان چی بوو؟

پاش ئەندازیاری دەستمان دایە ئەو تەنە ڕەقانەی دەسوڕێنەوە بەبێئەوەی بزانین چین. پاش ڕەهـەندی دووەم، سێیەم دێت، کە پەیوەندی بە شاقوڵەوە و ڕەهەندەکانی قوڵییەوە هەیە.

ڕاستە، بەڵام کەم لەبارەی ئەم شتانەوە زانراوە.

ئەمەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە: یەکەم، چونکە هیچ شارێک نرخی بۆ دانانێت. ئەم بابەتە سەختە و توێژینەوەی زۆری لەسەر نەکراوە. دووەم، توێژەرەکان ڕێنیشاندەرێکیان نییە، هەموویان پەیڕەوی بکەن.

دۆزینەوەی ڕێنیشاندەر ئاسان نییە. ئەگەر دۆزراشەوە دژوارە توێژەرە لووتبەرزەکانی ئەمڕۆ پەیڕەوی بکەن. ئەگەر شارەکە (دەوڵەت) پشتگیری ئەوە بکات توێژەرەکانیش شوێنی دەکەون. ئەگەر توێژینەوەی قووڵیش لەسەر بابەتە بکرێت پێش دەکەوێت. زۆرینەی خەڵک بایەخ بەو بابەتە نادەن و توێژەرەکانیش نەیانتوانیوە سوودەکانی ڕوون بکەنەوە. لەگەڵ ئەم کەموکورتیانەدا جوانی بابەتەکە خۆی فەرز کردوە و تاکو ڕادەیەک پێش خراوە. لەبەرئەوە سەیر نییە، لەوە زۆرتریش بەرەوپێشەوە ببرێت.

بابەتەکە جێی سەرنجە، بەڵام زۆرتر ئەو خاڵە ڕوون بکەوە، کە لەبارەی ئەندازیاری و پەیوەندیی بە ڕووبەرەوە ئاماژەت بۆ کرد.

بەڵێ.

تۆ ئەستێرەناسیت لە پاش ئەندازیارییەوە ڕیز کرد و دوایی پاشگەز بوویتەوە. من لەسەرخۆ چوومە نێو باسەکەوە. ویستم لەو زانستە بدوێم مامەڵە لەگەڵ ڕەهەندی قوڵییدا دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی پێش نەکەوتووە، چوومە سەر ئەستێرەناسی (کە مامەڵە لەگەڵ جووڵانی ئەو تەنانەدا دەکات قوڵییان هەیە).

ڕاستە.

با ئەستێرەناسی بە زانستی چوارەم دابنێین. لەو باوەڕەشدا بین ئەندازیاری لە تەنە ڕەقەکان دەکۆڵێتەوە ئەگەر لە شارەکەماندا (بۆ بەرنامەی پەروەردە) بیسەپێنین.

ئەوە بەجێیە. هەروەها لەگەڵ تۆم. ئەوانەی ئەستێرەناسی دەخەنە ڕیزی فەلسەفەوە مەبەستیان تەماشای سەرەوە بەرەو ئاسمانە نەک بەرەو خوارەوە.

ئەوە بۆ هەموو کەسێک ڕوونە، بەڵام مەبەستم ئەوە نییە.

مەبەستت چیە؟

ئەمڕۆ ئەوانەی خوێندکار فێری فەلسەفە و ئەستێرەناسی دەکەن،

به چەواشەیی دەروون پـەروەردە دەکـەن. ڕووی دەروون بەرەو خوارەوە نەک سەرەوە دەبەن.
چۆن؟
به بۆچوونی من، چەمکی "خوێندنی باڵا " بەکاری دەهێنێت. ئەگەر یەکێک سەر بەرز بکاتەوە و بڕوانێتە نەخش و نیگای بنمیچەکە، لەوانەیە بڵێیت، کە ئەو بە چاو تەماشا ناکات، بەڵکو دەیەوێت تێبگات. دەشێ تۆ ڕاست بیت و من گەمژە، بەڵام بۆ من، ئەو زانینەی پەیوەندی بە بوون و جیهانی نەبینراوەوە هەیە دەروون بەرەو ژوور پەلکێش دەکات. ئەگەر یەکێک هەوڵی ناسینی جیهانی هەستەکی بدات، گرنگ نییە تەماشای سەرەوە یان خوارەوە بکات، لەو باوەڕەدام فێر نابێت، چونکە ئەو شتانەی تەماشایان دەکات بابەتی زانست نین. ئەو کەسە لەسەر پشت ڕاکشا بێت، لەسەر کەشتی بێت، دەروونـی دەڕوانێتە شتەکانی خوارەوە، نەک سەرەوە.
بۆچوونەکەت ڕاستە، منیش بە سزای خۆم گەیشتم، بەڵام مەبەستت چیە لەوەدا، کە ئەستێرەناسی بۆئەوەی سوودبەخش بێت نابێت بەو شێوەیەی ئەمڕۆ بخوێنرێت؟
بەم شێوەیە: دەبێت ڕازانەوەی ئاسمان بە جوانترین دیمەنی بینراو، یان نەخش و نیگار دابنێین، کە لەسەری کراوە، بەڵام خێرایی جووڵانی (ئەستێرەکان) بە تەماشاکردنیان نازانرێت. دەکەوێتە سەر بیرکردنەوەی هۆشەکی. ئایا ڕێگەیەکی دیکە بۆ دۆزینەوەی ئەمە هەیە؟
نەخێر.
کەوابوو، پێویستمان بە نەخشەی ئاسمان هەیە. ئەو نەخشەیەش بۆ مەبەستی ئەندازیاری بە جوانی دەبێت (هونەرمەندێکی وەکو) دەیدەلویس، یان هونەرمەندێکی دیکە کێشابێتی. ئـەو بە جوانی نەخشەکەیمان بۆ دەکات، بەڵام بەدوای ڕاستیەکەیدا، یان یەکسانی و جووت و ڕێژەکاندا ناگەڕێت.
بێگومان ناگەڕێت.
لـەو بـاوەڕەدایـت، ئەستێرەناسێکی ڕاستەقینەش، کە تەماشای سوڕانەوەی ئەستێرەکان دەکات هەمان هەستکردنی هەبێت؟ وا بیر دەکاتەوە ئافەریدەکەری ئاسمان لە جوانترین شێوەدا ڕازاندویێتیەوە.

یان پێوانەی ڕۆژ و شەو، ڕۆژەکان بۆ مانگ، مانگەکان بۆ ساڵ و سوڕانەوەی ئەستێرەکان هەمیشە بەو جۆرە دەمێنێتەوە، گۆڕانی بەسەردا نایەت و بێهودەشە بەدوای ڕاستیەکەیدا بگەڕێین؟

هەرچەندە لە پێشتر بیرم لەم خاڵە نەکردەوە، بەڵام هەمان بۆچوونم هەیە.

کەوابوو، لەگەڵ ئەستێرەناسیدا دەبێت ئەو بەشەی دەروون، کە بە هۆش ناوزەدمان کرد بخەینە گەڕ و سوودی لێ وەرگرین. با بەو جۆرەی لە ئەندازیارییدا هەیە لە ئەستێرەناسیشدا مامەڵە لەگەڵ گرفتدا بکەین و بابەتەکانیش لە ئاسمان جێبهێڵین.

ئەوەی باسی دەکەیت، کارێکی سەختە.

من دەڵێم، ئەگەر سوودبەخش بین دەبێت وەکو یاساسازکەر مامەڵە لەگەڵ بابەتەکەماندا بکەین. ئایا تۆ بیر لە بابەتێکی دیکە دەکەیتەوە؟

نەخێر.

باشە. جووڵانیش فرە جۆرە. فەیلەسووف دەتوانێت باسی هەموویان بکات، بەڵام دووانیان بەئاسانی دەبینرێن.

ئەو دووانە چین؟

دووەمیان بەپێچەوانەی ئەو جووڵانەوەیە، کە باسمان کرد.

ئەوە چیە؟

دووەمیان. ئەوەی بەرگوێ دەکەوێت، وەکو ئەوە وایە بەرچاو دەکەوێت. چاو بۆ تەماشاکردنی ئەستێرەکان و گوێ بۆ جووڵانە هاڕمۆنیەکانە. ئەم دووانەش دوو زانستی پەیوەندیدارن بە یەکدییەوە. ئەمە بۆچوونی پیتاگۆراسیەکانیشە47.

ئایا، گلاوکۆن، لەسەر ئەم خاڵە ڕێنەکەوتین؟

بەڵێ، وابوو.

ئەم باسە سەختە، لەبەرئەوە پێویست ناکات بپرسین مەبەستیان لە جووڵانی هاڕمۆنی چیە؟ هەمان کات، لایەنە سوودبەخشەکانی دیکەی ئەم زانستانەشمان بۆ ڕوون دەکەنەوە. ئێمەش نابێت بابەتە بەرزەکەی خۆمان لەبیر بچێتەوە.

ئەو بابەتە چیە؟

مەبەستم ئەوەیە، ئەوانەی دەخرێنە بەر خوێندن بە نیوەچڵی فێر

نەکرێن و هەموو شتێک بەتەواوی تاکو کۆتایی بخوێنن. لەو باوەڕەدا نیت، ئەمە بۆ هارمۆنیش دەگونجێت؟ مامۆستایانی ئەم زانستەش، وەکو ئەوانەی ئەمڕۆ خۆیان بە ئەستێرەناسییەوە خەریک کردووە، دەنگەکان و بڕگەکان دەپێون، نازانن زانستەکەیان چ سوودێکی هەیە.
ڕاستە، ئەوانیش سەیرن. ئەوان باسی شتێک دەکەن، کە بە نۆتەی خەستکراوە ناوزەدی دەکەن. گوێ لە تەلی گیتارەکەوە نزیک دەکەنەوە، دەڵێی گوێ بە دیواری ماڵە دراوسێکەیانەوە دەنێن. هەندێکیان دەڵێن، نۆتەی ناوەند دەناسنەوە و جیای دەکەنەوە. ئەوانی دیکە لەو باوەڕەدان دوو دەنگ چوونەتە نێو یەک و بوون بە یەک دەنگ. ئەوان گوێ پێش تێگەیشتن دەخەن.
مەبەستت ئەو مۆسیقازانانەیە، کە بە ژێی (گیتارەکەیان) یاری دەکەن، بەڵام من نامەوێت باسی ئەوانە بکەم چۆن لە ژێی گیتارەکان دەدەن. من ڕووی دەمی پرسیارم لەو کەسانە دەکەم بەهەمان شێوە، وەکو ئەستێرەناسەکان دەڕواننە زانستی هارمۆنی. هەوڵ دەدەن ژمارە بە هاوئاهەنگییەوە ببەستنەوە، بەڵام لەوە ناکۆڵنەوە، کە چ ژمارەیەک هاوئاهەنگە یان نا48. ئەوە کارێکە لە ژوور توانای مرۆڤەوەیە.
بەڵام سوودی لە گەڕانەکەماندا بەدوای چاکە و جوانیدا هەیە. ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە نەخرێتە گەر بێ سوود دەردەچێت.
دەشێ وابێت.
ئەگەر ئەم بابەتانەی باسمان کردن پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا هەبێت و گەیشتینە ئەو ئاکامەی دەرخستنی پەیوەندییەکەیان ئاسانە، ئەوا کارەکەمان بێبەر نابینرێت.
منیش هەمان بۆچوونم هەیە، بەڵام سوکرات، هێشتا کارەکەمان بە سەخت دەبینم.
مەبەستت لە پێشەکییەکەیە؟ یان دەتەوێ بڵێیت، ئەم بابەتانە (زانستانە) پێشەکیەکن بۆ ئەو بەرنامەیەی بۆ فێربوون دایدەنێین؟ لەو باوەڕەدا نیت ئەوەی ژمێریارزانە چاک لە زانستی دیالێکتیکیش تێدەگات؟
نا، من نازانم، هەرچەندە هەندێکیانم بینیوە.
لەو باوەڕەدای کەسێک توانای بیرکردنەوەی هۆشەکی نەبێت ئەو کەسە بێت ئێمە دەمانەوێ ئەم زانستانە فێر بێت؟

لەو باوەڕەدا نیم.
لێرەدا، گلاوکۆن، خۆمان بە دیالێکتیک گەیاندووە. ئەمە ئەو ژێی (گیتارەیە) هۆش دەتوانێت ئاوازی پێ دەربهێنێت. توانای بینینیش لاسایی دەکاتەوە، چونکە لە پێشتر باسمان کرد، ئاژەڵ، ئەستێرەکان و ڕۆژ لە بینیندا دەردەکەون. هەروەها لە دیالێکتیکیشدا؛ ئەو کەسەی لەبەر ڕۆشنایی هۆشدا و بەبێ یارمەتی هەستکردن بگەڕێت ڕەها دەدۆزێتەوە. دەتوانێت چاکەی ڕەهاش ببینێت. وەکو چۆن لە بینیندا، کەسێک دوا شت لە جیهانی هەستەکیدا دەبینێت ئەویش بە دوا ڕەها لە جیهانی هۆشەکیدا دەگات.
دروستە.
ئەم بەرەوپێشەوەچوونە دیالێکتیکە.
ڕزگارکردنی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە وازهێنان لە سێبەرەکانی سەر دیوارەکە، ڕووکردن لە پەیکەرەکان و ڕووناکی ئاگرەکە، هەروەها ڕۆیشتن، بەرەو دەرکی ئەشکەوتەکە و خۆربینین، کەم توانایی چاوەکانیان بۆ تەماشاکردنی ئاژەڵ، ڕووەکەکان و تیشکی خۆر، بینینی ڕەنگدانەوەی وێنەکان، لەنێو ئاودا، کە سێبەری شتی ڕاستەقینەن دەروونی (ئەو مرۆڤانە) بەئاگا دەهێنێتەوە. ئەو بەشەی، کە دەیەوێت بە جیهانی بەرز بگات دەکەوێتە کارکردن.
هەرچەندە بڕواکردن بەمە دژوارە، بەڵام لەگەڵتام. گریمان وایە، بەڵام پێم بڵێ، دیالێکتیک چ هێزێکی هەیە؟ بەشەکانی چین؟ چ ڕێگەیەک دەگرێت؟ چونکە ئەو ڕێگەیە بە دوا ئیستگەمان دەگەیەنێت.
گلاوکۆن، من ناتوانم لەمە زۆرترت بۆ باس کەم. تۆ تێناگەیت، چونکە بە ئەندێشەوە دەڕوانیتە کێشەکەو ڕاستیەکەی نادۆزیتەوە. ئەوەی باسی دەکەم داخۆ شتێکی ڕاستەقینە بێت، یان نا، گرنگ نییە، بەڵام دڵنیام تۆ جۆرێک لەو ڕاستەقینەیەت بینیوە.
دڵنیام لەوە.
هەروەها، هێزی دیالێکتیک لەو کەسانەدا دەردەکەوێت، کە ئەو زانستانەی (ئامادەمان بۆ کردن) دەخوێنن.
ئەوەش ڕاستە.
کەس لەسەر ئەو خاڵەش مشتومڕیان لەگەڵدا ناکات، کە هیچ جۆرە

لێکۆڵینەوەیەک ڕاستی بوونمان پێ بناسێنێت، چونکە ئەو زانستانەی باسمان کردن خۆیان بە حەز و بۆچوونی مرۆڤەکانەوە گرێ دەدەن، بۆ بەرهەمهێنان و دامەزراندن و پارێزگاریکردنی بەرهەمەکە بەکاردێن. ژمێریاری و ئەندازیاری تاکو ڕادەیەک بوون دەناسن، بەڵام ناسینەکەیان خەوبینینە بە بوونەوە. کاتێک مرۆڤ بنەڕەتی یەکەم نەدۆزێتەوە و خۆی بە هەنگاوەکانی ناوەند و ئاکامەکان نەگەیەنێت، چۆن دەتوانێت زانینەکەی بە زانست دابنێت؟

ئەوە مەحاڵە.

کەوابوو، دیالێکتیک تەنیا ڕێگەیەکە بەرەو بنەڕەتی یەکەممان دەبات. تەنیا زانستە پشت بە گریمانە نابەستێت و زەمینەیەکی لە گومانبەدەر بۆ خۆی خۆش دەکات. چاوی دەروون، کە لەو زەمینەدا چێنراوە بە دیالێکتیک سەردەردەهێنێت و دەڕوانێتە ئاسمان. ئەم زانستە لە گفتوگۆ و توێژینەوەکەیدا بەکاردەهێنێت. بەگوێرەی نەریت ئەم جۆرە زانینە، کە لەم ڕێگەیەوە دەستمان دەکەوێت بە زانست ناوزەد کراوە، بەڵام بە دیدی من، پێویستە ناوێکی دیکەی لێ بنرێت، چونکە لە بۆچوون ڕووناکتر و لە زانینیش تاریکترە. لە پێشتر بە بیرۆکە ناوزەدمان کرد. دۆزینەوەی ناوەکەشی ئەوەندە گرنگ نییە. زۆر شتی دیکەمان لەپێشە پێویستیان بە باسکردن هەیە.

دروستە، گرنگ نییە.

بەهەرحاڵ، دیالێکتیک چوار بەشی هەیە؛ بەشی یەکەم: زانینە. دووەم: بیرۆکە (تێگەیشتن). سێیەم: بڕوا. چوارەم: هەستکردن بە سێبەرەکان. دوو بەشی سەرەوە بە هۆش و دوو بەشی خوارەوە بە بۆچوون ناوزەد دەکەم. هۆش پەیوەندی بە بوون و بۆچوون بە پەیدابوونەوە هەیە. وەکو چۆن بوون پەیوەندی بە پەیدابوونەوە هەیە، هۆشی ڕەوانیش پەیوەندی بە بۆچوونەوە هەیە. بەهەمان شێوە زانینیش لەگەڵ بڕوا، تێگەیشتنیش لەگەڵ هەستکردندا پەیوەندییان هەیە. لەمە زۆرتر ئەو بەشانە دابەش ناکرێن و پێویست بە درێژەدان بەم باسە ناکات.

من لەگەڵتام.

کەوابوو، ئەو کەسەی ڕاستی بوون دەناسێت دیالێکتیکزانە؟

ئەوەی دیالێکتیک نەزانێت، توانای هۆشی دەڕوخێت؟ ئایا لەگەڵ ئەم بۆچوونەدایت؟
بەڵێ، چۆن دژی ڕادەوەستم.
هەمان شت، سەبارەت بە چاکە دەڵێیت؟ کەسێک تاکو نەتوانێت بیرۆکەی چاکە ڕوون بکاتەوە و پێناسەی بکات بەرانبەر هەموو بۆچوونە دژەکان ڕاوەستێت و ڕەتیان بداتەوە، ڕەتدانەوەکەشی لەسەر بناغەی ڕاستی دامەزرێنێت، بیرۆکەی چاکە نازانێت. ئەگەر زانیارییەکەی لەسەر بۆچوون، نەک زانست، ڕاوەستابێت، ئەوا ئەو تەنیا سێبەری (چاکە) دەبینێت؛ بە خەونەوە و پێش ئەوەی بگاتە سەرەوە لە جیهانی خوارەوەدا دەژی. لە بەرزەخیشدا بۆ هەمیشە دەخەوێت.
من لێرەدا لەسەر هەموو خاڵێک لەگەڵتدا ڕێدەکەوم.
ئەو منداڵانەی بۆ فەرمانڕەواییکردنی شارەکەمان باسیان دەکەین و دەمانەوێت پەروەردەیان بکەین ئەگەر ڕۆژێک ئەو شارە بەڕاستی دامەزرێت، دڵنیام ڕێگە نادەیت ئەوانەی توانای بیرکردنەوەی هۆشەکییان نییە بۆ فەرمانڕەواییکردن بچنە ڕیزەوە.
بەتەواوی دروستە.
یاسایەک دادەنێین بۆ فەرمانڕەواکان، کە دەبێت (لە منداڵییەوە) پەروەردە بکرێن. بەهرەیەکی تەواو لە پرسیارکردن و وەڵامدانەوەدا پەیدا بکەن.
بەڵێ، ئەو یاسایەش من و تۆ دایدەنێین.
پێویست دەکات دیالێکتیک لەسەروو هەموو زانستەکانەوە دابنێین؟ هەروەها هەموو زانستەکانیشمان باس کردبێت، کە بۆ پەروەردەکردنی فەرمانڕەواکان سوودیان لێ وەردەگرین؟
پێی دەچێت.
لێرەدا کێشەی دابەشکردن و فێرکردنی زانستەکان دێتە پێش.
دروستە.
لەبیرتە، چ جۆرە مرۆڤێک بۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژێرین؟
بێگومان لەبیرمە.
دەبێت ئەو کەسە هەڵبژێرین، کە خاوەنی دەروونێکە ئەوپەڕی

خۆڕاگری و ئازایەتی و بەخشندەیی تێدایە. هەروەها دەبێت خاوەنی سروشتێکیش بێت، کە ئارەزوومەندی فێربوونە.
لەگەڵتام.
پێویستە ئارەزوومەندی فێربوون بێت، چونکە هەندێکجار خەڵکی سەختی و گرانی خوێندنیان لە گرانی وەرزش و کارکردنی لەش لا ناخۆشترە و کۆڵ لە فێربوون دەدەن.
ئەوە ڕاستە.
هەروەها ئەو کەسە دەبێت بیرهاتنەوەیەکی تیژی هەبێت و بەردەوام حەز لە کارکردن بکات.
بەدڵنیاییەوە، دەبێت بە سروشت خاوەنی ئەو بەهرەیە بێت.
بەڵام هەڵەکەمان لەوەدایە، کە پیشە بەو کەسانە نادەین فەلسەفە دەخوێنن. ئەمەش بەڕای من ناوی فەلسەفەی زڕاندوە.
لەبەرئەمە منداڵە زۆڵەکانی نابێت بە دەست هەڵیگرن49.
مەبەستت چیە؟
لە سەرەتاوە، هیچ خوێندکارێک نابێت لە فێربووندا حەزی بۆ خوێندن نیوە بێت. ئەمەش لەوێدا ڕوودەدات کەسێک حەزی لە وەرزش، ڕاوکردن و کارەکانی شەو بێت، ئارەزوومەندی فێربوون و توێژینەوە نەبێت و بە زۆر بخوێنێت.
بەدڵنیاییەوە.
بەهەمان شێوەش بۆ ڕاستی. باسمان نەکرد، کە دەروون لە ئاستی ناڕاستیەکدا خۆی دۆزیبێتەوە زوویر دەبێت و حەز ناکات درۆی لەگەڵدا بکرێت؟ بەڵام، کە ناڕاستیەکی بەزۆر پێ دەناسرێت ئەوەندە تورە نابێت. لە ئاستی نەزانینەکەشدا شەرمەزار نابێت.
دروستە.
لەبارەی مامناوەندی، ئازایەتی و بیرکردنەوەی قووڵ و جۆرەکانی دیکەی چاکەوە پێویستە ڕەسەن و ناڕەسەن لە یەکدی جیا بکەینەوە. ئەگەر ئەم جیاکردنەوەیە دیاری نەکرێت، ئەوا لە شارەکەماندا جیاوازیی نێوان دۆست و دوژمنیش ناکەین. لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەواکاندا تووشی هەڵە دەبین.
ئەوە ڕاستە.

کەوابوو پێویستە بەوردی سەرنجیان بدەین؛ ئەگەر ئەو کەسانەی بۆ بەرنامەی شارەکەمان هەڵیاندەبژێرین و پەروەردەیان دەکەین لەڕووی دەروونی و لەشەوە چاک بن، ئەوا دادوەری دژمان ڕاناوەستێت و دەستووری دەوڵەتەکەشمان دەپارێزین؛ ئەگەر ئەو کەسانە بەپێچەوانەی بەرنامەکەی ئێمەوە دەرچن، سووکایەتی گەورەتر بەرانبەر فەلسەفە دەکەین.

دروستە، بەڵام هەست دەکەم خۆم جۆرە سووکایەتیەکم بەرانبەری کردوە.

لە چ ڕوویەکەوە؟

من لەبیرم چوو، باسەکەمان جیددیە، بە هەڵچوونەوە لەسەری دوام. کاتێک فەلسەفەم بەو جۆرە لەژێر پێی هەندێک کەسدا بینی، نەمتوانی دان بە خۆمدا بگرم. بەتوڕەییەوە هەڵمەتم کردە سەریان و تاوانبارم کردن، من گوێم گرت، بەڵام بەو شێوەیە بیرم لە بۆچوونەکەت نەکردەوە.

من وا هەستم کرد. هەروەها لە باسەکەی پێشوومان‌دا مرۆڤی بەتەمەنیشم هەڵبژارد، بەڵام ئێستا هەڵیاننابژێرم. سۆلۆن هەڵەیە، کە دەڵێت، مرۆڤی بەتەمەن زۆر شت فێر دەبێت. (بە ڕای من) ئەوەی نەتوانێت زۆر ڕابکات، زۆریش فێر نابێت؛ تەمەنی لاوێتی بۆ هەموو کارێک لەبارە50.

دروستە.

زانستەکانی، وەکو ژمێریاری، ئەندازیاری و هەموو ئەوانەی بۆ دیالێکتیک بە پێویستی دادەنێن دەبێت لە تەمەنی منداڵییەوە فەرمانڕەواکان بیانخوێنن. ئەم خوێندنەش بەزۆر نییە.

بۆچی؟

نابێت مرۆڤی سەربەست، وەکو کۆیلە فێر بکرێت. کارکردن بەزۆر زیانی لەسەر لەش نییە، بەڵام فێرکردنێک بەزۆر بوو لەنێو دەروون‌دا نامێنێتەوە و زوو دەردەچێت.

ڕاستە.

منداڵ بەزۆر فێری ئەم زانستانە مەکە؛ چاکترە یارییان لەگەڵدا بکەیت. لەوێوە باشتر دەروونیان دەناسیت و بۆت دەردەکەوێت حەز

له چی دەکەن.
ئەوە لای من شتێکی جوانە.
لەبیرتە گوتمان، لە کاتی جەنگدا بۆ تەماشاکردن منداڵان لە نزیکەوە لەسەر پشتی ئەسپ دادەنێین، وەکو تووتەڵەسەگیش ڕێگەیان دەدەین بۆنی خوێن بکەن؟
لەبیرمە .
بەهەمان شێوەش لە نزیکەوە لەگەڵ زانستەکاندا ئاشنایان دەکەین و ناوی ئەو منداڵانەش دەنووسین، کە بۆمان دەردەکەون حەز لە چ زانستێک دەکەن.
لە چ تەمەنێکدا؟
کاتێک وەرزش تەواو دەکەن؛ لەوانەیە دوو یان سێ ساڵ بۆ وەرزش تەرخان بکەین. وەرزش و نووسین بۆ فێربوون لەبار نین. هەروەها سەرکەوتنیان لە وەرزشدا تاقیکردنەوەیەکی گرنگە.
هەڵبەتە.
لە تەمەنی بیست ساڵیدا، ئەوانەی بۆ (بەرنامەی فێربوون) هەڵدەبژێرێن ڕێزی تایبەتیان بۆ دادەنرێت. ئەو زانستانە قووڵتر پێکەوە دەخوێنن، کە لە منداڵیدا خوێندوویانە. پەیوەندیی نێوان ئەم زانستانە بە یەکدیییەوە و بە ڕاستیی بوونیشەوە فێر دەکرێن.
بەڵێ، ئەو زانستانە دەبێت بەردەوام بخوێنرێن.
فێربوونی ئەو زانستانەش دەبێت بە بناغەی ڕوانینێکی دیالێکتیکی. ئەوەی بتوانێت ئەم زانستانە پێکەوە گرێ بدات ڕوانینێکی گشتگیرانەی هەبێت، دیالێکتیکیانەش بیر دەکاتەوە.
من لەگەڵتام.
بیر لەم خاڵانەش بکەوە؛ ئەوانەی خاوەنی ئەم ڕوانینە گشتگیریەن بەردەوام فێر دەبن. واز لە خوێندن ناهێنن. لە کاری سەبازی و ئەرکەکانی دیکەدا لێهاتوون و تەمەنیان سی ساڵانە. لەنێو دەستەکەی خۆیاندا هەڵیان دەبژێرین و ڕێزی زۆرتریان لێ دەنێین. تۆش بە ڕێگەی دیالێکتیکەوە تاقیان دەکەیتەوە. هەوڵ دەدەیت بزانیت کێ لە ئەوان دەتوانێت گوێ نەداتە هەستەکانی و بەبێ هەستەکانی ڕاستی بوون بدۆزێتەوە، بەڵام لێرەدا دەبێت ئاگامان لە خۆمان بێت.

بۆچی ئاگامان لە خۆمان بێت؟
نابینیت ئەمڕۆ بەو جۆرەی دیالێکتیک بەکاردێت چۆن دەبێتە سەرچاوەی خراپە؟
ئەوانەی بەکاری دەهێنن گوێ نادەنە یاسا.
ڕاستە، گوێ بە یاسا نادەن.
لەو باوەڕەدا نیت، ئەمە لەنێو خوێندکارەکانی ئێمەشدا ڕوودات؟ ئایا تۆ پشتگیرییان دەکەیت؟
لەو باوەڕەدام ڕوودات و پشتگیریشیان ناکەم.
حەزدەکەم، ئەمە لەگەڵ ئەم نموونەیەدا بەراورد بکەیت؛ گریمان منداڵێک لەنێو خێزانێکی دەوڵەمەنددا هاتۆتە دنیاوە و پەروەردە کراوە. هیچ شتێکی کەم نییە. کەسانێکی زۆریش بە چواردەوریدا دێن و دەڕۆن و ستایشکەری ئەون. کاتێک گەورە دەبێت، ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەکەوێت، کە لەنێو ئەو خێزانەدا بەخێو کراوە و ژن و پیاوەکەش دایک و باوکی ئەو نین و نازانێت منداڵی کێیە. دەزانی هەڵوێستی بەرانبەر ژن و پیاوە بەخیوکەرەکان و ستایشکەرەکانی چ دەبێت؟ بەتایبەتی لەوێدا، کە ئەو ڕاستیەی نەدەزانی و ئێستا دۆزیوێتیەوە؟ پێویست دەکات من پێت بڵێم؟
حەزدەکەم بۆچوونی تۆ بزانم.
باشە، کاتێک ڕاستیەکەی نەدەزانی زۆرتر ڕێزی لەو ژن و پیاوە، وەکو دایک و باوکی خۆی لە ستایشکەرەکانی دەگرت. لەکاتی پێویستیدا ملکەچی دەکردن و کارێکی نەدەکرد بۆ ئەوان زیانبەخش بێت.
دروستە، بەو جۆرە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکات.
بەڵام، ئەو کاتەی ڕاستیەکە دەدۆزێتەوە ڕێزی بۆ خێزانەکە کەم دەبێتەوە و بۆ ستایشکەرەکانیشی زۆر دەبێت. لە جاران زۆرتر گوێڕایەڵی ستایشکەرەکان دەبێت. وەکو ئەوان دەژی و هاوڕێیەتیان دەکات. مەگەر بە سروشت کەسێکی چاک بێت و گوێ نەداتە دۆزینەوەی باوکی ڕەسەنی و ڕێز لەو خێزانە بگرێت (تیایدا گەورە بووە).
ئەوانە ڕوودەدەن، بەڵام ئەو کەسە چ لێکچوونێکی لەگەڵ خوێندکاری فەلسەفەدا هەیە؟
لێکچوونەکە بەم جۆرەیە: لە منداڵییەوە فێرکراوین دادوەری و چاکە

چین. لەگەڵ ئەو چەمکانەدا گەورە بووین و باوەڕیان پێ دەکەین و ڕێزیان بۆ دادەنێین.
بەدڵنیاییەوە.
ڕێگەی جیاوازتریش هەیە، کە بەپێچەوانەی ئەو جۆرە ژیانەوەیە و پڕە لە خۆشی، چێژوەرگرتن و ستایش بۆ دەروون دەکەن، بەڵام ئەوانەی ڕێزیان بۆ چەمکەکانی دادوەری و چاکەکان کەم نابێتەوە و بەردەوام گوێڕایەڵی ئەو دایک و باوکەن گوێ بەو ستایشکردنە نادەن.
دروستە.
کەسێک دێت و ئەم پرسیارە دەکات، "چاکە چیە؟" وەڵامەکە دەکەوێتە سەر ئەو شتانەی فێرکراوین و لەنێو کەلتورەکەماندا یاساسازکەرەکان دایان ناوە. پرسیارکەرەکە بەم وەڵامە ڕازی نابێت و بەئاسانی ڕەتی دەداتەوە. بناغەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە و ئێمەش دەگەیەنێتە حاڵەتێک لە ئاستی وەڵامدانەوەکەماندا شەرمەزار ببین. بەهەمان شێوە، لەبارەی واتای دادوەریشەوە مشتومڕمان لەگەڵدا دەکات. لەو باوەڕەدای وەکو جاران باوەڕ بە ڕاستی ئەو چەمکانە بکەین، کە فێر کراوین؟
نەخێر، وەکو جاران بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان ناکرێت.
ئەگەر کەسێک ڕێز بۆ ئەو چەمکانە دانەنێت، هەمان کات ڕاستیش نەدۆزێتەوە شوێن شێوازی بوونی ستایشکەرەکان ناکەوێت؟
بێگومان.
هەروەها، لە گوێڕایەڵێکی یاساوە دەبێت بە یاخیبوو.
بەدڵنیاییەوە.
ئەمە لە خوێندکاری فەلسەفەشدا ڕوودەدات.
تۆ ڕاست دەکەیت.
کەوابوو، لەگەڵ بۆچوونەکەی مندایت، کە دەبێت ئاگامان لە هاوڵاتیەکانمان بێت، بەتایبەتی ئەوانەی تەمەنیان سی ساڵانە و فێری دیالێکتیکیان دەکەین.
بەڵێ، پێویستە ئاگامان لێیان بێت.
بۆ دوورخستنەوەی ئەم مەترسییە پێویستە لە تەمەنی لاوێتیەوە فێری دیالێکتیک بکرێن. لەو تەمەنەدا تامی شتێک بکەن خۆشیەکەی

لەلایان دەمێنێتەوە. لاسایی ئەوانەش دەکەنەوە، کە لە هونەری ڕەتدانەوەدا شارەزان. وەکو تووتەڵەسەگ حەزدەکەن پەلاماری هەموو شتێک بدەن و بە دان بیدڕێنن.

دروستە، زۆر حەزی لێ دەکەن.

لەنێو مشتومڕەکانیاندا، پاش ئەوەی بۆچوونەکان ڕەت دەدەنەوە و بۆچوونەکانیشیان ڕەت دەدرێنەوە، لە ئاستی باوەڕەکانیاندا تووشی بێ بڕوایی دەبن. لێرەدا فەلسەفە ناوزڕ دەکرێت.

ڕاستە.

کەسێکی بەتەمەن لەم کارە شێتانەدا بەشداری ناکات. لەگەڵ کەسێکدا مشتومڕ دەکات، کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت نەک کەسێک حەز لە کایەی مشتومڕ بکات. لەبەرئەوە ڕێزی زۆرتر بۆ فەلسەفە دادەنرێت.

ڕاستە.

پێشتر گوتمان، ئەوانەی دیالێکتیک دەخوێنن پێویستە کەسانی بەتەمەن و ڕێک و پێک بن، نەک وەکو ئەوانەی ئەمڕۆ، کە بۆ ئەو کارە نالەبارن و خۆیان پێوە خەریک کردوە.

ڕاستە.

گریمان خوێندنی فەلسەفە لە جێگەی وەرزش بە سەختی و گەرمییەوە دەخرێتە گەڕ، ئایا درێژیی فێربوونەکە چوار یان شەش ساڵ بێت؟

گرنگ نییە. گریمان پێج ساڵە. دوای تەواوکردنی خوێندنەکە دەبێت بۆ نێو ئەشکەوتەکە بگەڕێتەوە. کاروباری نێو ئەشکەوتەکە و جەنگ بگرنە دەست. لەم ڕووەوە لە ئەزموونداا لەوانی دیکە کەمتر نابن، بەڵام بۆ ئەم کارەش دەبێت تاقی بکرێنەوە. پێویستە بزانین تاکو چ ڕادەیەک لەبارن.

ئەم کارە چەند دەخایەنێت؟

پانزە ساڵ. لەم حاڵەتەدا ئەوانەی لە تاقیکردنەوەکاندا سەردەکەون تەمەنیان پەنجا ساڵە و لە ژیانی کردەکی و بیرکردنەوەدا سەرکەوتوون. دەبێت تیشکی دەروونیان بە دەرەوە بگەیەنن. پاش ناسینی چاکە پێویستە لەسەریان شارەکە و هاوڵاتیان بەڕێوەبەرن. هەر یەکێک لەوان زۆربەی ژیانی بە فەلسەفەوە خەریک دەکات. کاتێک سەرەی هات دەبێت دەست بداتە کاروباری ڕامیاری و فەرمانڕەواییکردنی شارەکە. پاش پەروەردەکردنی کەسانی وەکو خۆی، بۆ هەمان مەبەست، بۆ

دوورگەی (ئیزلێس) دەڕوات و لەوێ بەڕێزەوە دەژی. ئەگەر پیتیا ڕازی بێت هاوڵاتیانی شار پەیکەرێکی بۆ ڕێزلێنان بۆ دادەمەزرێنن. ئەگەر ڕازیش نەبێت، ئەوا بەختەوەرانە دەژی.
سوکرات، تۆ پەیکەرێکی بێ گەرد و جوانت بۆ پیاوە فەرمانڕەواکان داتاشیوە.
ئەمە بۆ ژنانی فەرمانڕەواش دەکەین. وا تێنەگەیت، کە من ئەو مافە تەنیا بە پیاو دەدەم و بە ژنی نادەم.
ڕاستە.
ئەگەر لەگەڵ پیاودا یەکسان بن بەو جۆرەی باسی دەکەیت هەمان مافیان دەدرێتێ.
کەوابوو، لەگەڵما هاوڕایت لەسەر ئەوەی باسەکەمان سەبارەت بەو شار و دەستوورەی دەمانەوێت دایانمەزرێنین خۆزگەیەکی ڕووت نییە. هەرچەندە دامەزراندنیان دژوارە، بەڵام مەحاڵ نییە؟ لەو باوەڕەدای تەنیا لەو ڕێگەیەوەی باسمان کرد ئەو کاتەی فەیلەسووفێک، یان چەند فەیلەسووفێک فەرمانڕەوایی دەکەن دادەمەزرێن؟ فەیلەسووف ئارەزوومەندی ڕێزلێنان نییە و دادوەری بە بنەڕەتی و گرنگ دەبینێت، هەوڵی سەقامگیرکردنی دەدات.
دروستە.
(دەوڵەت) ئەو منداڵانەی تەمەنیان دەساڵانە، وەردەگرێت. لەدەست بەها ڕەوشتیەکانی نێو خێزان ڕزگاریان دەکات. فێری ئەو بەها ڕەوشت و یاسایانە دەکرێن، کە لە پێشتر باسمان کردن. ئەمە بۆ دامەزراندنی شار و دەستوورەکەمان، بەختەوەرکردنی هاوڵاتیان و سوودگەیاندن ڕێگەیەکی کورتە.
ئەوە ڕێگەیەکی خێرا و ئاسانە. بە بۆچوونی من، سوکرات، ڕوونکردنەوەکەت زۆر چاکە.
ئێستا وەڵامی پرسیارەکەت دەست کەوتووە و بە کۆتایی باسەکەمان گەیشتووین.

باشە، گلاوکۆن، ئێمە لەسەر ئەم خاڵانە ڕێکەوتووین: ئەگەر بمانەوێت دەوڵەتێکی چاک دابمەزرێنین پێویستە ژن و منداڵ لە خوێندن و پەروەردەدا و لە کاتی ئاشتی و جەنگدا هاوبەش بن. فەرمانڕەواکانیش ئەو هاوڵاتیانەن، کە سەلمێنراوە لە فەلسەفە و زانستی جەنگسازییدا چاکترینن.

بەڵێ، لەسەر ئەوانە ڕێکەوتین.

بێجگە لەمە، ڕێکەوتین، کە فەرمانڕەواکان سەرکردایەتی لەشکریش دەکەن. هەموو لە شوێنێکدا پێکەوە دەژین. کەس لەوان جێگەی تایبەتی خۆی پێ نادرێتێ. ئەگەر لەبیرت بێت باسی ئەوەشمان کرد، کە فەرمانڕەواکان چیان هەبێت.

لەبیرمە گوتمان نابێت، وەکو فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ ئارەزوومەندی کەلوپەل بن و مووچەیان بدرێتێ.

ڕاستە، مادامەکی بە کۆتایی باسەکەمان گەیشتووین بۆ سەر ئەو خاڵە دەگەڕێمەوە، کە لە ڕێگەکە لایداین.

ئەوە کارێکی سەخت نییە. زۆربەی کێشەکانمان سەبارەت بە شارەکەمان ڕوون کردۆتەوە. تۆ باست کرد، کە ئەو شارە و فەرمانڕەواکەشی چاکن. ئێستاش دەردەکەوێت شتی زۆرتر هەبێت لەسەریان بدوێیت. هەروەها گوتت، ئەگەر ئەم فۆرمی شار و فەرمانڕەوایە چاک بن، ئەوانی دیکە خراپن. ئەگەر لەبیرم بێت ئاماژەت بۆ چوار خەسڵەتی فۆرمە خراپەکان کرد. ئێمەش پێویستە ئەو فۆرمانە بناسین و هەمان کات بیدۆزینەوە کێ بۆ فەرمانڕەوایی ڕەوایە. داخۆ ئەو کەسە بەختەوەرە یان نا.

پێش ئەوەی پۆلیمارکۆس و ئەدیمەنتۆس گفتوگۆکەمان ببڕن پرسیارم لەبارەی ئەو فۆڕمە خراپانەوە لێ کردیت.

ئەوە ڕاستە.

کەوابوو، وەکو زۆرانبازێک، جارێکی دیکە، لە شوێنی خۆتا ڕاوەستە و وەڵامی پرسیارەکەم بدەوە.
ئەگەر بتوانم.
دەمەوێ ئەو چوار فۆڕمە خراپانە بناسم.
مادامەکی ناوەکانیان دەزانین ئەم کارە ئاسانە.
یەکەم، جۆرە دەستوورێک هەیە، زۆرینەی خەڵک ستایشی بۆ دەکەن. بۆ نموونە دەستووری کریتان و لاکۆنتان51.
دووەم، لە ستایشکردنیشدا، دەکەوێتە ڕیزی دووەمـەوە و بە ئۆلیگارکی ناوزەد دەکرێت و پڕە لە خراپە.
سێیەم، هەرچەندە ئەم دەستوورە لەگەڵ ئۆلیگارکیدا ناکۆکە، بەڵام لەوێوە سەرهەڵدەدات و دیموکراسیەتە. چوارەمیش، لە هەموویان خراپتر زۆرداریـیـە. ئایا بێجگە لـەم چـوار جـۆرە چی دیکە هەیە من باسم نەکردبێت؟ دەوڵەتی بنەماڵەیی و شاهەنشاهی، کە لەنێو بەربەرییەکانیشدا هەن، دەکەونە نێوان ئەم چوار فۆڕمە خراپانەوە.
لەبارەی هەندێک فۆڕمی فەرمانڕەوایی لەنێو گەلانی بەربەریدا بیستوومانە زۆر سەیرە.
دەزانیت بەقەد ژمارەی خەسڵەتەکانی مرۆڤیش دەستوور هەیە؟ تۆ وا دەزانیت دەستوورەکان لە بەرد، یان داربەڕووەوە پەیدابوون و پەیوەندییان بە خەسڵەتی ئەو مرۆڤە شارییانەوە نییە، کە فەرمانڕەوایی دەکەن؟
نا، لەو باوەڕەدا نیم سەرچاوەیەکی دیکەیان هەبێت.
کەوابوو، ئەگەر پێنج جۆر فەرمانڕەواییمان هەبێت پێویستە پێنج جۆر دەروونی مرۆڤیش هەبێت.
هەڵبەتە.
ئێمە ئاماژەمان بۆ فەرمانڕەواییکردنی ئەرستۆکراتیانە کرد، کە جۆرێکی چاک و دادوەرانە بێت.
ئاماژەمان بۆ کرد.
لێرە دەبێت باسی فۆڕمە کەمتر چاکەکان، ئەوانەی ئارەزوومەندی سەرکەوتن و ڕێزلێنانن، وەکو دەستووری لاکۆنیان بکەین.
پاش ئەوە لەسەر ئۆلیگارکی و دیموکراسی و زۆرداری دەدوێین

و خراپترینیان دەستنیشان دەکەین. لەگەڵ چاکترین فۆڕمدا بەراوردی دەکەین. لەم ڕێگەیەوە دادوەری و نادادوەری تەواو دەناسین. دەزانین شوێنکەوتووانی چ فۆرمێک بەختەوەر یان نابەختەوەرن. ئەنجا بە یەکێک لە بۆچوونەکان ڕازی دەبین و شوێن تراسیماکۆس، یان دۆزینەوە تازەکەمان دەکەوین.

پێویستە وابێت.

وەکو چۆن پێش دۆزینەوەی چاکەکان لە ژیانی تاکە کەسدا باسی چاکەکانی دەستوورمان کرد، ئێستاش دەبێت لەو دەستووره بکۆڵینەوە، کە ئارەزوومەندێتی بۆ ڕێزلێنان تێدایە. لەگەڵ خەسڵەتی تاکە کەسدا بەراوردی بکەین. دوایی ڕژێمی ئۆلیگارکی و هەڵوێستی ئۆلیگارکی لە مرۆڤدا، دیموکراسی و مرۆڤی دیموکرات، دواجاریش دێینە سەر ڕژێمی زۆردارانە و مرۆڤی زۆردار.

بە دیدی من ئەوە کارێکی چاکە.

یەکەمجار ڕوونی دەکەینەوە چۆن ئەو ڕژێمەی ئارەزووی ڕێزلێنانە (تیمۆکراسی)52 لەنێو ڕژێمێکی ئەرستۆکراسیدا سەرهەڵدەدات. ئایا هۆی گۆڕان لە دەستووردا جەنگی ناوخۆ نییە، کە دەستە و تاقمێکی گەورە دەیسەپێنن؟

دروستە.

گلاوکۆن، چۆن شارەکەمان (دەوڵەتەکەمان) گۆڕانی بەسەردا دێت؟ چۆن جەنگی ناوخۆ لەنێو خەڵکیدا یان یاریدەدەرەکان و فەرمانڕەواکاندا هەڵدەسێت؟ دەتەوێت ئێمەش، وەکو هۆمیرۆس لە موساس بپاڕێینەوە53، تاکو پێمان بڵێت چۆن جەنگی ناوخۆ بۆ یەکەمجار سەری هەڵدا؟ دەتوانین بڵێین تراجیدی لەگەڵماندا دەدوێن، وەکو چۆن یاری لەگەڵ منداڵدا دەکەیت، ئەوانیش یاری لەگەڵ ئێمە دەکەن؟

ئەوان چ دەڵێن ؟

ئەمە دەڵێن: شارێک بەم جۆرە دامەزرابێت هەڵوەشاندنەوەی دژوارە، بەڵام ئەوەی سەرەتای هەیە کۆتاییشی دێت. تەنانەت دەستوورێکی وەکو ئەوەی ئێوە هەمیشەیی نییە و ڕۆژێک دێت لەناوبچێت. بەم شێوەیەش لەناودەچێت: لە ڕووەک و ئاژەڵدا لەش و دەروون لەنێو

بارودۆخی لەباردا بەردەگرن، نەشونما دەکەن و لەناودەچن. هەندێکیان کەم ئەوانی دیکە زۆرتر دەژین. ئێستا ئەو فەرمانڕەوایانەی پەروەردە کراون تاکو شارەکە بگرنە دەست، هەرچەندە لێزان و (فەیلەسووفن) بەسەر زاوزێکردن و نەزۆکی ڕەگەزی مرۆڤدا زاڵ نابن. هەندێکجار بێئەوەی پێویست بێت منداڵ دروست دەکەن. بۆ منداڵبوون بازنەیەک هەیە، کە پەیوەندی بە ژمارەوە هەیە. بۆ مرۆڤ ژمارە یەک بناغەیە، چوارگۆشەشی لەسەر دادەمەزرێت و سێ درێژی و چوار چەمک بەخۆوە دەگرێت و جیاوازی و لێکچوون پێکدەهێنێت. کەمکردن و زیادکردن دروست دەکات، پەیوەندی و گونجاندنی نێوان شتەکان دروست دەکات. لەنێو توخمەکاندا ئەگەر چوار و سێ بخرێنە سەر پێنج، دوو هارمۆنی دروست دەکەن؛ یەکەمیان چوارگۆشەیە، کە سەدجار گەورەیە. ئەوەی دیکە بەقەد ئەو درێژە و لاکێشەیە. لایەکی سەدی دووجایە ئەگەر لەسەر تیرەکەی (پێنج)، یان (دووی لێدەرکەیت). لاکەی دیکەی سەد، شاقوڵی سێیە. ئێستا ئەو ژمارەیە شێوەیەکی ئەندازیاری دروست دەکات، کە دەست بەسەر باشی و خراپی منداڵبوون دەگرێت. ئەگەر فەرمانڕەواکانمان نەزان بن ژن و پیاو بۆ مەبەستی منداڵبوون لە کاتی نالەباردا جووت بکەن منداڵەکان خراپ دەردەچن، هەرچەندە چاکترین منداڵ بۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژێردرێت، هێشتا شیاوی ئەوە نییە جێگەی باوکی بگرێتەوە و فەرمانڕەوایی بکات54. کاتێک ئەم منداڵە دەسەڵات دەگرێتە دەست، ناتوانێت بەتەواوی فەرمانڕەوایی بکات و ئاگای لە ئێمە بێت. خۆشەویستیان بۆ مۆسیقا و هۆنراوە کەم دەبێتەوە و گوێ بە وەرزش نادەن. لەبەرئەمە لاوەکانمان لەم ڕووەوە نەزان دەردەچن. ئەم فەرمانڕەوایانە لە دۆزینەوە و ناسینی ئەو کاتانەدا هاوڵاتیانی لێ دروست بووە، وەکو هزیۆد دەڵێت؛ زێڕ، زیو، مس و ئاسن سەرکەوتوو نابن. ئاسن و زیو یان مس و زێڕ تێکەڵ دەکەن و نایەکسانی و لێکنەچوون سەرهەڵدەدەن، کە دەبن بەهۆی سەرهەڵدانی ڕقوکینە و جەنگ. موساس باسی ئەم هۆیەی (بۆ جەنگی ناوخۆ) کردوە و ئەمەش وەڵامی پرسیارەکەتە.

ئێمەش گوتەکەی موساس پەسەند دەکەین.

پێویستە، چونکە موساس خواوەندە.

پاش ئەوە موساس چ دەڵێت؟
کاتێک جەنگی ناوخۆ هەڵدەگیرسێت، ئاسن و برۆنز دەستوورەکە بۆ مەبەستی پارە پەیداکردن و ماڵ و زەوی داگیرکردن بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن. زێڕ و زیویش، کە لە بنەڕەتەوە هەژار نین و خاوەنی دەروونێکی تێر و دەوڵەمەندن، دەستوورەکە بەرەو چاکە و سەقامگیرکردنی سیستەمەکەی پێشوو دەبەن. ئەم دوو لایەنە لەگەڵ یەکدیدا دەکەونە مشتومڕ و ناکۆکییەوە، تاکو هەردوولایان لەسەر زەوی و ماڵ ڕێدەکەون. زۆر لە مرۆڤە ئازادەکان تەنانەت هاوڕێکانیان دەکەن بە کۆیلە و خزمەتکاری خۆیان. خۆشیان بۆ جەنگ دژی یەکدی و چەوسێنراوەکان ئامادە دەکەن.
ئەم گۆڕانە پاش جەنگەکە ڕوودەدات.
ئایا ئەم جۆرە ڕژێم و دەستوورە ناکەوێتە نێوان ئەرستۆکراسی و ئۆلیگارکییەوە؟
دروستە.
پاش گۆڕانەکە چۆن بەڕێوە دەچێت؟ لەو باوەڕەدا نیت، کە مادامەکی دەکەوێتە نێوانەوە سوود لە ئەرستۆکراسی و ئۆلیگارکی وەردەگرێت، هاوکات خەسڵەتی خۆشی هەیە، کە ونی ناکات؟
ڕاستە، وایە.
فەرمانڕەواکان ڕێزیان بۆ دادەنرێت: سەبازەکان پیشەی جووتیاری و کرێکاری ناگرنە دەست. هەموو پێکەوە دەخۆن و مەشقی سەربازی دەکەن تاکو بۆ جەنگ ئامادە بن؛ ئایا لەم ڕووەوە دەستوورەکە لە ئەرستۆکراتی ناچێت؟
وایە.
لەلایەکی دیکەوە، لەبەرئەوەی فەیلەسووفەکان، وەکو جاران سادە نین و دەروونیان پڕ بووە لە شتە تێکەڵاوەکان بۆ فەرمانڕەوایی جێگەی بڕوا نین. پاش ئەم گۆڕانە دەروونییە زۆرتر بیر لە جەنگ و دۆزینەوەی فێڵ بۆ بردنەوەی جەنگ نەک سەقامگیرکردنی ئاشتی دەکەنەوە، ئەم جۆرە دەستوورە شتێکی سەیر نییە؟
سەیرە.
هەروەها، خەڵکی نێو ئەم جۆرە شارە (دەوڵەتە)، وەکو کەسانی نێو

ڕژێمی ئۆلیگارکی حەزیان لە پارەیە. لەژێرەوە زۆر ئارەزوومەندی کۆکردنەوەی زێڕ و زیون. شوێنی تایبەتی نهێنیان بۆ پارە و زێڕەکانیان دروست کردوە. بە دەستبڵاوییەوە بۆ ژن، یان ئەو شتانەی حەزی لێ دەکەن پارەکەیان خەرج دەکەن.

ڕاستە.

ئەم جۆرە کەسانە دڵیان نایەت پارەی خۆیان خەرج بکەن. دەیانەوێ پارە و ماڵی کەسانی دیکە بخۆن و حەز و خۆشییان لێ داگیر بکەن. وەکو ئەو منداڵەی لەژێر دەستی باوکی هەڵدێت و ڕادەکات، ئەمانیش لە لێپرسینەوەی یاسایی ڕادەکەن. بایەخ بە گفتوگۆ و فەلسەفە نادەن. حەز لە خوێندن ناکەن و دەبێت بەزۆریش فێر بکرێن. وەرزشیش لەسەروو مۆسیقا و هۆنراوەوە دادەنێن.

ئەو دەستوورەی لێرەدا باسی دەکەیت لایەنی چاک و خراپیشی هەیە.

بەڵێ، هەردوو لایەنەکەی هەیە، بەڵام لایەنێک لە هەموو لایەنەکانی دیکە زۆرتر بە زەقی تیایدا دەردەکەوێت، ئەویش حەزکردنە لە سەرکەوتن و ڕێزلێنان.

زۆر ڕاستە.

ئەمەش شێوەو سەرچاوەی ئەم جۆرە دەستوورەیە. ئێمەش هەموو خەسڵەتەکانیمان ڕوون نەکردۆتەوە، بەڵام توانیومانە لە باسکردنەکەدا جیاوازییەکانی نێوان لایەنەکانی دادوەری و نادادوەری بناسین. هەمان کات، ڕوونکردنەوەی خەسڵەتەکانی هەموو دەستوورێک بەوردی درێژخایەنە.

ڕاستە.

کێ هەیە ئەم دەستوورە بەرقەرار بکات؟ ئەو کەسە چۆن پەیدا دەکرێت و چ جۆرە کەسێکە؟ ئەدیمەنتۆس گوتی: وابزانم ئەو کەسە گلاوکۆنە، چونکە حەزی لە سەرکەوتنە. من گوتم، لەوانەیە ئەو بێت، بەڵام لەم باوەڕەدا نیم گلاوکۆن ئەم خەسڵەتەی هەبێت.

چ خەسڵەتێک؟

ئەو کەسە، ملهوڕە و کەم حەزی لە مۆسیقا و هۆنراوەیە. لەگەڵ ئەوەشدا وا خۆی دەردەخات، کە حەزیان لێ دەکات. دەیەوێت بەشداری

گفتوگۆکان بکات، بەڵام گوتەبێژێکی چاک نییە. وەکو خوێندەوارێک مامەڵە لەگەڵ کۆیلەکانیدا ناکات. بەرانبەریان دڵڕەقە. لەگەڵ مرۆڤی سەربەستدا نەرمە و ملکەچی فەرمانڕەواکانە. حەزی لە ڕێزلێنان و فەرمانڕەواییشە. بۆ فەرمانڕەواییش خۆی بە کەسێکی لێهاتوو دادەنێت، نەک لەبەرئەوەی زانا و قسەزانە، بەڵکو ڕاوچی چاکە و شارەزایی لە جەنگدا هەیە.

بەڵێ، ئەوانە خەسڵەتەکانی ئەو کەسەن.

لەبەرئەوەی ئەو کەسە لە دەروونیدا جۆرە حەزێکی بۆ پارە هەیە هەرچەندە بە لاوی ئەو حەزە دەرناخات و خۆی نیشان دەدات ڕقی لەپارە بێت، کە گەورە بوو یان چووە تەمەنەوە هەوڵی پارەکۆکردنەوە دەدات. ئایا ئەمە لەبەر ئەو هۆیە نییە، کە ئەو کەسە نەیتوانیوە ببێت بە فەرمانڕەوایەکی چاک؟

ئەدیمەنتۆس گوتی: ئەو فەرمانڕەوا چاکە کێیە؟

ئەو کەسەیە تیایدا هۆش، مۆسیقا و هۆنراوە تێکەڵ بوون.

ئەوە شتێکی چاکە.

لاوێکی تیمۆکراسی، وەکو ڕژێمە تیمۆکراسییەکەیە.

بەتەواوی دروستە.

ئەو لاوە بەم جۆرەش پەیدا دەبێت: ئەو کوڕی باوکێکی چاکە لە شارێکدا دەژی، کە ڕژێمێکی چاک بەڕێوەی نابات. ئارەزووی لە ڕێزلێنان و فەرمانبەری و دادگایی نییە. خۆی لە کاروباری خەڵکی هەڵناقورتێنێ، تاکو تووشی کێشە نەبێت.

چۆن دەبێت بە تیمۆکراتی؟

کەسایەتی ئەم لاوە لەو کاتەوە دروست دەبێت، کە گوێی لە بۆڵە و گلەیی دایکی دژی باوکی دەبێت. گوایە مێردەکەی، وەکو مێردی ژنانی دیکە فەرمانبەر نییە و دەستی ناڕوات. وەکو پیاوەکانی دیکە حەزی لە پارە نییە و بێدەنگە. گوێ بە مشتومڕ و دەسەڵات نادات. مێردەکەی ڕێز لە بیروباوەڕی ژنەکەی ناگرێت. لەبەرئەمە لای کوڕەکەی گلەیی دەکات و دەڵێت باوکی نیوە پیاوە، لەگەڵ دایکیدا باش نییە.

ئەدیمەنتۆس گوتی: ئەو ژنانە گلەیی زۆریان هەیە.

بەڵێ، تەنانەت خزمەتکاری ئەم جۆرە پیاوانەش بەدزییەوە ئەو

گلەییانە لەبەردەم کوڕی ماڵەکەدا دەکەن. کاتێک باوکەکە سزای کەسێک نادات، کە قەرزەکەی نەداتەوە، یان خراپەیەکی بەرانبەر کردووە هانی کوڕەکەی دەدەن تۆڵە بسەنێت، وەکو باوکی دڵنەرم نەبێت. کوڕەکە لە دەرەوەش هەمان شت دەبیستێ و دەبینێت؛ ئەوانەی دڵسۆزن بە گەمژە و کەسانی ملهوڕ و خۆتێهەڵقورتێنەریش خەڵات دەکرێن و ڕێزیان لێ دەگیرێت. هەروەها، گوێ لە باوکیشی دەگرێت. دەبینێت ئەو چۆن دەژی و لەگەڵ ژیانی کەسانی دیکەدا بەراوردی دەکات. ئەم دوو (هێزە) لاوەکە بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن. باوکی دەبێتە مایەی گەشەکردنی هۆشی و کەسانی دیکەش مایەی گەشەکردنی ئارەزووەکانی. لەبەرئەوەی خۆی بە سروشت خراپ نییە و کەوتۆتە نێو کەسانی خراپەوە بەلای یەکێک لەم دوو لایەنەدا بەتەواوی ناڕوات و لەنێوان هەردووکیاندا دەمێنێتەوە.

حەزی بۆ سەرکەوتن و ڕێزلێنان پەرە دەسێنێت.

بە بیروڕای من زۆر چاک ئەم کێشەیەت ڕوون کردۆتەوە.

باشە، ئێستا دێمە سەر دەستووری دووەم و جۆری دووەمی مرۆڤەکەش، (کە شوێن ئەو دەستوورە دەکەوێت).

پێویست دەکات لەگەڵ ئەسخیلۆسدا بڵێین، ئەمجارە باسی مرۆڤەکە دەکەین، کە لە شارەکەی دەچێت، یان بەگوێرەی نەخشەکەی خۆمان لەپێشدا لەسەر جۆری ڕژێمی شارەکە بدوێین؟

بەگوێرەی نەخشەکەمان درێژە بە باسەکەمان دەدەین.

وابزانم ئەوەی لێرەدا پێویستە لەسەری بدوێین ئۆلیگارکییە.

بەڵێ، باسی ئەو دەستوورە دەکەین، کە لەسەر موڵکدارێتی دادەمەزرێت. دەوڵەمەندەکان فەرمانڕەوایی دەکەن و هەژارەکان تیایدا لە دەسەڵات بێبەری دەکرێن.

من تێدەگەم.

پێویست ناکات بزانین چۆن تیمۆکراسی دەبێت بە ئۆلیگارکی؟

پێویستە.

دڵنیام، کوێرێکیش ئەم گۆڕانە دەبینێت.

چۆن گۆڕانێک؟

خەزێنەی دەوڵەت پڕ دەبێت لە زێڕ و ڕژێمەکە دەڕوخێنێت. یەکەم،

فەرمانڕەواکان دەکەونە خەرجکردنی خەزێنە بۆ خۆیان و بەگوێرەی ئەوەش یاسا دادەنێن. دوایی خۆیان و ژنەکانیان سەرپێچی یاساکە دەکەن.

دروستە، ئەوە دەکەن.

فەرمانڕەواکان چاو لە یەکدی دەکەن و هەموو دەکەونە پارەخواردن.

وایە.

لەوێوە بیر لە کۆکردنەوەی پارە دەکەنەوە. چەند پارەشیان خۆش بوێت، ئەوەندەش لە چاکەکردن دووردەکەونەوە.

لەو باوەڕەدا نیت، کە پارە و چاکە دوو شتی جیاواز بن؟ لەسەر دوو تای تەرازوو جیاواز ڕاوەستن؟

ڕاستە.

ئەگەر لە شارێکدا ڕێز لە دەوڵەمەند و پارە بگیرێت چاکە و کەسانی چاک کەمتر دەبینرێن.

ڕاستە.

کەوابوو، لە ئاکامدا ئارەزوومەندانی سەرکەوتن و ڕێزلێنان دەبن بە پارەپەرست. حەز لە کەسانی دەوڵەمەند دەکەن. دەیانەوێ دەوڵەمەندەکان فەرمانڕەوایی بکەن و ڕێز بۆ هەژاران دانانێن.

بەدڵنیاییەوە.

ئایا جۆرە یاسایەک دروست ناکەن، کە لەگەڵ دەستووری ڕژێمەکەدا بگونجێت؟ یاسایەک پەیوەندی بە موڵک و سامانەوە هەبێت؟ هەروەها، یاساکەش بەزۆر لە ڕێگەی هێزە چەکدارەکەیانەوە، یان چاوترسکردنی خەڵکی دەسەپێنن. ئایا ئەوە ناکەن؟

بێگومان وایە.

بەگشتی، ئەم دەستوورە بەم جۆرە بەرقەرار دەبێت.

بەڵێ، بەڵام چ خەسڵەتێکی هەیە؟ لایەنە خراپەکانیشی چین؟

یەکەمجار، بۆ پێناسەکردنی بنەڕەتی یەک شت هەیە. ئایا کەشتییەک دەدرێتە دەست دەوڵەمەندێک لەبەرئەوەی دەوڵەمەندە، بەمەرجێک لەبارەی کەشتیەوانییەوە، هیچ نازانێت؟ کەشتیەوانێکیش لەبەرئەوەی هەژارە ئاوڕی لێ نەدرێتەوە؟

دڵنیام، دەوڵەمەندەکە بە باشی کەشتیەکە بەڕێوە نابات.
منیش وا دەڵێم.
ئایا ئەم نموونەیە بۆ (بەڕێوەبردنی) شاریش دەبێت؟
دەبێت.
کەوابوو، ئەوە خراپترین لایەنی ئۆلیگارکییە.
دیارە وایە.
لەبارەی لایەنی خراپی دووەمەوە چ دەڵێیت؟ ئایا لە لایەنی یەکەم بچووکترە؟
ئەو لایەنە چیە؟
ئەو شارە لە خۆیدا دوو شارە: شاری دەوڵەمەندەکان و شاری هەژارەکان. ئەم دوو شارەش هەمیشە لەنێو ناکۆکیدان و دژی یەکدی کار دەکەن.
بە خوا ئەم لایەنەش بەقەدەر لایەنی یەکەم خراپە.
ئەم لایەنەش لەوانەی پێشوو باشتر نییە. ئەویش لاوازی ئەم ڕژێمەیە لە ئاستی هەڕەشەکردنی جەنگدا. بۆ جەنگ پێویستیان بە خەڵکێکی زۆرە چەکدار بکرێن. ئەمەش بۆ فەرمانڕەواکان دەبێتە مەترسییەکی گەورە، کە بە ژمارە کەمن. هەروەها فەرمانڕەواکان پارەپەرستن. نایانەوێ پارە بۆ جەنگ خەرج بکەن.
بێگومان، ئەوەش لایەنێکی خراپە. ئەی لەبارەی خۆتێهەڵقورتانیان لە کاروباری کەسانی دیکەدا چ دەڵێیت؟ ئایا بەگوێرەی ئەم دەستوورە ئەوانەی جووتیارن بۆیان نییە بازرگانی و سەربازییش بکەن؟ تۆ ئەمە بە دروست دادەنێیت؟
نەخێر، دروست نییە.
ئێستا با بزانین ئەم دەستوورە یەکەمین خراپەی لێوە دەرچێت یان نا؟
ئەوە چیە؟
دەشێ کەسێک هەرچیەکی هەیە بیفرۆشێت و بچێت بۆ شارێک و بەبێئەوەی پەیوەندی بەو شارەوە هەبێت لەوێ هەژارانە بژی و هیچ کارێکیش نەکات. نەتوانێت ببێت بە بازرگان، پیشەساز، ئەسپفرۆش، یان چەکفرۆش.

ئەوە کارێکی خراپە.

ڕژێمی ئۆلیگارکی ڕێگە لەم جۆرە کارە ناگرێت، چونکە لەنێو ئەم ڕژێمەدا دوو کۆمەڵی جیاواز هەن؛ دەوڵەمەند و هەژار.

ڕاستە.

ئێستا بیر لەمەش بکەوە: ئەو کەسەی شتەکانی خۆی فرۆشت و ئێستا هیچی نییە، ئایا لە پێشتر، کە خاوەن سامان و موڵک بوو، سوودی زۆرتری بۆ شارەکەی هەبوو؟

یەکێک بوو لە هاوڵاتیان، بەڵام هیچ ڕۆڵێکی نەبوو.

دەتوانین بەو نێرە هەنگەی دابنێین، کە خۆی لە شانەکەدا حەشار دەدات و هیچ کارێک ناکات؟

سوکرات، ئەوە زۆر ڕاستە.

ئایا خوا هەندێک نێرە هەنگی بە باڵ و بێ چزو بۆ پێوەدان و ئەوانی دیکەی بێ باڵ و چزودار دروست نەکردوە؟ ئەوانەی بێ چزون لە تەمەنی پیریدا نابن بە سواڵکەر، چزودارەکانیش خراپەکەر؟

بەتەواوی وایە.

ئاشکراشە لە شارێکدا سواڵکەر هەبێت دز و گیرفانبڕ و خراپەکەریش پەیدا دەبن.

ئاشکرایە.

لەو شارانەدا، کە ڕژێمی ئۆلیگارکییان تێدا سەقامگیر بووە چۆنە؟ ئایا سواڵکەریان تێدایە؟

بێجگە لە فەرمانڕەواکان هەموو ئەوانەی تیایدا دەژین سواڵکەرن.

لەو باوەڕەدا نیت کەسانی تێدا بێت چزویان بۆ پێوەدان هەبێت، خراپەکەر بن و فەرمانڕەواکان دەسەڵاتیان بەسەردا گرتبن؟

لەو باوەڕەدام هەن.

ئایا هۆی ئەوە نەبوونی پەروەردە، یان پەروەردەکردنێکی خراپ و دەستوورە خراپەکەیە؟

بەڵێ.

کەوابوو، ڕژێمی ئۆلیگارکی ئەم لایەنە خراپانە و زۆری دیکەشی هەیە، کە ئێمە باسمان نەکردوون.

منیش لەو باوەڕەدام ئەم لایەنە خراپانەی هەیە.

لێرەدا، لەمە زۆرتر لەسەر ئۆلیگارکی ئەو ڕژێمەی فەرمانڕەواکانی دەوڵەمەندن و دەسەڵاتیان بە موڵک و سامانیانەوە بەستراوە نادوێین. لەو کەسە دەکۆڵینەوە، کە دەبێت بە فەرمانڕەوا. هەوڵ دەدەین بزانین چ جۆرە کەسێکە و چۆن فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست.

باشە.

ئایا گۆڕانەکە لە تیمۆکراتەوە بۆ ئۆلیگارک بەم شێوەیە ڕوودەدات.

چ شێوەیەک؟

کوڕی باوکێکی تیمۆکرات شوێن پێی باوکی دەکەوێت. لەپڕ دەبینێت باوکی دژی شارەکەیە، وەکو کەشتیەوانێک کەشتیەکە بە بەردەڵانی و کەناری دەریادا دەکێشێت. کەشتیەکە و هەرچی تێدایە بە خۆیەوە نووقم دەبن. لەوانەیە ئەو باوکەش جەنراڵێکی گەرە یان فەرمانبەرێک بووبێت، کە لە دادگادا گەواهی درۆیان لەسەر داوە و حوکمی مردن یان دوورخستنەوەی لەسەر دراوە، یان مافی یاسایی لێ سەندراوەتەوە و موڵک و سامانی داگیر کراوە.

لەوە دەچێت.

کوڕەکەی ئەمانە دەبینێت. خەم دەخوات، هەرچیەکی هەیە و دەڕوات و لە ژیانی خۆی دەترسێت. لەم حاڵەتەدا، لەژێر باری ئەم ژیانەدا گۆڕانی بەسەردا دێت. ژیانی هەژاری هانی دەدات بۆ پارەپەیداکردن کار بکات و کۆی بکاتەوە. لەو باوەڕەدا نیت ئەم کەسە ئارەزووی بۆ بازرگانی و پارەپەیداکردن هەبێت، تاج بکاتە سەری و بە کڵاوی زێڕین و تەوقەو شمشێری فارسییەوە بیڕازێنێتەوە؟

لەو باوەڕەدام.

هۆش و بەشەکانی دیکەی دەروون بە نزمتر لە ئارەزووەکانی دادەنێت و دەیانکات بە کۆیلە. هۆش تەنیا بۆ پارەپەیداکردن و کۆکردنەوە بەکاردەهێنێت. ڕێگەی دەداتێ ڕێز بۆ موڵک و موڵکدارەکان دابنێت. ئەم گۆڕانە لە خۆشەویستی بۆ ڕێزلینانەوە بۆ پارەپەیداکردن ڕوودەدات. ئایا ئەم کەسە نەبووە بە ئۆلیگارک؟

بەدڵنیاییەوە، بووە بە ئۆلیگارک و لەوەش دەچێت چۆن دەستووری ئۆلیگارکی هاتە کایەوە.

با لەگەڵ دەستووری ئۆلیگارکییدا بەراوردی بکەین؟
باشە.
ئایا لێکچوونەکەیان لەپێش هەموو شتێکەوە لەوێدا نییە، کە هەردووکیان بایەخێکی زۆر بە پارە دەدەن؟
هەڵبەتە.
دووەمیش، وەکو کەسێکی ڕەزیل بەگوێرەی پێویستیەکەیان پارە خەرج دەکەن، حەز و ئارەزووەکانی دیکەیان خەفە دەکەن.
ڕاستە.
سوود لە هەموو شتێک وەردەگرن و دەیشارنەوە و زۆرینەی لێ بێبەری دەکەن. ئەم جۆرە کەس و دەستوورە ئۆلیگارکین؟
منیش لەگەڵتام. پارە بۆ کەسێکی ئۆلیگارک و ڕژێمەکەشی گرنگە.
لەو باوەڕەشدام، ئەم جۆرە کەسە بایەخ بە پەروەردە و فێربوون نادات.
منیش هامان بۆچوونم هەیە. ئەگەر بایەخ بە فێربوون بدات کوێرێک لەپێش کۆرسەکەوە بۆ گۆرانیگوتن دانانێت و ئەوەندەش ڕێزی لێ ناگرێت55.
باشە.
بیر لەمەش بکەوە: لەبەرئەوەی ئەم کەسە پەروەردە نەکراوە، ئایا دەتوانین بڵێین ئارەزووەکانی هەڵوێستی سواڵکەرانە و خراپەکاریشی تێدایە، بەڵام خۆیان دەرنەخستووە؟
بەدڵنیاییەوە.
دەزانیت لەکوێدا ئەو هەڵوێستانە دەردەکەون؟
لەکوێ؟
لەوێدا، وەکو پاسەوانی پەرستگای ئۆرفن هەلێکی گەورەی بۆ ڕێدەکەوێت خراپە بکات.
ڕاستە.
ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە هەرچەندە بە کەسێکی چاک و دادوەر ناسراوە، ڕاست نییە و هێشتا لایەنە خراپەکەی خۆی دەرنەخستووە؟ ئەو خۆی نەگەیشتۆتە ئەو ڕازیبوونەی خراپە نەکات. لایەنە خراپەکانی خۆی لەناوبەرێت، بەڵکو لەترساندا، یان زۆری لێکراوە دەریان

نەخات.
ڕاستە.
ئەم جۆرە کەسانە، وەکو نێرەی هەنگ بەسەر پارە و ماڵی کەسانی دیکەوە دەژین.
وایە.
ئەم جۆرە کەسانە لە جەنگی دەروونیدا دەژین. لە ناوەوە دوو کەسن، بەڵام ئارەزووە چاکەکانی لایەنە خراپەکانی شاردۆتەوە.
ڕاستە.
لەبەرئەمە، ڕێزی بۆ دادەنرێت، بەڵام خۆی لە ناوەوە کەسێکی چاک نییە.
لەو باوەڕەدام وابێت.
بێجگە لەمە، ئەم کەسە ڕەزیلە، لەپێشبڕکێکردندا بەرەو سەرکەوتن هەژارە، چونکە ئامادە نییە پارە لەپێشبڕکێکەدا بۆ ناوداریێتی خۆی خەرج بکات. لە دەستبلاوی دەترسێت، وەکو ئۆلیگارکییەک کەم خەرج دەکات. لەبەرئەمە دەدۆڕێت، بەڵام بە دەوڵەمەندی دەمێنێتەوە.
ڕاستە.
پێویستە گومان لە لێکچوون لەنێوان مرۆڤە ڕەزیلەکە و ڕژێمی ئۆلیگارکیدا بکەین؟
نەخێر، ئەوە جێگەی گومان نییە.
دەردەکەوێت باسەکەمان لەبارەی ئۆلیگارکییەوە کۆتایی پێ هاتبێت. ئێستا دێینە سەر دیموکراسیەت. چۆن ئەم ڕژێمە دێتەکایەوە؟ خەسڵەتەکانی چین؟ هەروەها باسی مرۆڤێکی دیموکراتیش دەکەین، کە لەو ڕژێمە دەچێت. ئەمەش بەردەوامییە لە باسەکەماندا.
باشە، گۆڕان لە ئۆلیگارکییەوە بۆ دیموکراسیەت چۆن ڕوودەدات؟ ئایا بۆ مەبەستی دەوڵەمەندبوونی شارەکە نییە؟
چۆن؟
فەرمانڕەواکان، کە دەوڵەمەندن یاسایەک بۆ ڕێگرتن لە پارە خەرجکردن لەبەردەم لاواندا دروست ناکەن، چونکە ماڵوێرانبوونی لاوان سوودی ئەوانی تێدایە. ئەوان قەرز بە لاوان دەدەن، سوود لەسەر قەرزەکەش دادەنێن. بەمجۆرە خۆیان دەوڵەمەنتر دەکەن.

دروستە، ئەوە دەکەن.

لێرەدا ناکرێت خۆشەویستی بۆ پارە و مامناوەندێتی لە شێوەی ژیانگوزەراندا هاوتەراز بکرێن. لایەنێکیان دەبێت لەوی دیکە نزمتر بێت.

ڕاستە.

لە ڕژێمی ئۆلیگارکییدا لەبەرئەوەی گوێ بە ڕادەی خەرجکردن نادرێت، زۆرجار دەوڵەمەندێک تیایدا دەبێت بە سواڵکەر.

وایە.

ئەم جۆرە کەسانە بێکار لە شارەکاندا دادەنیشن و چەکیان پێیە، چزویان بۆ پێوەدانیش هەیە. لەبەرئەوەی دەوڵەمەند نین، موڵکەکانیان لەدەست داوە، یاساش پارێزگارییان ناکات. بە ڕقوکینەوە دەڕواننە دەوڵەمەندەکان (فەرمانڕەواکان) و حەزیان لە شۆڕشکردنە.

ڕاستە.

بازرگانەکانیش خۆیان لە ئاستی ئەو کەسانەی ژیانیان ڕووخاوە کوێر دەکەن و هەوڵ دەدەن بە قەرزدان ژیانی ئەوانەش بشێوێنن، کە بەرگرییان کردوە. ڕێژەی سوودەکەیان بەرز دەکەنەوە و ژمارەیەکی گەورە لە کۆمەڵەکە دەکەن بە نێرەهەنگ و سواڵکەر.

بێگومان ڕاستە.

ئاگری ئەم خراپەیە دەکەوێتەوە و ئامادەبوونیان بۆ کوژانەوەشی دەرناخەن. نایانەوێت لە ئاستی ئەوانەدا ڕێگەگر بن، کە پارەکانیان بە دەستبڵاوییەوە خەرج دەکەن و هەموو شتێک دەدۆڕێنن.

چارەسەرێکی دیکەش نادۆزنەوە.

چ چارەسەرێک؟

ئەوەی زۆر لە هاوڵاتیان دەکات بە خۆیاندا بچنەوە: یاسایەک دابنرێت بۆ ڕێکەوتن لەسەر قەرزوەرگرتن، کە زۆر لە قەرز وەرگرەکە نەکات و مەترسی قەرزکردنیش ڕوون بکاتەوە. لێرەدا دەتوانین لایەنی خراپی ئەم جۆرە بازرگانیە کەم بکەینەوە.

ئەوە یاسایەکی چاکە.

بەو شێوەیەی ڕوونمان کردەوە فەرمانڕەواکان مامەڵە لەگەڵ هاوڵاتیان دەکەن، بەڵام بۆ خۆیان و منداڵەکانیان ژیانێکی خۆشیان

دامەزراندوە. لە ئاستی خۆشی و ناخۆشی دەروونی و جەستەییدا لاوازن و تەمەڵیشن.
هەڵبەتە.
ئایا ئەم دەوڵەمەندانە، بەپێچەوانەی هەژارەکانەوە، بێجگە لە پارەپەیداکردن بیر لە هیچی دیکە دەکەنەوە؟
نەخێر.
کاتێک فەرمانڕەوا و فەرمانڕەواییکراوەکان لە گەشتێکدا، لەسەر کەشتیەک یان لەنێو ئۆردوگایەکدا یەکدی دەبینن لە یەکدی دەترسن؟ ئایا هەژارەکان بە ڕقەوە تەماشایان ناکەن؟ کاتێک مرۆڤە هەژارە سیس و ڕەشهەڵگەڕاوەکەی بەر خۆر لە جەنگدا شان بە شانی دەوڵەمەندێکی قەڵەو شەڕ دەکات، کە لەبەر سێبەر گەورە بووە، بیر لەوە ناکاتەوە ئەم مرۆڤە دەوڵەمەندە لە ڕێگەی چەوساندنەوەی هەژارەکانەوە بەو پلەیە گەیشتووە؟ ئەو کاتەی هەژارەکان پێکەوە دادەنیشن ناڵێن، کە ئەم مرۆڤانە لەژێر بەزەیی ئێمەدان و بە کەڵکی هیچ نایەن؟
لەو باوەڕەدام ئەوە ڕوودەدات.
کەوابوو، وەکو چۆن لەشێکی سیس و لاواز بە نەختێک (سەرما) نەخۆش دەکەوێت، ئەم جۆرە شارە بە بیانوویەکی بچووک جەنگی ناوخۆ تیایدا هەڵدەگیرسێت. پێویستی بە دوژمن نییە لە دەرەوە پەلاماری بدات و بیڕوخێنێت.
بەتەواوی وایە.
لەو باوەڕەدام دیموکراسیەت پاش سەرکەوتنی هەژارەکان و کوشتن و دەرکردنی نەیارەکانیان لە شارەکەدا سەرهەڵدەدات.
لەم ڕێگەیەوە بەگوێرەی دەستوورەکەشیان هەموو هاوڵاتیان بە یەکسان دادەنرێت و فەرمانڕەواش لەلایەن زۆرینەوە هەڵدەبژێرێت.
بەڵێ، دیموکراسیەت بەم شێوەیە دادەمەزرێت. زەبریش بەکاردێت، چونکە لایەنە نایارەکە لە دەرکردن دەترسێت.
هاوڵاتیان لەنێو ئەم ڕژێمەدا، چۆن دەژین؟ چ جۆرە دەستوورێکیان هەیە؟
دڵنیام، مرۆڤی سەر بەو ڕژێمە کەسێکی دیموکراتە.
پێش هەموو شتێک، ئایا هاوڵاتیان (لەژێر سایەی ئەو ڕژێمەدا)

سەربەستن؟ سەربەستی بیروڕادەربڕینیان هەیە؟ دەتوانن ئەوەی دەیانەوێت بیکەن؟

دەبێت وابێت.

ئەگەر ئەم سەربەستیەیان هەبێت بە ئارەزووی خۆیان ژیان بەڕێوە دەبەن.

وایە.

لەنێو ئەم ڕژێمەشدا هاوڵاتیان وەکو یەکدی نین و سروشتی جیاوازیان هەیە؟

هەڵبەتە.

ئەم ڕژێمە دەردەکەوێت جوانترین بێت. بە نەخش و نیگاری، جۆراوجۆر ڕازابێتەوە، چونکە ئەو کەسانەی تێدا دەژی خاوەنی سروشتی جیاوازن. هەر کەسێک لە دوورەوە ئەم شارە ببینێت بە جوان و ڕازاوە دێتە بەرچاوی.

ڕاستە.

ڕژێمێکی لەوە باشتر نییە.

بۆچی وا دەڵێیت؟

لەبەرئەوەی سەربەستی هاوڵاتیان مسۆگەر دەکات. لەوە دەچێت بە دڵی خۆت بازاڕ دەستوورێک بکڕیت. دڵنیام بە دڵی خۆت دەستوورەکەت دەست دەکەوێت.

لەم شارەدا مەرج بۆ فەرمانڕەوایی نییە. تەنانەت ئەگەر توانای فەرمانڕەوایشت نەبێت، یان بتەوێت فەرمانڕەوایی بگریتە دەست، بەشداری جەنگ بکەیت یان نا، بەستراون بە حەزی تۆوە. هیچ داوایەکی یاساییش ڕێگەگر نییە ئەگەر تۆ بتەوێت لە فەرمانڕەواییدا بەشدار بیت. ئایا ئەم ژیانە خۆش نییە؟

بەڕاستی خۆشە ئەگەر بەردەوام بێت.

لەبارەی بێدەنگی تاوانبارەکانەوە چ دەڵێیت؟ ئەوانەی ئەم ڕژێمە فەرمانی کوشتن و دوورخستنەوەیانی داوە. نابینیت وەکو قارەمانێکی نەناسراو بێدەنگ دێن و دەچن کەس بیریان لێ ناکاتەوە؟

بەڵێ، دەیانبینم.

لەبارەی لێبوردنەوە چ دەڵێیت؟ ئێمە لە دامەزراندنی شارەکەماندا

ئەوەمان باس نەکرد، کە فەرمانڕەواکان دەبێت لە منداڵییەوە بخرێنە بەر بەرنامەی فێربوون و پەروەردە و کەسانی چاکیان لێ دەرچێت؟ ئایا دیموکراسیەت ئەم پلانەمان ناخاتە ژێر پێیەوە و تەنیا ئاوڕ لە زۆرینە ناداتەوە؟

بەڵێ، ئەوە دەکات.

ئەمانە و هەندێکی دیکەش خەسڵەتەکانی دیموکراسیەتن. ئەمە ڕژێمێکی جوانە، بەڵام لەڕووی فەرمانڕەواییەوە هەژارە. کەسانی جۆراوجۆری تێدا دەژی و یەکسانییان پێ دەدات. هەموویان وەکو یەک دادەنێت.

من لە مەبەستت تێدەگەم.

چ جۆرە مرۆڤێک دیموکراتە؟ حەزدەکەیت بزانیت مرۆڤی دیموکرات چۆن، یان لەکوێوە، پەیدا دەبێت؟

بەڵێ، حەزدەکەم بزانم چۆن پەیدا دەبێت.

ئایا بەمجۆرە نییە؟ کوڕی ئۆلیگارکە ڕەزیلەکە، وەکو باوکی دەرناچێت؟

هەڵبەتە.

کوڕەکەش، وەکو باوکی بەزۆر ئارەزووی بۆ خەرجکردنی پارە خەفە دەکات و بە نا پێویستی دادەنێت.

دروستە.

دەتەوێت جیاوازیی نێوان پێویست و ناپێویست بزانیت؟

حەزدەکەم بزانم.

ئەو خۆشیانە پێویستن، کە ناتوانین وازیان لێ بهێنین، چونکە سوودبەخشن؟ ئەمەش لە سروشتەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە.

هەڵبەتە.

ئەم جۆرانە بە پێویست دادەنێین.

وایە.

ئەو خۆشیانە چۆنن، کە بوونیان بەرەو چاکەمان نابات و دەتوانین وازیان لێ بهێنین؟

ڕاستە، ئەگەر بە ناپێویست ناوزەدیان بکەین؟

بەڵێ، ڕاستە.

بۆئەوەی باشتر لە واتاکانیان تێبگەین نموونەیان لەسەر دەهێنینەوە.
باشە.
ئایا ئەم جۆرە چێژانە بە پێویست دادەنرێن: چێژ لە خواردن، ئەو جۆرە خواردنەی بۆ تەندروستیمان باشە و بەهێزمان دەکات، پێویست نییە؟
پێویستە.
چێژی خواردن لە دوو ڕووەوە پێویستە: بۆ لەشمان چاکە و بەردەوامییش بە ژیانمان دەدات.
بەڵێ.
حەزکردن و چێژوەرگرتن لە خواردنی خۆشیش لەوێدا پێویستە، کە سوودی بۆ ژیانمان هەبێت.
تەواوە.
ئەگەر ئارەزووی خواردنێک بکەین و نەمانەوێت بیخۆین، چونکە لە منداڵییەوە فێرکراوین ئەوە بۆ تەندروستیمان خراپە و دەبێت لەبەردەمیدا خۆڕاگر بین، تۆ بە ناپێویستی دادەنێیت؟
بێگومان ناپێویستە.
ئەم جۆرە ئارەزووە بە ڕەزیل و ئەوانەی پێشوو بە بازرگان دانانێت، کە سوودیان بۆ زۆر لە پرۆژەکانمان هەیە.
بەدڵنیاییەوە.
بەهەمان شێوە تەماشای ئارەزووەکان بۆ سێکس و ئەوانی دیکە ناکەیت؟
بەڵێ، بەو شێوەیە تەماشایان دەکەم.
لە پێشتر ڕوونمان نەکردەوە، کە ئەو مرۆڤەی لە نێرەی هەنگ دەچێت دەروونی پڕە لەم جۆرە ئارەزووانە. هەمان کات ئارەزووە ناپێویستەکان حوکمی بەسەردا دەکەن. فەرمانڕەوا ئۆلیگارکیەکەش شوێن ئارەزووە پێویستەکان دەکەوێت؟
بەڵێ وابوو.
ئێستا با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان، بزانین چۆن مرۆڤێکی ئۆلیگارک دەبێت بە دیموکرات. بە بۆچوونی من بەم شێوەیە ئەم

گۆڕانە ڕوودەدات.
چ شێوەیەک؟
ئەو لاوەی بە ڕەزیلی و بێ پەروەردە و فێربوون گەورە دەبێت و تامی هەنگوینی نێرەهەنگەکە دەکات، خۆی لەو جۆرە کەسانە نزیک دەکاتەوە، کە خۆشی پێ دەدەن. سەرەتای گۆڕانکارییەکانی بەرەو کەسێکی دیموکرات سەرهەڵدەدات.
ئەمە لە سەرەتای گۆڕانەکە دەچێت.
وەکو چۆن پارتێکی ڕامیاری لە شارێکدا بە هاوکاریکردن لەگەڵ پارتێکی هاوبیر لە شارێکی دیکەدا دەتوانێت دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر بکات، ئەو لاوەش دەتوانێت داوای یارمەتی لەوانە بکات، کە هەمان حەز و ئارەزووی ئەویان هەیە؟
دەتوانێت.
ئەگەر لایەنێک بەرگری لە هەڵوێستی ئۆلیگارکی ئەو بکات گرنگ نییە. ئەو لایەنە باوکی، یان ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەی بێت جۆرە ڕەتدانەوە و یاخیبوونێکی لەنێودا سەرهەڵدەدات و دژی ڕادەوەستێت.
ڕاستە.
هەندێکجار دیموکراسیەت دەبێت بە ڕێگەخۆشکەر بۆ ڕژێمی ئۆلیگارکی. لێرەدا ئارەزووەکانی چەند لاوێک دادەمرکێنەوە و لە دەروونیاندا ئارامی بەرقەرار دەبێت.
ئەوە ڕوودەدات.
لەگەڵ دامرکاندنەوەی ئەو ئارەزووانەدا چەند ئارەزوویەکی نوێ سەرهەڵدەدەن، کە لە ئارەزووە کۆنەکانەوە نزیکن، چونکە باوکی ئەو لاوانە نەیزانیوە چۆن منداڵەکانی پەروەردە بکات.
دروستە.
ئەو ئارەزووە نوێیانەش لە هاوڕێی خراپ نزیکیان دەکەنەوە. هانیان دەدەن بەدزییەوە سێکس بکەن و منداڵ دروست بکەن.
زۆر ڕاستە.
(ئەم ئارەزووانە) دەروونی لاو داگیر دەکەن و بە نەزان دایدەنێن، کە ڕێگەی چاک و ڕاست ناناسێت.

ئەوەش ڕوودەدات.
لەگەڵ نەبوونی پاسەوانی (زانیندا) ناڕاستی، وشەی ڕەنگاوڕەنگ و بڕوای بێ بناغە لەنێو دەروونیدا سەرهەڵدەدەن و دەسەلاتی خۆیان دادەمەزرێنن.
بەڵێ، ئەوانە سەرهەڵدەدەن.
ئایا لەم حاڵەتەدا ئەو لاوە لەگەڵ ئەم ئارەزووە گوڵهەڵوەرێنانەدا بەئاشکرا ناژی؟ ئەگەر یەکێک لە خێزانەکەی بیەوێت یارمەتی بدات، بە وشە ڕەنگاوڕەنگەکانی ڕێگەی لێ ناگرێت و دەست بە ڕوویەوە نانێت؟ ئارەزووەکانی بۆ سەقامگیرکردنی دەسەلات لە جەنگدان. مامناوەندێتی بە ترسنۆکی و گەمژەیی دادەنێن.. ئایا لاوەکە بەو باوەڕە ناگەیەنن، کە دەستگیری لە خەرجکردندا و خۆڕاگری نالەبار بن؟
بێگومان ئەوە دەکەن.
پاش جێکردنەوەی خۆیان لەنێو دەروونەکەدا و دەرکردنی لایەنە چاکەکان بەرەڵایی و بەفیڕۆدان و بێ شەرمی، وەکو تیشکی مەشخەڵ بەپەلە خۆیان دەهاونە نێو دەروونەکەوە. بەرەڵایی و منداڵدروستکردنی (بێ نەخشە وپلان) بە سەربەستی و ئازایەتی دادەنێن. لاوەکە دەبێت بە بەرەڵاخواز و شوێنکەوتووی ئارەزووە ناپێویستەکان.
بەڵێ، ئەم گۆڕانەی تیادا ڕوودەدات.
پاش ئەم گۆڕانە پارە و کاتی خۆی بۆ تێرکردنی ئارەزووە ناپێویستیەکانی خەرج دەکات. ئەگەر بەختداریش بێت، کە پیر بوو پاش دامرکاندنەوەی حەز و ئارەزووەکانی (تەمەنی لاوێتی)، ڕوو لە ئارەزووە پێویستەکان دەکات و خۆی دەخاتە ژێر دەستیانەوە. ئەمانیش لەگەڵ ئارەزووە ناپێویستیەکاندا هاوتەراز دادەنێت.
ڕاستە.
بڕوا بەوەش ناکات دوو جۆری جیاواز ئارەزوو هەبن؛ یەکەمیان پێویست و چاک، دووەمیان ناپێویست و خراپ، کە دەبێت جڵەوی بگیرێت. ئەو هەردووکیان بە چاک دادەنێت.
هەموو کەسێک لە شوێنی ئەودا بەو شێوەیە، لە ئارەزووەکان تێدەگات.
ڕۆژانە خۆی دەخاتە ژێر دەسەلاتی ئارەزووەکانیەوە. هەندێکجار

زۆر دەخواتەوە و گوێ لە دەنگی شمشاڵ دەگرێت. جاری واش هەیە تەنیا ئاو دەخواتەوە و پارێز دەکات؛ هەندێکجار وەرزش دەکات، جاریش هەیە تەمەڵە و ناجووڵێت؛ تەنانەت هەوڵ دەدات فەلسەفەش فێر بێت. خۆی لە ڕامیارییەوە هەڵدەقورتێنێ. لە دەربڕینی بیروڕاکانیدا بە حەماسەتەوە لەنێو کورسییەکەیدا بەرز دەبێتەوە و هاوار دەکات. ئەگەر حەزی لە سەربازی بێت دەبێت بە سەرباز و بازرگانیش بە بازرگان. ڕێکوپێکی و پێویستی لە ژیانیدا نابینرێن، بەڵام ژیانی خۆی بە خۆش و سەربەست و بەختەوەر دادەنێت.

تۆ چاک باسی ژیانی ئەو کەسە دەکەیت، کە باوەڕی بە یەکسانیی یاسایی هەیە.

هەروەها دەڵێم، ئەو مرۆڤە ئاڵۆزە چەند خەسڵەتێکی جیاواز لە ناخیدا کۆبوونەتەوە. دەروونی لە ڕژێمێکی دیموکراسی دەچێت. لەبەرئەمە، لەوانەیە زۆر لە ژن و پیاوەکان حەسوودی بە ژیانی بەرن.

ڕاستە.

ئایا ئەم مرۆڤە بە کەسێکی دیموکرات دابنێین؟

بەڵێ، من لەگەڵتام، ئەوە کەسێکی دیموکراتە.

ئێستاش چاکترین دەستوور و چاکترین فەرمانڕەوا؛ هەروەها زۆرداریێتی و زۆردار ماون لەسەریان بدوێین.

وایە.

ئایا ئەمیش بەو شێوەیەی دیموکراسیەت لە ئۆلیگارکییەوە سەریهەڵدا لە دیموکراسیەوە سەرهەڵنادات؟ چۆن؟

ئۆلیگارکی لەسەر موڵک و سامان دامەزرا. وانەبوو؟

ڕاستە.

ئایا ئارەزووی بێ سنوری دیموکراسیەتیش بۆ ئەو شتانەی بە چاکی دادەنێت، نابێتە هۆی ڕووخانی ئەم ڕژێمەش؟

مەبەستت لەو چاکەیە چیە؟

مەبەستم سەربەستیە. ڕژێمێکی دیموکراسی سەربەستی بە چاکترین دادەنێت. لەبەرئەمەیە ڕژێمی دیموکراسی بۆ ئەوانەی بە سروشت سەربەستن چاکترینە.

بەڵێ، زۆرجار ئەمە دەبیستین.

ئایا ئارەزووی بێ سنور بۆ سەربەستی و گوێنەدان بە لایەنەکانی دیکەی ژیان ڕێگە بۆ دیکتاتۆریەت خۆش ناکات؟

چۆن؟

کاتێک ڕژێمی دیموکراسی، کە تینوی سەربەستییە ساقیەکانی دەوروبەری (فەرمانڕەواکان) خراپ بن ڕژێمەکە لەبەر خواردنەوەی شەرابی سەربەستی سەرخۆش بێت. ئەگەر فەرمانڕەواکان ڕێگەی ئەو سەربەستییە بەرنەدەن لەلایەن شارەکەوە، بە ئۆلیگارک ناوزەد دەکرێن و سزا دەدرێن.

بەڵێ، ڕاستە.

ئەوانەی پەیڕەوی فەرمانڕەواکان دەکەن بە کۆیلە و بێکەڵک دادەنرێن، کە ستایشی فەرمانڕەواکان لە هەموو شوێنێکدا دەکەن. فەرمانڕەواکانیش وەکو فەرمانڕەواییکەرەکان، فەرمانڕەواییکەرەکانی ش وەکو فەرمانڕەواکان هەڵسوکەوت دەکەن. پێویستە لەم شارەدا سەربەستی سنوردار بکرێت؟

هەڵبەتە.

ئەو سەربەستیە بە نێوماڵەکاندا بڵاو دەبێتەوە و بەرەلایی لێوە دەردەچێت. تەنانەت ژیانی ئاژەڵەکانیش دەگرێتەوە.

مەبەستت چیە؟

باوک، وەکو منداڵ هەڵسوکەوت دەکات و لە کوڕەکەی دەترسێت. منداڵیش دەبێت بە باوک و خۆی بە سەربەست دادەنێت. ترسی لە باوکی نییە و ڕێزی بۆ دانانێت. بێگانەیەک لە شارەکەدا، وەکو هاوڵاتیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و بە یەکسان دەبینرێن.

بەڵێ، ئەوە ڕوودەدات.

وایە. شتە وردەکانی دیکەش بەمجۆرە دەردەکەون. مامۆستاکان لە خوێندکارەکانیان دەترسن، ستایشیان بۆ دەکەن. خوێندکارەکانیش ڕقیان لە مامۆستاکانە. بەگشتی، لاوەکان بە کردەوە و لە قسەکردندا لەگەڵ گەورەکاندا پێشبڕکێ دەکەن و لاساییان دەکەنەوە. گەورەکانیش خۆیان دەخەنە ڕیزی لاوەکانەوە، وەکو ئەوان یاری دەکەن، ڕادەبوێرن و لە دەسەڵات ناترسن.

بەتەواوی ڕاستە.

ئەوپەڕی سەربەستی لەویدا بەرقەرار دەبێت، کە کۆیلە و خاوەن کۆیلە، ژن و پیاو، وەکو یەک سەربەستن. هەروەها، لەبیرم چوو باسی یەکسانیی ژن و پیاو لەبەردەم یاسادا و سەربەستیەکەیان لە پەیوەندییەکانیاندا بکەم.
لەبارەی ئاژەڵەوە چ دەڵێیت؟ ئایا لەگەڵ ئەسخیلۆس ڕێدەکەوین، کە دەڵێت، "ئەوەی لەسەر زارتە بیدرکێنە"56.
بەدڵنیاییەوە. بەمجۆرە باسی دەکەم: ئەوەی تاقی نەکردبێتەوە نازانێت ئاژەڵی ماڵی لە شارێکی دیموکراسیدا چەند سەربەستە.
وەکو دەڵێین، سەگ دەبێت بە دەستگیران؛ ئەسپ و کەر بە سەربەرزی بە نێو شاردا دەسوڕێنەوە و خۆیان بە خەڵکدا دەدەن. ئاژەڵەکانی دیکەش بەهەمان شێوە سەربەستن.
ئەوەی تۆ باسی دەکەیت منیش دەیزانم.
بەکورتیەکەی: هاولاتیان لە ئاستی چەوساندنەوەدا دڵڕەق ڕادەوەستن. تەنانەت تۆزقاڵێک هەست بەوە بکەن، کە چەوساونەتەوە توڕە دەبن و دژی ڕادەوەستن. دواجاریش گوێ نادەنە یاساکان و هیچ دەسەڵاتێکیش لە ژوور خۆیانەوە دانانێن.
وایە.
بە بۆچوونی من، زۆرداریێتی لەم هەڵوێستەوە سەرهەڵدەدات.
ڕاستە، بەڵام دوای ئەمە چی ڕوودەدات.
ئەو نەخۆشیەی تووشی ڕژێمی ئۆلیگارکی هات، بووە هۆی ڕووخانی. هەمان نەخۆشی تووشی ئەم ڕژێمەش دەبێت، بەڵام لەم ڕژێمەدا نەخۆشیەکە گرانترە و دیموکراسیەت لەناو دەبات. زۆرجار زیادەڕۆیی لە بوارێکدا ئاکامێکی دژوەستاو دەگرێتە خۆی. ئەمەش لە وەرزەکان و ڕووەک و لەشدا، دواجاریش لە ڕژێم و دەستووردا ڕوودەدات.
ئەوە شتێکی چاوەڕوانکراوە.
زیادەڕۆیی لە سەربەستیدا ئاکامەکەی کۆیلایەتیە. گرنگ نییە ئەمەش لە ژیانی تاکە کەسدا، یان شارێکدا بێت، هەر ڕوودەدات.
وایە.
کەوابوو، لەو باوەڕەدام زۆرداریێتی ئاکامی دیموکراسیەتە. لەو سەربەستییە بێ سنوورەوە دەگەینە ئەوپەڕی کۆیلایەتی.

ڕاستە، ئەوەش بۆچوونێکی لەبارە.
بەڵام هەست دەکەم پرسیارەکەی تۆ جیاواز بێت. تۆ پرسیارت لەبارەی ئەو نەخۆشییەوە کرد، کە تووشی ئۆلیگارکی و دیموکراسیەت دەبێت.
وایە.
ئەوەی لەبیرمدا بوو، لە وەڵامدانەوەکەدا باسی بکەم، دەستەیەک لە مرۆڤە تەمەڵە دەستبڵاوەکان بوو، کە ئازاترینیان دەبێت بە فەرمانڕەواو ترسنۆکترینیشیان فەرمانڕەواییکراو. ئەم دوو جۆرە ئەندامانەشمان بە نێرە هەنگی چزودار و بێ چزو دانا.
ڕاستە.
ئەم دوو جۆرە کێشەیە بۆ هەموو دەستوورێک دروست دەکەن. بۆ لەش وەکو بەڵغەم و نەخۆشی زراون. دژی ئەمانیش پزیشکی چاک و یاساسازکەر لە شارەکەدا کار دەکەن، هەوڵ دەدەن نەهێڵن سەرهەڵدەن و کە سەریشیان هەڵدا دەیانەوێت بەزووترین کات بنبڕیان بکەن.
پێویستە بنبڕ بکرێن.
لەنێو ڕژێمێکی دیموکراسییدا سێ چین هەن: یەکەمیان چینی ملهوڕەکانە. ئەم چینە لەنێو ڕژێمی ئۆلیگارکیشدا سەرهەڵدەدات (بە نێرەهەنگ ناوزەدمان کرد). هۆی سەرهەڵدانی ئەم چینەش بۆ سەربەستییە بەربڵاوەکە دەگەڕێتەوە.
وایە.
بەڵام لە ڕژێمێکی دیموکراسیدا ئەمە زەقترە.
چۆن؟
لە ڕژێمی ئۆلیگارکیدا ئەندامانی نێو ئەم چینە مافی فەرمانڕەواییان پێ نەدراوە و پەروەردە نەکراون. بەهێزیش نین، بەڵام لە ڕژێمی دیموکراسیدا دەبن بە فەرمانڕەواکەران. خەڵکی تەنیا لە دەوری گوتەبێژەکاندا کۆدەبنەوە و نابن بە خاوەنی دەسەڵاتی ڕامیاریی شارەکە.
ڕاستە.
کەوابوو چینێک هەیە، کە لە زۆرینەی خەڵکەوە جیاوازە.
ئەو چینە چیە؟

له بازرگانیکردندا ئەوانەی بە بەرنامە و ڕێکوپێکی پیشەکە بەڕێوە دەبەن، پارەی زۆرتر پەیدا دەکەن و دەوڵەمەندتر دەبن.
دەشێت.
ئەوان هەنگوینی زۆرتر بۆ نێرەهەنگەکان دروست دەکەن.
چۆن (هەنگوینی) زۆرتر دروست دەکەن، کە ئەوان (لە شارەکەدا) کەم بن؟
من ئەمە ناو دەنێم چینی دەوڵەمەند، کە نێرە هەنگەکان لەسەریان دەژین.
دەتوانین ئەو ناوەیان لێبنێین.
ئەوانەی خەریکی ئیشوکاری دەستین چینی سێیەم دروست دەکەن. ئەوان خۆیان لە کاروباری ڕامیارییەوە تێهەڵناقورتێنن.
بە ڕادەیەکی کەمیش موڵک و سامانیان هەیە، بەڵام پێکەوە گەورەترین و بەهێزترین چینی نێو ڕژێمی دیموکراسین.
ڕاستە،
بەڵام یەکناگرن، مەگەر بیانەوێت لە هەنگوینخواردندا بەشداری بکەن.
ئەوان بەشیان دەدرێت. هەرچەندە فەرمانڕەواکان بەشێکی زۆری ئەو هەنگوینە، کە لە چینی دەوڵەمەندی دەسەنن بۆ خۆیانی هەڵدەگرن.
بەڵێ، بەو جۆرە بەسەر خەڵکدا دابەش دەکرێت.
ئایا ئەوانەی موڵک و سامانەکەیان لێ دەسەنرێت و بەسەر کەسانی دیکەدا دابەش دەکرێت، دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن؟
هەڵبەتە.
ئەگەر نەیانەوێت شۆڕشیش بکەن نێرەهەنگەکان بەوە تاوانباریان دەکەن، کە گوایە دژی کۆمەڵن، ئۆلیگارکییانە ڕەفتار دەکەن.
ڕاستە.
لە کۆتاییدا، کاتێک دەزانن زوڵمیان لێ کراوە دەبن بە ئۆلیگارک و پەنا بۆ لایەنی خراپی ئۆلیگارکی دەبەن. ئەمەش بە خواستی خۆیان نییە. خەڵکیش (لەنێو ڕژێمی دیموکراسیدا) بە نەزانی دەمێننەوە. نێرە هەنگەکان هەڵیاندەخەڵەتێنن.
لێرەدا تاوانبارکردن و دادگاییکردن دێتە ئاراوە.

ڕاستە.
ئایا خەڵکی فێرنەکراون تاکێک بکەن بە پێشەوای خۆیان و گەورەی بکەن؟
ئەوە دەکەن.
ئەمەش سەرەتای پەیدابوونی زۆرداریـیە. زۆردار لێرەوە سەرهەڵدەدات.
وایە.
ئەو گۆڕانکارییە لەپێشەوایەکی کۆمەڵەوە، بۆ زۆرداریێک چۆن دەستپێدەکات؟ ئایا لەوێدا ڕوونادات، کە پێشەواکە، وەکو پاڵەوانی نێو چیرۆکی پەرستگای لیکیۆنی زیۆس، لە ئارکادیا هەڵسوکەوت بکات؟
کام چیرۆکە؟
گوایە گۆشتی مرۆڤیان لەگەڵ گۆشتی دیکـەدا قیمە کـردوە و خواردوویەتی و بووە بە گورگ. ئەم چیرۆکەت نەبیستووە؟
بیستوومە.
ئەمەش لەو پێشەوایەدا ڕوودەدات، کە دەسەڵاتی بەسەر شارەکەدا گرتووە. هیچ شتێک ڕێگەی ناگرێت ئەگەر خوێنی کەسوکار و خزمەکانی خۆی بڕێژێت؛ کێشەی ساختەیان بۆ دروست بکات، بۆ دادگاییکردن ڕایانکێشێت و فەرمانی کوشتنیان دەربکات، خوێنی هاوڵاتیانیش بخواتەوە. هەندێکیان دەکوژێت، یان دەربەدەریان دەکات. قەرزەکان لەسەر خۆی لادەبات و یاسای دابەشکردنی زەوی هەڵدەوەشێنێتەوە.
دوای ئەم کارانە چارەنووسی چی دەبێت؟ ئەگەر بە دەستی دوژمنەکانی نەکوژرێت نابێت بە گورگ، یان زۆردار؟
بێگومان دەبێت بە زۆردار.
ئەمە ئەو کەسەیە دژی چینی دەوڵەمەند ڕادەوەستێت.
دروستە.
ئەگەر لە شارەکە دەرکرا و بتوانێت جارێکی دیکە بگەڕێتەوە و دەسەڵات بگرێتە دەست، دڕندەتر ڕەفتار ناکات؟
هەڵبەتە.
دوژمنەکانیشی ئەگەر نەیانتوانی جەماوەر دژی هان بدەن هەوڵی

کوشتنی بەدزییەوە دەدەن.
ئەوە دەکەن.
لێرەدا کێشەی ئەوانەش دێتە پێش، کە دەبن بە پاسەوانی زۆردارەکە.
ڕاستە.
ئەمەش لەبەرئەوەیە ژیانی لە مەترسیدایە.
ڕاستە.
کاتێک دەوڵەمەندێک بەوە تاوانبار دەکرێت، کە دژی کۆمەڵە، وەکو پێشبینیەکەی کرۆسێس وایە، کە دەڵێت؛ بێ شەرمانە و ترسنۆکانە خۆی گەیاندە نێو زیخ و بەردی کەناری ڕووباری هێرمس.
ئەوە ڕاستە شەرم ناکات.
بەڵام بگیرێت دەیکوژن.
بەدڵنیاییەوە.
ئەو پێشەوایەی بەزەوییدا نەدراوە خۆی بە گەورە و بەرز داناوە. پاش لەناوبردنی نەیارەکانی، وەکو زۆردارێک لەنێو گالیسکەی شاردا ڕادەوەستێت.
لەوە زیاتر چ هەیە بیکات؟
ئێستا پێویستە باسی جۆری بەختەوەری لە ژیانی ئەو مرۆڤە و شارەدا بکەین، کە زۆردار فەرمانڕەوایی تێدا دەکات.
پێویستە، حەزدەکەم باسی بکەین.
ئایا زۆردار لە سەرەتاوە بۆ ماوەیەکیش پاش دەسەڵاتوەرگرتنیش ڕووی خۆش نیشانی هاوڵاتیان نادات؟ بەڵێنی زۆریان پێ نادات؟ قەرزەکانیان لەسەر لانابات؟ زەوییەکانیان بەسەردا دابەش ناکات؟ خۆی وەکو پێشەوایەکی نەرم و چاک دەرناخات؟ ئەوە دەکات.
پاش ئەمە ڕوو لە دوژمنەکانی دەکات و ئاگری جەنگ خۆش دەکات تاکو هاوڵاتیان بگەنە ئەو باوەڕەی بوونی پێشەوایەک بۆ ئەم کارە پێویستە.
هەڵبەتە.

هاوڵاتیانیش ئەوەندە باج بۆ جەنگەکە دەدەن هەژار دەبن و بیر لە پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەیان دەکەنەوە و کاتیان بۆ وەستان دژی فەرمانڕەواکە نابێت.
بەدڵنیاییەوە.
لەسەروو ئەمەوە، ئەگەر گومان لە کەسێک بکات بە خائین ناوزەدی ناکات و لەناوی نابات؟
لەبەرئەمە نییە زۆردار هەمیشە جەنگخوازە و دەیەوێت جەنگ بەرپا بکات؟
وایە.
لەبەرئەمەش نییە هاوڵاتیان ڕقیان لێیەتی؟
هەڵبەتە.
بێجگە لەمە، ئەوانەی پشتگیری زۆردارەکەیان کرد، یارمەتیان دا دەسەڵات وەرگرێت، ئێستاش لە دەوڵەتەکەدا خاوەنی دەسەڵاتن، ڕەخنە لە زۆردارەکە ناگرن و لەلای ئەو بیروڕای خۆیان دەرنابڕن؟
ئەوە دەکەن.
پێویستە ئەوانەی ئازا، زانا و دەوڵەمەندن لە نزیکەوە ببینێت و خۆی بە دوژمنیان دابنێت، بەردەوام هەوڵی نەمانیان بدات.
دروستە.
بەڵێ، ئەمەش بەپێچەوانەی کارکردنی پزیشکەوەیە لەسەر لەشی نەخۆشێک.
ئەگەر بیەوێت فەرمانڕەوایی بکات ئەو کارە پێویستە بکرێت.
ئەو چاری نییە. دەبێت لەگەڵ زۆرینەیەکی کەم هێز و چەوساوەدا بژی، یان بمرێت.
بەڵێ.
ئایا چەند ڕقی هاوڵاتیان بەرانبەری بەرز بێتەوە، ئەوەندەش پێویستی بە پاسەوان نییە بیپارێزن؟
هەڵبەتە.
کێن ئەو پاسەوانانەی جێگەی متمانەی ئەون؟ لەکوێوە پەیدایان دەکات؟
بە پارە پەیدایان دەکات و ڕایاندەگرێت.

سوێند دەخۆم مەبەستت نێرە هەنگە، کە لە شوێنی دیکەوە دێن.
ڕاستە.
ئەی هاوڵاتیانی شارەکە؟ ئامادە نین؟
ئامادەبوون بۆچی؟
کۆیلەکانی نێو شارەکە سەربەست دەکات و دەیانکات بە پاسەوان.
دڵنیام، زۆر دڵسۆزی دەبن.
زۆردار دەبێت زۆر بەختەوەر بێت.
دۆست و دوژمنی خۆی لەناو بردبێت و پشت بەم پاسەوانانە ببەستێت.
پاسەوانەکانیش مووچەخۆرن.
ئەم پاسەوانانە کەسانی دەوروبەری زۆردارەکەیان خۆش دەوێت. هاوڵاتییە بەڕێزەکانیش ڕقیان لێیەتی و خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە.
هەڵبەتە.
لەم ڕووەوە، تراجیدیا شتێکی چاکە و ئوریپیدسیش تراجیدیانووسێکی گەورەیە57.
بۆچی؟
لە شوێنێکدا زیرەکانە دەڵێت، "ئەو زۆردارانە زانان، کە دەبن بە هاوڕێی کەسانی زانا". مەبەستی لە "زانا" ئەو کەسەیە، کە ئێمە نەماندیوە هاوڕێیەتی زۆردار بکات.
بەڵێ. لە شوێنی دیکەشدا زۆرداری بە خوا داناوە.
کەوابوو، مادامەکی شاعیرە تراجیدییەکان زانان ئەگەر ستایش بۆ زۆردار بکەن، ڕێگەیان نادەین لە شارەکەماندا بژین.
دڵنیام لێمان دەبوورن.
لەو باوەڕەدام بۆ شارەکانی دیکە دەڕۆن. خەڵکی کۆدەکەنەوە و دەنگبەرزەکان بەکرێ دەگرن، باسی دیموکراسیەت و زۆردارییان بۆ دەکەن.
ئەو کارە دەکەن.
لەلایەن سەرۆکە زۆردارەکەوە ڕێزیان لێ دەنرێت و خەڵات دەکرێن، بەڵام ئەوان چەند لەو ڕووەوە بەرز بکرێنەوە، ئەوەندەش

لەچاو کۆمەڵدا، نزم دەبینرێن.
بەتەواوی وایە.
ئێمە لەسەر ئەمەش ڕێنەکەوتین. با بگەڕێینەوە بۆ پاسەوانەکانی سەرۆکە زۆردارەکە، تاکو بزانین چۆن مووچەیان بدەینێ.
ئاشکرایە، زۆردارەکە دەست بەسەر خەزێنەی دەوڵەتدا دەگرێت. بە ئارەزووی خۆی پارە خەرج دەکات.
چ دەکات ئەگەر خەزێنە هیچی تێدا نەما؟
ئەوسا دەگەڕێتەوە بۆ سەر موڵکی باوکی.
ئەوە دەکات.
سەبارەت بەمە چ دەڵێیت؟ ئەگەر خەڵکی تورە بوو لەوەی ڕاست نییە کوڕێکی گەورە لەسەر باوکی بژی، یەکەم، دەبێت بەپێچەوانەوە بێت، کوڕەکە چاودێریی باوکی بکات. دووەم، باوکی دروستی نەکردووە، کە گەورە بوو ببێت بە زۆردار و چەوسێنەر و بەخێویشی بکات. سێیەم، وەکو چۆن باوکێک کوڕەکەی لەماڵەوە دەردەکات، خەڵکیش داوا لەم زۆردارە دەکەن شار چۆڵ بکات.
خەڵکی بۆیان دەردەکەوێت، چ جۆرە کوڕێکیان هەیە، چۆن زۆردارێکیان هێناوەتە کایەوە. ئەوان، کە لاوازن دەیانەوێت بەهێزێک دەربکەن.
مەبەستت چیە؟ زۆردارەکە دەتوانێت، زەبر دژی باوکی بەکار بهێنێت؟
بەڵێ، ئەو کاتەی پەلاماری چەکی باوکی دەدات.
مەبەستت ئەوەیە، کە زۆردارەکە باوککوژە، ڕێز لەو پیاوە پیرە ناگرێت. بۆئەوەی خەڵکی لەنێو تاوەکە ڕزگار بکات، فڕێیان دەداتە نێو ئاگرەکەوە و خۆی کردوە بە خاوەنیان.
لە جێگەی سەربەستیەکەشیان، لە ڕژێمە دیموکراسییەکەدا کە هەیانبووە، ئێستا تووشی کۆیلایەتی بوون. دروستە، ئەوە مەبەستی منە.
باشە، ئێستا بەتەواوی لە گۆڕانکارییەکە، لە دیموکراسیەتەوە بۆ زۆرداری، تێناگەین؟
بەدڵنیاییەوە تێدەگەین.

ئەوەی ماوە باس بکرێت فەرمانڕەوا زۆردارەکەیە. چۆن کەسێکی دیموکرات گۆڕانی بەسەردا دێت و دەبێت بە زۆردار؟

کەسێکی زۆردار چیە؟ ئایا خراپە، یان بەختەوەرە؟

بەڵێ، ئەوە ماوە باسی بکەین.

دەزانیت شتێکی دیکەش هەیە، کە باسمان نەکردوە؟

چیە؟

هەست دەکەم بە باشی لە جۆرەکانی ئارەزوو نەدواوین و جیامان نەکردونەتەوە. ئەگەر ئەمەش نەکرێت باسەکەمان بە تەمومژاوی دەمێنێتەوە.

ئێستا کاتەکەی باش نییە ئەو کارە بکەین؟

بەدڵنیاییەوە کارێکی باشە. هەوڵ دەدەم چیم لەبارەی ئارەزووەکانەوە دەوێت باس بکەم. ئەویش بەم شێوەیەیە: هەندێک لە چێژ و ئارەزووە ناپێویستەکانمان پەیڕەوی یاسا ناکەن. ئەمانەش لەنێو دەروونی هەموو تاکێکدا هەن، بەڵام لە هەندێک کەسدا لەلایەن هۆشەوە سەرپەرشتیان دەکرێت و بەگوێرەی یاساکان دەجووڵێنەوە. کۆمەڵێکی بچووکیش هەن، کە دەتوانن لەناویان بەرن، یان لاوازیان بکەن.

ئەو ئارەزووانە چین؟

ئەو ئارەزووانەن، کە لە کاتی خەوتندا بەئاگان. لە کەتێکدا هۆش نووستووە و بێ ئاگایە، ئەوان نەنووستون و بەئاگان. ئەو بەشە دەروونەی دڕندە و برسی و تینوە و هەوڵ دەدات بۆ تێرکردنی خۆی ڕێگەیەک بدۆزێتەوە. ئەم جۆرە ئارەزووانە بێ شەرمانە بۆ تێرکردنی خۆیان لەگەڵ دایکی خۆشیان جووت دەبن. تەنانەت ئامادەن تاوانیش بکەن.

بەکورتیەکەی بێ شەرمن.
بەتەواوی دروستە.
لەلایەکی دیکەوە، ئەو کەسەی تەندروستی باشە و شێوازێکی ژیانی مامناوەندی هەیە، پاش هەڵسان بەم کارانە دەخەوێت: یەکەم، دەسەڵات بە هۆشی دەدات و پشت بە بەڵگە و سەلماندن دەبەستێت. دووەم، ئارەزووەکانی خۆی ناکوژێت و بەتەواویش ملکەچیان نابێت. لەبەرئەمە دەخەون. لایەنە چاکەکەی دەروونی لە کاتی خۆشی و ئازاردا شپرزە ناکەن. سێیەم، لایەنی ئازایەتیی دەروونیشی بەم شێوەیە ئارام دەکاتەوە. بۆ نموونە، بە توڕەبوونەوە ناخەوێت. پاش دەسەڵاتگرتن بەسەر ئەو دوو لایەنەدا ڕوو لە لایەنی هۆشەکی دەکات و پشوو دەدات. بەمجۆرە دەتوانێت ڕاستی بناسێت و خەوبینینەکانیشی ڕووناکتر دەبنەوە.
بەتەواوی دروستە.
بەهەرحاڵ، کەمێک لە باسەکە لامانداوە، بەڵام خەونەکانمان دەری دەخەن، کە مەترسی و بێ یاسایی لەنێو ئارەزووەکانی هەموو کەسێکدا هەن، تەنانەت ئەوانەی شێوازی ژیانیان مامناوەندیشە. تۆ لەو باوەڕەدایت بۆچوونەکەم پڕ واتا بێت؟
لەو باوەڕەدام و لەگەڵتام.
بیرکەوە چۆن باسی مرۆڤێکی دیموکراتمان کرد. ئەو مرۆڤە باوکێکی ڕەزیلی هەبوو بەخێوی دەکرد، کە تەنیا ڕێزی بۆ ئارەزووکردن لە پارەکۆکردنەوە دادەنا و ڕقی لە ئارەزووە ناپێویستەکان بوو. وا نەبوو؟
بەڵێ وابوو.
هاوڕێکردن لەگەڵ ئەوانەی بەپێچەوانەی باوکییەوە دەژین هانی دەدا شوێن هەموو جۆرە خۆشی و ڕابواردنێک بکەوێت. لەم حاڵەتەدا لەنێوان ئەو دوو شێوازەی ژیاندا ڕادەوەستێت و بەلای هیچ لایەنێکدا ناڕوات. ژیانێک هەڵدەبژێرێت، کە نە کۆیلانەیە و نە بەرەڵابوونیشە. لێرەدا ئەو مرۆڤە لە ئۆلگاریخوازێکەوە دەبێت بە دیموکراسیخواز.
ئەوەمان باس کرد.
بیرکەوە، گریمان ئێستا ئەو مرۆڤە پیر بووە. کوڕێکی هەیە، کە

فێری نەریت و بەها ڕەوشتیەکانی باوکی بووە.

باشە.

ڕووداوەکانی ژیانی باوکی بەسەر ئەویشدا دێن. یەکەم، بەناوی سەربەستیەوە هەموو کارێکی دژ بە یاسا دەکات. باوکی و کەسوکاری دەیانەوێت یارمەتی ئەو ئارەزووانەی بدەن، کە مامناوەندین و کەسانی دیکەش حەز لە بەرەڵابوونەکەی دەکەن.

کاتێک ئەو کاسانەی دەیانەوێت زۆردارێک لەو لاوەدا دروست بکەن، بەڵام ناتوانن ئەو کارەکە بکەن، هەوڵ دەدەن حەز و ئارەزووی سێکس لە دەروونیدا بڕوێنن و دوو باڵی گەورە بەو نێرەهەنگە بدەن و بیکەن بە پێشەوای ئەو ئارەزووە تەمەڵانەی هەموو شتێک خەرج دەکەن.

لەو باوەڕەدایت ئارەزووی سێکس لەم نێرەهەنگانەدا شتێکی جیاوازتر بێت؟

نەخێر.

کاتێک ئارەزووەکانی دیکە پڕ دەکرێن لە بۆنی خۆش، خراپە، شەراب و خۆشییەکانی دیکەشیان لەگەڵدا ڕیز کران.

نێرەهەنگەکە بە ئارەزووی خۆی دەفڕێت و دەنیشێتەوە. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورەتر دەبێت و حەزی بۆ پێوەدانیش زیاد دەکات. ئەم لایەنەی دەروونی ڕوو لە شێتی دەکات و بەرەڵا دەبێت. هەموو لایەنێکی چاک لەنێو دەروونی ئەو مرۆڤەدا دەکوژێت و بەرەو تووندڕەوی پەلکێشی دەکات.

تۆ زۆر چاک باسی سەرهەڵدانی مرۆڤێکی زۆردار دەکەیت.

ئایا لەبەرئەمەش نییە لە کۆنەوە ئارەزووی سێکسیان بە زۆردار داناوە؟

دەردەکەوێت وابێت.

ئایا سەرخۆش، وەکو زۆردار بیر ناکاتەوە؟

بەڵێ وەکو زۆردار بیردەکاتەوە.

مرۆڤێکی شێتیش دەیەوێت بەردەوام فەرمانڕەوایی بەسەر کۆمەڵ و خواکانیشدا بکات.

ئەوە دەکات.

کەوابوو، مرۆڤی زۆردار پڕ بە واتای خۆی ئەو کەسەیە بە سروشت، یان لە شێوازی ژیانیدا، یان بە هەردووکیانەوە، سەرخۆش و پڕە لە ئارەزووی سێکس و شێتە.

بەتەواوی.

ئەمە شێوەی سەرهەڵدانی زۆردارە، بەڵام چۆن دەژی؟

دڵنیام تۆ وەڵامی ئەو پرسیارەت لایە.

بەڵێ، وەڵامەکە دەزانم . ئەو زۆردارەی ئارەزووی سێکس دەروونی داگیر کردوە حەزی لە ئاهەنگگێڕان و ڕابواردن و کچە هاوڕێیە.

پێویستە وابێت.

ئایا لەنێو دەروونی زۆردارەکەدا ئارەزووی دیکە سەرهەڵنادەن و داوای تێربوونی لێ ناکەن؟

بێگومان.

بۆ ئەمەش ئەو کەسە پارەکانی خەرج دەکات.

بەدڵنیاییەوە.

دوای خەرجکردنی پارەکانی دەکەوێتە قەرزکردن.

وایە.

دوای ئەوەی پارەی نەما ئارەزووە وروژاوەکانی دەروونی ناڕەزایی دەرنابڕن؟ ئارەزووی سێکس پێوەی نادات؟ پەلاماری ئارەزووەکانی دیکە نادات؟

ئەوە ڕوودەدات.

لەبەرئەمە ئەو کەسە دوو ڕێگەی لەبەردەمە. بە هەر شێوەیەک بێت پێویستە پارە (بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی) پەیدا بکات، یان خۆی بخاتە نێو تاڵی و ناخۆشییەوە.

پێویستە.

وەکو چۆن ئارەزووی نوێ جێگەی ئارەزووە کۆنەکان دەگرێتەوە و لەناویان دەبات، ئەم لاوەش نایەوێت پارە و موڵکی دایک و باوکی داگیر بکات و خەرجیان بکات؟

هەڵبەتە.

ئەگەر دایک و باوکی ڕازی نەبوون پارەکەیان نادزێت؟

بەدڵنیاییەوە.

ئەگەر نەتوانێت بیدزێت بەزۆر لێیان ناسەنێت؟
لەو باوەڕەدام ئەوە دەکات.
ئەگەر دایک و باوکی ئامادەبوون شەڕی لەگەڵدا بکەن کوڕەکە زۆردارانە بەرانبەریان ڕاناوەستێت؟
من لێرەدا زۆر گەشبین نیم.
ئەدیمەنتۆس، تۆ لەو باوەڕەدایت کوڕەکە دایکی بۆ کچێکی هاوڕێ بگۆڕێتەوە، کە تازە ناسیویەتی؟ یان بۆ کوڕێکی جوان باوکی خۆی لەناونابات؟ یان باوک و دایکی ناکات بە کۆیلەی ئەوان؟
بەڵێ، دڵنیام ئەوە دەکات.
بەڕاستی سەیرە، کوڕێکی زۆردارت هەبێت!
بێگومان.
چ ڕوودەدات ئەگەر پارەو موڵکی دایک و باوکیشی خەرج کرد؟
بەو هەموو حەز و ئارەزووانەوە لەو باوەڕەدا نیت ماڵی کەسێکی دیکە تالان بکات، یان بە شەو لە تاریکیدا چاکەتی کەسێک بدزێت؟ کەلوپەلی نێو پەرستگا تالان بکات؟ ئایا هەموو ئەو بەها ڕەوشتیانەی لە منداڵییەوە فێری بووە فریایان نادات و نابێت بە ژێردەستەی ئارەزووی بۆ سێکس؟ ئێستا ئەو ئارەزووانەی پێشووی، کە دەخەوتن و جڵەویان دەگیرا تیایدا بەرەڵا بوون و ناخەون. ئەویش شوێنیان دەکەوێت و ئامادەیە تاوانیان بۆ بکات. ئارەزووی سێکسی لە دەروونیدا دەبێت بە زۆردارێکی بەرەڵا و بێ یاسا. هانی دەدات هەموو کارێک لەپێناویدا بکات. ئایا زۆردار بەم شێوەیە ناژی؟
بێگومان، بەم شێوەیە دەژی.
ئەگەر، چەند کەسێکی وا لە شاریکدا بن ئەوانی دیکەش ژیانێکی مامناوەندی ببەنەسەر لە کاتی جەنگهەڵگیرساندا دەبنە چەکهەڵگر و کاسەلێسی زۆردارەکە. دەڕۆن بۆ ئەو شوێنەی جەنگی تێدایە. لە کاتی ئاشتیشدا لەنێو شارەکەدا دەمێننەوە و خراپە دەکەن.
ئەو کارە خراپانە چین ئەوان دەیکەن؟

دزی دەکەن، ماڵ دەبڕن، جانتا دەفڕێنن، جل دەدزن، پەلاماری پەرستگاکان دەدەن و کەسانی دیکە بە کۆیلە دەکەن و دەیانفرۆشن.

ئەگەر گوتاربێژی چاک بن دەبن بە گەواهی درۆکەر و بەرتیلیش وەردەگرن.
ئەم کارە خراپانە بچووکن ئەگەر ژمارەی ئەم جۆرە کەسانە زۆر نەبێت.
بەڵێ، بچووکی شتێک لە بەراوردکردندا لەگەڵ شتێکی گەورەدا دەردەکەوێت. ئەگەر زۆردارێک بیەوێت ژیانی دانیشتووانی شارێک تاڵ بکات ئەم خراپە بچووکانە خێرا بەکاردەهێنێت. زۆرکردنی ژمارەی ئەم جۆرە کەسانەش لە بەرژەوەندیی زۆردارەکەدایە، کە فەرمانڕەوایی شارەکە دەکات. فەرمانڕەواکەش لە هەموو ئەو کەسانە زیاتر زۆردارە.
بەڵێ، ئەو زۆردارترین کەسە، لەنێویاندا.
ئەمە لەو حاڵەتەدا ڕوودەدات ئەگەر دانیشتووانی شارەکە بە ویستی خۆیان بەو فەرمانڕەواییکردنە ڕازی بوون.
بەپێچەوانەشەوە، زۆردارەکە، وەکو چۆن لە پێشتر باوک و دایکی خۆی تالان کرد، دەکەوێتە تالانکردنی وڵاتەکەی، یان کریتیەکان دەڵێن، وڵاتی دایک.
وایە.
لە ژیانی تایبەتیدا مرۆڤێکی زۆردار حەز لەو کاسانە دەکات، کە ستایشی دەکەن. ئایا وانیە؟ یان کە شتێکی پێویست دەبێت، بە زمانێکی خۆش و شیرین لە خەڵکی ناسەنێت؟ کاتێک ئەو شتەشی دەست دەکەوێت ئاوڕ لە کەس ناداتەوە؟
وایە.
زۆردار نابێت بە هاوڕێی کەس. هەمیشە خۆی بە سەرۆک دادەنێت و ئەوانەی بەرامبەریشی بە ژێردەستە. ئەو نازانێت تام و چێژی هاوڕێیەتی، یان ڕاستی و سەربەستی چیە.
ڕاستە.
دروستە زۆردار بە کەسێک دابنرێت، کە جێگەی بڕواپێکردن نەبێت؟
هەڵبەتە.
ئایا بەگوێرەی پێناسەکەمان بۆ دادوەری زۆردار نابێت بە نادادوەر؟

دروسته.

زۆردار دەیەوێت فەرمانڕەوایی بکات. چەند بەو دەسەڵاتەوە بمێنێتەوە ئەوەندەش ژیانی (شارەکە) دەشێوێنێت.

گلاوکۆن گوتی، ڕاستە.

ئایا مرۆڤێکی زۆردار لە شارێک ناچێت زۆردار تیایدا فەرمانڕەوا بێت، مرۆڤێکی دیموکراتیش لە دیموکراسی؟

هەڵبەتە.

ئایا پەیوەندیی نێوان بەختەوەری و چاکەکانیش بەهەمان شێوە نییە؟

وایە.

چۆن بەراوردی نێوان دوو شار بکەین، کە یەکەمیان بەدەست زۆردارێکەوەیە و دووەمیان پاشاگەردانیە؟

دوو شاری جیاوازن: یەکێکیان خراپ و ئەوی دیکە چاکە.

من ناڵێم کامیان خراپە یان چاکە، چونکە ئەوە شتێکی دیار و ئاشکرایە، بەڵام دەتوانیت یەک جۆر حوکم بەسەر بەختەوەری، یان خراپەی هەردووکیاندا بدەیت؟ لێرەدا پێویستە بەشێوەیەکی گشتی بڕوانینە ژیانی هەموو شارەکە و (هەموو لایەنەکانی ئەم ڕژێمە) و تەنیا تەماشای ژیانی زۆردارەکە و چەند کەسێکی دەوروبەری نەکەین.

من لەگەڵتام، چونکە ئەو شارەی زۆردار فەرمانڕەوایەتی خراپترین و پاشاگەردانیش چاکترینە.

دەتوانم بەهەمان شێوە باسی مرۆڤە تاکەکان بکەم. بۆ تێگەیشتن لە کەسایەتیان دەبێت بە ناخیاندا شۆڕ بینەوە و هەموو لایەنەکانی ببینین و لە دەرەوە حوکمی بەسەردا نەدەین. هەروەها ئەوەی بەم کارەش هەڵدەستێت توێژەرە. ئەو دەتوانێت حوکم بدات، چونکە لەگەڵ ئەو مرۆڤە زۆردارەدا لە نزیکەوە ژیاوە و دەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسوکاری دەکات، یان لە کاتی مەترسیدا چۆن هەڵسوکەوت دەکات؟

ئایا پێویست ناکات پرسیار لەم کەسە سەبارەت بە ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤە زۆردارەکەوە بکرێت؟

ڕاستە، دەبێت پرسیاری لێ بکرێت.

دەتەوێت ئێمە خۆمان بەو (توێژەر)ە دابنێین، کە لەگەڵ زۆردارەکەدا ژیاوە و لە نزیکەوە ناسیویێتی و دەتوانێت حوکم بدات؟
بەدڵنیاییەوە، من دەتوانم.
کەوابوو، تەماشای ئەم لایەنەم بۆ بکە: لەبیرت نەچێت، کە ئەو مرۆڤە لە ڕژێمی شارەکە دەچێت. تۆش باسی حاڵەتەکانیم بۆ بکە.
چ حاڵەتێک؟ یەکەم، لەبارەی شارێکەوە، کە زۆرداری تێدا سەقامگیرە، ئایا شارێکە ئازاد، یان داگیرکراو؟
داگیرکراو.
بەڵام خاوەن کۆیلەکان، کە تیایدا دەژین سەربەستن.
بەڵێ، چەند کەسێک لەو شارەدا بە سەربەست دادەنێم، بەڵام شارەکە بەگشتی داگیرکراوە. زۆرینەی دانیشتووانی چەوساونەتەوە و بە کۆیلە کراون.
ئەگەر مرۆڤ و ڕژێمەکە لە یەکدی بچن، ئایا پێویست ناکات یەک جۆر بونیادیشیان هەبێت؟ ئایا دەروونی کۆیلە و چەوساندنەوەی تێدا نابێت و لایەنە چاکەکانی داگیر نەکراوە؟
پێویستە.
سەبارەت بە بوونی ئەم دەروونە چ دەڵێیت؟ سەربەستە یان کۆیلە؟
هەڵبەتە کۆیلەیە.
ئایا شارێکی ژێردەستی زۆردار دەتوانێت بە خواستی خۆی گەشە بکات؟
نەخێر.
کەوابوو، دەروونی مرۆڤێکی زۆردار، مەبەستم دەروونێتی بەگشتی، ناتوانێت بە ویستی خۆی ژیان بەرێتە سەر. لەژێر زەبری چزوی نێرەهەنگەکەدا هەڵسوکەوت دەکات.
دروستە.
ئایا شارێک لەژێر دەستی زۆردارێکدا بێت هەژارە یان دەوڵەمەند؟
هەژارە.
کەوابوو، دەروونی زۆردارەکەش هەژارە.

وایە.

ئایا گریان و هاوار و خەمی زۆرتر لە شارێکی دیکەدا دەدۆزرێتەوە.

نەخێر.

ئایا ئەمانە لە دەروونی زۆرداردا نین، کە ئارەزووی بۆ سێکس شێتی کردووە؟

هەن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەراوردکردنانەدا دەردەکەوێت ئەم جۆرە شارە خراپترین بێت.

ئایا ئەمە دروستە؟

دروستە. ئەی لەبارەی زۆردارەکەوە بۆچوونت چۆنە؟

ئەویش خراپترین مرۆڤە.

لێرەدا تۆ بەهەڵەدا چوویت.

چۆن؟

لەو باوەڕەدا نیم ئەم کەسە توانیبێتی بەوپەڕی خراپە بگات.

کێ هەیە خراپتر بێت؟

دڵنیام، لەگەڵ مندا هاوڕا دەبیت، کە ئەمەی باسی دەکەم خراپترە.

ئەوە چیە؟

مرۆڤ هەیە بە سروشت (لە ناوەوە) زۆردارە و کەسێکی دیکەش بارودۆخێکی تایبەتی ڕێگەی دەدات دەسەڵات بگرێتە دەست و ببێت بە زۆردار.

ڕاستە.

بەڵێ، لێرەدا دەبێت لە چۆنیەتی ژیانی ئەم دوو کەسە بکۆڵینەوە، بزانین ژیانی چاک و خراپیش چیە؟

ڕاستە.

من ئەم نموونانە دەهێنمەوە. تۆش پێم بڵێ ئەوەی باسی دەکەم واتابەخشە یان نا.

نموونەکانت چین؟

با بڕوانینە ژیانی مرۆڤە دەوڵەمەندەکانی شارەکەمان، ئەوانەی چەند کۆیلەیەکیان هەیە، چونکە ئەوان وەکو زۆردار حوکم بەسەر

کۆیلەکاندا دەکەن.

ڕاستە.

تۆ دەزانیت ئەو دەوڵەمەندانە لە کۆیلەکان ناترسن.

لە چی بترسن؟

لە هیچ. تۆ دەزانی بۆچی؟

بەڵێ، چونکە هەموو شارەکە ئامادەیە بەرگری لە هەموو هاوڵاتیەک بکات.

تۆ ڕاست دەڵێیت. چۆنە ئەگەر خوا یەکێک لەو دەوڵەمەندانەی بە ژن و منداڵ و کۆیلەکانیەوە فڕێدایە ناوەڕاستی بیابانێکەوە و کەس نەتوانێت فریای بکەوێت چەند دەترسێت لەوەی کۆیلەکانی ژن و منداڵەکانی و خۆشی بکوژن؟

زۆر دەترسێت.

ئایا بەڵێنی درۆ بە کۆیلەکانی نادات؟ پێیان ناڵێت، کە ئازادیان دەکات؟

ئایا خۆشی وەکو کۆیلەی لێنایەت؟

دەیکوژن ئەگەر ئەوە نەکات.

چۆنە ئەگەر خوا لە دەوروبەری ئەم دەوڵەمەندە کەسانی دیکە دابنێت و ببن بە دراوسێی، ڕازی نەبن بەوەی کەسێکی دیکە خۆی بە سەروەر و خاوەن دەسەڵات دابنێت؟

لەو باوەڕەدام تووشی گرفت و ناخۆشی دەبێت.

ئایا ئەمە زیندان نییە، کە زۆرداری تێدا دەژی؟ زیندانێک پڕە لە ئارەزووی سێکسی و ترس؟ هەرچەندە ئارەزووی گەشتکردنی هەیە، بەڵام ناتوانێت، وەکو دانیشتووانی شارەکە بگەڕێت، بۆ ئەو شوێنانە بڕوات کەسانی دیکە سەربەستانە بۆی دەچن. بەپێچەوانەوە، ئەو وەکو ژن ناتوانێت لە ماڵەوە دەرچێت و حەسوودی بەوانەش دەبات سەربەستانە گەشت و گوزار دەکەن.

ڕاستە.

بۆچی ئەم خراپانە ناکەیت بە پێوەری جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە زۆردارە؛ ئەو زۆردارەی تۆ بە خراپترینت دانا و ئەوەی لەژێر بارودۆخێکی تایبەتیدا بووە بە زۆردار؟

سوکرات، ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ڕاستە.
ئایا ئەم بارودۆخانەی زۆرداری تێدا دەژی خراپ نین؟ ئایا زۆرداری خاوەن دەسەڵات ژیانێکی ناخۆشتر لەوەی تۆ باست کرد ناگوزەرێنێت؟
بەدڵنیاییەوە.
لەڕاستیدا زۆردار کۆیلەیە و زۆری لێ دەکرێت خراپترین کار بکات و لەگەڵ خراپترین مرۆڤدا بژی. لە ژیاندا ئارەزووەکانی خۆی تێر ناکات. ئەگەر بەگشتی لە دەروونی بکۆڵینەوە، بۆت دەردەکەوێت کە هەژارە. ئەگەر شێوەی ژیانی ئەو لە شێوەی ئەو شارە بچێت، کە فەرمانڕەوایی تێدا دەکات، ئەوا پڕە لە ترس و ئازار. وانیە؟ هەڵبەتە وایە.
هەروەها، وەکو لە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، زۆردار حەسوودە، بڕوای پێ ناکرێت، نادادوەرەو کەسێکی بێ بڕوایە.
هەموو کارێکی خراپ دەکات. لەبەر ئەمانە بەختەوەر نییە. کەسانی دەوروبەریشی لەگەڵ خۆیدا نابەختەوەر دەکات.
لەو باوەڕەدام هەموو کەسێک لەگەڵ بۆچوونەکەتدایە.
کەوابوو، وەکو دادوەرێکی دادگا بڕیارەکەتم بدەرێ و پێم بڵێ، کێ لەنێو ئەم پێنج فەرمانڕەوایانەدا؛ پاشا، تیمۆکرات، ئۆلیگارک، دیموکرات و زۆردار بەختەوەرترینە؟
ئەمە بڕیارێکی ئاسانە. بەگوێرەی چاکە و خراپەیان دەتوانم (بۆ ئەم مەبەستە) ڕیزیان بکەم.
پێویست دەکات کەسێک دابنێین ئەو مـژدەیەمان بداتێ، یان من ڕایگەیەنم کوڕەکەی ئەریستون بڕیارەکەی داوە و بەختەوەرترینیان پاشایە، کە خۆڕاگرە و دەتوانێت فەرمانڕەوایی (ئارەزووەکانی بکات)؟ نابەختەوەرترین و خراپترین فەرمانڕەواش زۆردارە، کە بەرانبەر خۆی و شارەکەی زۆردارانە دەجووڵێتەوە؟58
ڕازیم، دەتوانیت ئەمە ڕاگەیەنیت.
هەروەها ڕازیت بەوەی بڵێم، کە ئەم ڕاستیە شاراوەیە و کەس نەیزانیوە.
بەڵێ.

باشە ئەمە یەکێکە لە بەڵگەکانمان. بەڵگەی دووەمیشمان هەیە. چیە؟

لەوێدایە، کە دەروونی مرۆڤ سێ بەشی هەیە. شاریش لەسەر ئەمە بەسەر (سێ چیندا) دابەش دەکرێت.

بەڵگەی دووەمت چیە؟

بە دیدی من سێ جۆر چێژ هەن، کە پەیوەندییان بەو سێ بەشەی دەروونەوە هەیە. ئەمەش بەسەر ئارەزووەکان و شێوەی ڕژێمەکانیشدا دەسەپێنرێت.

مەبەستت چیە؟

یەکەم، دەڵێین، ئەو بەشەیە توانای فێربوونی تێدایە. دووەمیش، ئەو بەشەی دەبێتە سەرچاوەی توڕەبوون. بەشی سێیەم، ناوێکی تایبەتی نییە، چونکە لایەنی زۆری هەیە، بەڵام دەتوانین ناوی گەورەترین و بەهێزترین لایەنی بۆ دابنێین. لەبەرئەوە بە بەشی ئارەزوو ناوزەدی دەکەین. ئارەزوو، وەکو ئارەزووکردن بۆ خواردن و خواردنەوە و سێکس زۆر بەهێز و چڕە.

هەروەها دەتوانین ناوی ئارەزووی پارەپەرستنیشی لێ بنێین، کە بەئاسانی لەگەڵ پارەپەیداکردندا دادەمرکێتەوە.

ڕاستە.

ئەگەر چێژ و خۆشەویستی بۆ قازانج دابنێین تێگەیشتن لە کێشەکە ئاسانتر دەبێت. ئایا پارەپەرستنیش بۆ قازانج نییە؟

وادیارە.

لەبارەی ئەو بەشەوە چ دەڵێیت، کە سەرچاوەی خۆڕاگرتن و سەرکەوتنە؟

بێگومان وایە.

ئایا ئەم بەشە حەزی لە سەرکەوتن و ڕێزلێنان نییە؟

دروستە.

ئایا ئەو بەشەی بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت حەزی لە پارە و ناوداری نییە؟ نابێت بە سەرچاەی فێربوون؟ بەشێکی فەلسەفیانە نییە؟

هەڵبەتە.

ئایا ئەم بەشەی دەروون لە هەندێک کەسدا دەسەڵاتدار نییە؟

وایە.
ئایا دانانی سێ جۆر مرۆڤ؛ فەیلەسووفەکان، حەزکەری سەرکەوتن و حەزکەری قازانج بۆ ئەمە ناگەڕێتەوە. ڕاستە ئەو هۆیەی هەیە.
هەروەها سێ جۆری چێژیش؟
بەدڵنیاییەوە.
ئەگەر پرسیار لەم سێ کەسە بکەیت، ژیانی کێ خۆشترینە؟ هەر یەکێک لەوان ژیانی خۆی بە خۆشترین دانانێت؟
پارەپەرستەکە ناڵێت، کە چێژ و خۆشی پارە کۆکردنەوە لە ڕێزلێنان و فێربوون چاکترە؟
بەڵێ، ئەو وەڵامە دەداتەوە.
ئەو کەسەی حەزی لە ڕێزلێنانە چ وەڵامێکی هەیە؟ لەو باوەڕەدا نییە چێژوەرگرتن لە ڕێزلێنان لەوانی دیکە خۆشترە؟
دروستە.
ئەی فەیلەسووف؟ چێژوەرگرتن لە فێربوون لەسەروو هەموو شتێکەوە دانانێت؟
وایە.
کەوابوو، مشتومڕەکە لەنێوان ئەم سێ جۆرە مرۆڤەدا لەسەر ئەوە نییە کێ چاکتر دەژی و چ جۆرە ژیانێک شەرمەزارییە.
ئەوان باسی چێژوەرگرتن و کەمکردنەوەی ئازار دەکەن. چۆن بزانین کێ لەم سێ جۆرە لە ڕاستیەوە نزیکە؟
بۆچی ئەو پرسیارە لە من دەکەیت؟
بەم شێوەیە بڕوانە کێشەکە: چۆن حوکم بەسەر شتەکاندا بدەین؟ ئایا (حوکمدانەکەمان) بە ئەزموون، هۆش یان بەڵگەکانەوە بەستراوە؟
ئایا هیچ پێوەرێکی دیکەمان بۆ حوکمدان هەیە؟
نییە.
کەوابوو، حەزدەکەم پێم بڵێیت کێ لەو سێ کەسە لەوانی دیکە زۆرتر ئەزموونی لەگەڵ چێژوەرگرتندا هەیە؟ ئایا پارەپەرستەکە ڕاستی دەناسێت، یان بۆ ناسینی بەئەزموونی چێژوەرگرتن لە فەیلەسووفەکە زۆرتر دەڕوات؟

جیاوازییەکی گەورە لەنێوانیاندا هەیە. فەیلەسووف بەگوێرەی پێویستیەکانی لە منداڵییەوە تامی چێژەکانی دیکە دەکات، بەڵام پارەپەرستەکە فێربوون بە پێویست نازانێت.

بەدڵنیاییەوە.

لەبارەی حەزکەر لە ڕێزلێنانەوە چ دەڵێیت؟ ئایا ئەزموونی لە فێربووندا لە ئەزموونی فەیلەسووفەکە لە ڕێزوەرگرتن زۆرترە؟

نەخێر. هەموویان ئەگەر بە ئامانجیان بگەن ڕێزیان لێ دەنرێت. زۆر کەس ڕێز بۆ دەوڵەمەند، کەسێکی ئازا و فەیلەسووفیش دادەنێ، بەڵام تەنیا فەیلەسووف تامی چێژوەرگرتن لە فێربوون دەکات.

بەگوێرەی ئەزموون فەیلەسووف باشترین دادوەرە.

وایە.

ئەزموونەکەش وابەستە بە توانای هۆشەکی دەروونیەوە.

هەڵبەتە.

لەسەروو ئەمەوە، ئامێری پێوانەکەمان ئەزموونی فەیلەسووفەکەیە نەک دەوڵەمەند، یان ئەوەی حەزی لە ڕێزلێنانە.

چ ئامێرێک؟

بەڵگەکان. ئایا باسی ئەوەمان نەکرد، کە پێوەرەکەمان لەسەر بەڵگەکانیش ڕادەوەستێت؟

وابوو.

بەڵگەش ئامێری فەیلەسووفە.

وایە.

ئێستا، ئەگەر سامان و قازانج پێوەری حوکمدانەکە بن ئەوەی ڕەخنەی لێ دەگیرێت، یان ستایشی بۆ دەکرێت پارەپەرستەکەیە.

ڕاستە.

ئەگەر ڕێز، سەرکەوتن و ئازایەتی پێوەر بن، ئەوەی حەزی لە ڕێزلێنانە ڕەخنەی لێ دەگیرێت یان ستایشی بۆ دەکرێت.

ڕاستە.

بەڵام مادامەکی ئەزموون، هۆش و بەڵگە پێوەرن، ئەوان......

ستایش بۆ فەیلەسووف دەکرێت.

کەوابوو، لەو سێ جۆرە چێژوەرگرتنە خۆشترینیان فێربوونە. ئەو

مرۆڤەی هۆش لە دەروونیدا فەرمانڕەوایە، خۆشترین ژیانی هەیە.

بێگومان دەبێت وابێت. مرۆڤێکی زانا، کە باسی خۆی دەکات جۆرە هێز و دەسەڵاتێکی تێدا دەبینێت.

دوای ئەمە، چ خۆشی و جۆری ژیانێک بە دووەم دادەنێیت؟

دڵنیام سەربازەکە یان ئەوەی حەز لە ڕێزلێنان دەکات بە دووەم دادەنرێت، چونکە لە خۆیەوە زۆرتر نزیکە. چێژ و جۆری ژیانی دەوڵەمەندەکە سێیەمە.

دڵنیام وایە.

ئەمانە دوو بەڵگەن لە ڕێگەیانەوە دادوەرێک نادادوەریش دەبەزێنێت. سێیەمیان لە شێوەی ئۆڵەمپیکدا بۆ زیۆسی ئۆڵەمپیکی (خواوەندی) ڕزگارکەر دانراوە. چێژەکان بێجگە لەوانەی مرۆڤە زاناکە تامیان دەکات نە بەتەواوی ڕاستن و نە پاک، بەڵکو وەکو سێبەرن. ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت، ئەوا بەتەواوی دەیانخەینە ئەولاوە.

دروستە، بەڵام بەتەواوی لە مەبەستت تێناگەم.

ئەگەر ئەم پرسیارانەت لێبکەم، تۆش وەڵامیان بدەیتەوە لە مەبەستم تێدەگەیت.

باشە، پرسیارەکانم لێ بکە.

ئایا ئازار دژوەستاوی خۆشی نییە؟

وایە.

ئایا ئەو هێمنیەی بەسەر دەروونـدا دێت حاڵەتێک نییە لەنێوان هەردووکیاندا؟

وایە.

دەزانی مرۆڤێک، کە نەخۆش دەکەوێت چ دەڵێت؟

نازانم، دەتەوێ چ بڵێت؟

هیچ شتێک لە لەشساخی خۆشتر نییە. ئەو کەسە تاکو نەخۆش نەکەوێت هەست بەوە ناکات.

ڕاستە، ئێستا دەزانم.

ئایا ئەوانەی لە ئازاردا دەژین ناڵێن، هیچ شتێک لە ئازارشکاندن خۆشتر نییە؟

وایە، ئەوەم بیستوە.

نموونەی زۆرتریش هەیە، کە لەو باوەڕەدام ئەو مرۆڤانەی لە ئازار و ناخۆشیدان بیر لە چێژوەرگرتن و خۆشی ناکەنەوە، تەنیا بیر لەوە دەکەنەوە چۆن ئازارەکەیان بشکێنن، یان لەو خەمە ڕزگاریان بێت.

دروستە، بەوە ڕازی دەبن، دەروونیان هێمن دەبێتەوە.

هەروەها، ئەم هێمنبوونەوەیە دەبێت بە ئازار لەو کەسەدا، کە هەستکردن بە خۆشی تیایدا تەواو دەبێت.

هەڵبەتە.

کەوابوو، هێمنی، کە لەنێوان خۆشی و ناخۆشیدا دامان نا هەندێکجار دەبێت بە هەردووکیان.

وا دەردەکەوێت.

ئێستا، پێم بڵێ، دەگونجێت ئەو شتەی هیچ کامیان نییە ببێت بە هەردووکیان؟

بە دیدی من ئەوە ڕوونادات.

هەروەها، خۆشی یان ناخۆشی جۆرێکە لە جووڵان لەنێو دەرووندا. وانیە؟

بەڵێ، وایە.

ئایا ئەوەی دەبێت بە هەردووکیان ئەو حاڵەتە هێمنییە نەبوو، کە دەکەوتە نێوانیانەوە؟

بەڵێ.

کەوابوو، چۆن ڕاستە بڵێین، خۆشی نەبوونی ناخۆشی و ناخۆشی نەبوونی خۆشییە؟

ڕاست نییە.

بەڵام نزیکبوونەوەی هێمنی لە خۆشییەوە هێمنی بە خۆشی نیشان دەدات، لە ناخۆشیشەوە بە ناخۆشی. بەهەرحاڵ، ئەوەش ڕاستی خۆشی و ناخۆشی دەرناخات.

ڕاستە، منیش وا بۆی دەچم.

بڕوانە، ئەو خۆشییانەی لە ناخۆشییەوە دەرناچن دەگەیتە ئەو باوەڕەی، کە خۆشی نەبوونی ناخۆشی نییە یان ناخۆشی لەوێدا سەرهەڵنادات، کە خۆشی نامێنێت.

بۆ کوێ بڕوانم؟ چ جۆرە خۆشییەک بەو شێوەیە پەیدا دەکرێت؟

نموونەی خۆشی، لە بۆنکردندا بە ڕای من دروستە. بۆنێکی خۆش لەگەڵ لەناوچوونی ناخۆشیدا بە هەست ناگات. ناخۆشیش یان ئازار بە نەمانی بۆنەکە سەرهەڵنادات. نموونەی زۆرمان لەم جۆرە لەبەردەستدایە.

بەتەواوی ڕاستە.

کەوابوو، لەگەڵ کەسدا لەسەر ئەو خاڵەی، کە خۆشی نەبوونی ناخۆشی و ناخۆشی نەبوونی خۆشییە ڕێناکەوین.

دروستە، ڕێناکەوین.

لەهەمانکاتدا، هەموو ئەو خۆشییانەی لە ڕێگەی هەستکردنەوە بە دەروون دەگەن، چڕتریش دەبنەوە تاکو ڕادەیەک لە ناخۆشیمان دووردەخەنەوە.

بەڵێ، وایە.

ئایا ئەو خۆشی و ناخۆشییانەی لە داهاتووشدا ڕوودەدەن چاوەڕوان کراون؟ بەم جۆرەن؟

بەڵێ.

دەزانیت چۆنن، یان لە چی دەچن؟

نا، ئەوانە چین؟

لەو باوەڕەدایت لە سروشتدا خوار و ژوور و ناوەڕاست هەبن؟

بەڵێ.

ئایا کەسێک لە خوارەوە بۆ بەشی ناوەڕاست سەرخرێت لەو باوەڕەدا نییە، کە بەرەوژوور جووڵاوە؟ ئەگەر لە ناوەڕاستدا ڕاوەستێت و بڕوانێتە خوارەوە (ژوورتری نەدیبێت) لەو باوەڕەدا نییە، کە لە شوێنێکی بەرزتر دانراوە؟

بێگومان، دەگاتە ئەو باوەڕە.

ئەگەر بیبەینە خوارەوە ناگاتە ئەو باوەڕەی لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ نزم چووە؟ ئایا بۆچوونەکەی ڕاست نییە؟

هەڵبەتە.

ئایا ئەمە لەبەرئەوە نییە، کە ئەو مرۆڤە ئەزموونی ڕاستەقینەی لەبارەی خوارەوەو ژوورو ناوەڕاستدا نییە؟

بەدڵنیاییەوە.

ئەمەش جێگەی سەرسوڕمان نییە. ئەوانەی ئەزموونێکی ڕاستەقینەیان نەبێت بۆچوونەکانیان سەبارەت بەو شتانەی باسی دەکەن کەموکورتی تێدایە. بەهەمان شێوە، کە بە خۆشییەک یان ناخۆشییەک دەگەن وا دەزانن ئەوانە خۆشی و ناخۆشی ڕاستن و بە دوا ئامانج گەیشتوون. ئەوان ئەزموونێکی تەواویان نییە. لەبەرئەمەشە بەفیڕۆ دەچن و خۆشی بە نەبوونی ناخۆشی دادەنێن. ئەمەش لەوە دەچێت کەسێک ڕەنگی سپی نەبینیبێت و ڕەش لەگەڵ ڕەنگی خۆڵەمێشیدا بەراورد بکات.

منیش دەڵێم، ئەمە جێگەی سەرسوڕمان نییە. بەپێچەوانەوە، ئەگەر بەم شێوەیە بیرنەکەنەوە من سەرم دەسوڕمێت.

بەمجۆرەش بیر لە کێشەکە بکەوە: برسێتی و تینوێتی حاڵەتێکی ناپڕی یان بەتاڵی لە لەشدا نییە؟

بەڵێ، وایە.

ئایا نەزانین و بێ هەستی حاڵەتی ناپڕی لە دەروونداا نییە؟

هەڵبەتە.

ئەو کەسەی نان دەخوات یان فێر دەبێت، خۆی تێر ناکات؟

بەدڵنیاییەوە.

ئایا تێربوونێکی ڕاست ئەو کەسە کەمتر یان زۆرتر پڕ دەکات؟

زۆرتر.

چ جۆرە تێربوونێک زۆرتر بوونێکی ڕەوان پڕ دەکات؟ تێربوون بە نانخواردن و خواردنەوە؟ یان بە باوەڕ، تێگەیشتن، زانین و هەموو جۆرەکانی چاکەکردن؟ بەمجۆرە حوکمی بەسەردا بدە: هەر شتێک پەیوەندی بە (بوونێکی) نەمر، ڕاست و نەگۆڕەوە هەبێت لەو بوونە دەچێت. بەپێچەوانەشەوە، دروستە.

وایە، ئەوەی پەیوەندی بە شتێکی نەگۆڕەوە هەیە زۆرتریشە.

ئایا ئەو شتەی، وەکو خۆی دەمێنێتەوە و نەگۆڕە، بەشداری لە بوونی ئەو شتەدا زیاتر لە زانین لەبارەیەوە ناکات؟

وایە.

ڕاستریش نییە؟

وایە.

ئەگەر ڕاستیەکەی کەمتر بێت بوونەکەشی کەمتر نابێت؟

پێویستە وابێت.

ئایا ئەوەش دروست نییە، کە ئەو شتانەی پەیوەندییان بە تێرکردنی لەشەوە هەیە کەمتر ڕاستن لەوانەی پەیوەندییان بە تێرکردنی دەروونیەوە هەیە؟

بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، بوونێک بەگوێرەی پێویستییە سروشتیەکەی تێر بکرێت خۆشی پێدەگات و ئەو شتەی تێریشی دەکات لای خۆشترە. بەپێچەوانەشەوە دروستە.

وایە.

ئەوانەی ئەزموونی هۆشەکییان لەگەڵ چاکەدا نییە، خەریکی بەزم و ڕابواردنن، دوایی خراونەتە خانەی ناوەڕاستەوە، نازانن لەسەروو ئەو خانەیەوە چ هەیە. تەماشای بەرزاییش ناکەن، تاکو بیدۆزنەوەو تامی خۆشی نەگۆڕیش ناکەن. وەکو ئاژەڵ سەریان بۆ خوارەوە شۆڕ دەکەنەوە و کاوێژ دەکەن. بە شاخ و لەقەش دەکەونە ئەوانەی نزیکیان. ڕێگەیان نادەن تامی ئەو خۆشییە بکەن. لەبەرئەوەی ئارەزووەکانیان کاتییە دەکەونە کوشتنی یەکدی. دەروونی ئەم جۆرە کەسانە لەو گۆزەیە دەچێت، کە هەمووی کونە، هەرچیەکی تێبکەیت لە کونەکانەوە دێتە دەرەوە و پڕ نابێت.

سوکرات، تۆ زۆر جوان باسی زۆربەی خەڵکی دەکەیت، کە بەم جۆرە دەژین.

ئایا پێویست ناکات ئەم جۆرە کەسانە خۆشییان لەگەڵ ناخۆشی و ئازاردا تێکەڵ بکرێت؟ تەنیا سێبەری خۆشیی ڕاستەقینە بناسن؟ نزیکبوونەوەی خۆشی و ناخۆشی پەرێشانیان ناکات؟ خۆیان تووشی شێتی و گومڕەیی لە ئارەزووی سێکسیدا ناکەن؟ وەکو ستێشەرەکان دەگێڕنەوە چۆن لەسەر هیلین لە (ترۆی) شەڕ کرا، ئەمانیش تووشی هەمان نەزانین نابن و لەگەڵ یەکدا شەڕ ناکەن؟

ئەی ئەو بەشەی دەروون، کە سەرچاوەی ئازایەتییە؟ بەهەمان شێوە خۆی تێر ناکات؟ ئارەزووی بۆ ڕێزلێنان تووشی حەسوودی

و ئارەزووەکەش بۆ سەرکەوتن فێری زەبرو توندی ناکات؟ ئەمەش هانی نادات بەبێ تێگەیشتن و بیرکردنەوە هەوڵی پەیداکردنی ڕێز و سەرکەوتن بدات؟

ئەمەش لەو بەشەدا ڕوودەدات.

بەدڵنیاییەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەین ئەگەر ئەوانەی پارەپەرستن و حەز لە ڕێزلێنان دەکەن لەژێر چاودێری هۆشیاندا دوای خۆشییەکانیان بکەون زانینیان لەبارەیانەوە هەبێت، خۆشیەکەیان شێوەیەکی ڕاست و بەرز وەردەگرێت. خۆشیەکەیان دەبێت بە سروشتی. خۆشی سروشتی باشترینە.

بەڵێ، بێگومان، خۆشی سروشتی باشترینە.

کاتێک دەروون شوێن بیرکردنەوەی فەلسەفی دەکەوێت، بەشەکانی دیکەشی دادوەرانە ڕەفتار دەکەن. هەر بەشە بە کاری خۆی هەڵدەستێت و تامی بەرزترین خۆشی دەکەن.

وایە.

ئەگەر یەکێک لە لایەنەکانی دەروون لایەنەکەی دیکە داگیر بکات، ئەوا نایەڵێت خۆشییەکی ڕاست بدۆزێتەوە. بەڵێ، وایە.

ئایا ئەو بەشانەی لە فەلسەفە و هۆشەوە دوورن هەوڵ نادەن لایەنەکەی دیکە داگیر بکەن؟ دروستە، ئەو هەوڵە دەدەن.

ئەوەی لە هۆشەوە دوورە لە یاسا و سیستەمەوە دوور نییە؟

بەدڵنیاییەوە، دوورە.

ئایا ئارەزووی سێکسی و بوون بە زۆردار لە هۆشەوە دوور نییە؟

دوورە.

کەوابوو، زۆردار لەو خۆشییەوە دوورە، کە بۆ ئەو دانراوە، پاشایەکیش (بەپێچەوانەوە) لێوەی نزیکە.

پێویستە وابێت.

لێرەدا (بەو باوەڕە دەگەین) کە زۆردار ژیانێکی ناخۆش و پاشا ژیانێکی خۆشی هەبێت.

بەڵێ.

دەزانیت ژیانی زۆردار چەند لە ژیانی پاشا ناخۆشترە؟
تۆ پێم بڵێ.
سێ جۆر خۆشی هەیە: یەکێکیان ڕاست و دووانەکەی دیکە ناڕاست. زۆردار لەوپەڕی خۆشی درۆدا دەژی و لە هۆش و یاساوە دوورە. خۆی کردووە بە کۆیلەی خۆشییە ساختەکان. لەنێو (ڕیزی فەرمانڕەواکاندا) زۆردار لە ئۆلیگارکەوە سێیەمە، دیموکراتیش دەکەوێتە نێوانیانەوە.
بەڵێ.
ئەگەر بۆچوونەکەمان ڕاست بێت، ئایا زۆردار لەگەڵ فۆڕمی خۆشییەکی ساختەدا ناژی، کە سێیەم دانەیەو پاش ڕاستی ئۆلیگارکی و دیموکرات دێت؟
بەڵێ، سێیەمە.
کەوابوو، زۆردار سێ جار زیاتر لە خۆشی ڕاستەوە دوورە.
دروستە.
لەم بۆچوونەوە خۆشی زۆردار ڕواڵەتێکی ڕووتە.
بەتەواوی وایە.
هەروەها، لەو خۆشیەوە جیاوازە، کە پاشایەک هەیەتی.
دروستە.
ئەگەر یەکێک بیەوێت بە ژمێریاری جیاوازییەکەیان بدۆزێتەوە دەتوانێت بڵێت، پاشا حەوت سەد و بیست و نۆ جار زۆرتر بە خۆشی دەژی. زۆرداریش ئەوەندە لە ناخۆشیدایە.
ئەو ژماردنە بۆ جیاوازیی نێوانیان سەیرە.
بەڵام ئەگەر جیاوازییەکەیان بە ڕۆژ و مانگ و ساڵیش بژمێریت ڕاستەقینەیەو لەبارە.
بەڵێ، لەبارە.
ئەگەر ژیانی کەسێکی چاک و دادپەروەر لە ژیانی کەسێکی خراپ و نادادوەر خۆشتر بێت، ئایا چاکە و بەخشندەیی ئەو کەسەش شتێک نییە لە ژماردن نەیەت؟
دەبێت وابێت.
لێرەوە بۆ ئەو خاڵە دەگەڕێینەوە، کە یەکێکمان گوتی، نادادوەری سوود بەو نادادوەرە دەگەیەنێت، کە لەو باوەڕەدایە دادوەرە.

وابوو.

با لێرەدا مشتومڕ لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەین، چونکە لە چۆنیەتی دەسەڵاتی دادوەر و نادادوەر تێگەیشتووین.

چۆن؟

با بە نموونە لەسەر دەروون بدوێین.

چ نموونەیەک؟

نموونەی دەروون، وەکو ئەو زیندەوەرەی لە ئەفسانەی کۆندا باس کراوە. لە چمیرا، شیلا و سێربیرۆس پێکهاتووە، یان زۆر شتی تر هەن، دوو یان زۆرتر سروشتی جیاوازیان تێدایە.

بەڵێ، ئەو جۆرە شتانە باس کراوە.

بیر لەو دێوە بکەوە، کە فرە سەری هەیە و دڕندەیە. بە ئارەزووی خۆی دەیانگۆڕێت.

ئەوە هونەرمەندێکی بلیمەت دەتوانێت وێنەکەی بکێشێت، بەڵام مادامەکی وشـەڕازانـەوە لە ڕەنگ ئاسانترە، گریمان ئەو دڕندەیە هەیە.

بیر لە شێوەی شێر و مرۆڤێکیش بکەوە. وێنەی مرۆڤەکە لە شێرەکە و شێرەکە لە دێوەکە بچووکترە.

ئەوە ئاسانە، دەتوانم پەیکەرەکانیان بۆ دروست بکەم.

ئەنجا، هەرسێکیان پێکەوە بنووسێنە و با پێکەوە گەورە بن.

ئەمەشم کرد.

با لە دەرەوە هەرسێکیان شێوەی مرۆڤەکەیان هەبێت. لە ناوەوە شێر و دێوەکە. ئەوەی تەماشای بکات تەنیا شێوەی مرۆڤەکە ببینێت، دووانەکەی دیکە نەبینێت.

باشە.

ئەگەر بڵێین، نـادادوەری سـوودی بۆ ئـەم مرۆڤە هەیە، ئـەوە لەوێدایە، کە ئەو کەسە بە دادوەری سوود و قازانج بە دێوەکە و شێرەکەی ناوەوەی ناگەیەنێت، تێریان ناکات، بەهێز نابن. دووەمیش، لاوازکردنی لایەنی مرۆڤایەتی ئەو کەسە پەلکێشکردنێتی بەرەو لایەنی دێو و شێرەکە. سێیەم، نایەوێت ئەو سێ لایەنە هاوتەراز بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لەیەکیان بەردەدات، تاکو یەکتر بخۆن .

بەڵێ، ئەوانەی ستایش بۆ نادادوەری دەکەن وادەڵێن.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئەوانەی دەڵێن دادوەری سوودی هەیە مەبەستیان ئەوە نییە؛ کە یەکەم، لایەنی مرۆڤانەی ئەو کەسەی (ئێستا بە ئەندێشە دروستمان کرد) دەسەڵات بەسەر دوو لایەنەکەی دیکەدا دەگرێت؛ دووەم، وەکو چۆن جووتیارێک ئاگاداری ئاژەڵەکانێتی ئەویش پێویستە چاودێری دێوە فرەسەرەکە بکات، سەرەکان ماڵی بکات و ڕێگەیان پێ نەدات ببن بە دڕندە؛ سێیەم، شێرەکەش بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. هەرسێ لایەنەکە پێکەوە هاوتەراز گرێ بدات؟

بەڵێ، ئەوانەی ستایش بۆ دادوەری دەکەن وا دەڵێن.

لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوەی ستایش بۆ دادوەری دەکات ڕاست دەڵێت. ستایشکردن بۆ نادادوەریش ناڕاست و درۆزنیە.

گرنگ نییە لە خۆشی، چاکە یان سوودگەیاندن بدوێین، ستایشکەری دادوەری ڕاستگۆیە. ئەوەی دژی ڕادەوەستێت بەڵگەی بەدەستەوە نییە و خۆشی نازانێت دژی چ ڕاوەستاوە.

بە ڕای منیش ئەو کەسە هیچ نازانێت.

باشە، با هەوڵ بدەین ئەو کەسە ڕازی بکەین. ئەم پرسیارانەی ئاڕاستە بکەین. ئایا ئەمە دەبێت بە بناغەی جیاکردنەوەی چاکە و خراپە؟ چاکە لەوێدایە دێوە دڕندەکە بخەینە ژێر دەسەڵاتی لایەنە مرۆڤانەکەوە و خراپەش بەپێچەوانەوەیە؟

ئایا بەم بۆچوونە ڕازییە یان نا؟

ئەگەر گوێ لە من بگرێت ڕازی دەبێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم گفتوگۆیەدا، ئەو پرسیارەشی لێ دەکەین چۆن مرۆڤێک سوود لە دەستکەوتنی زێڕ و زیو بە کۆیلەکردنی لایەنە مرۆڤانەکەی وەردەگرێت؟ کێ لەو باوەڕەدایە باوکێک منداڵەکانی خۆی، وەکو کۆیلە کە بە کەسێکی دڕندە بفرۆشێت، سوود وەرگرێت؟

ئایا خەڵکی تاوانباری ناکەن بەوەی پیرۆزترین بەشی خۆی بە دڕندەیەکی خوانەناس فرۆشتووە؟ ئەمەش وەکو کارەکەی ئێریفیل نییە، کە ملوانکەکەی بە گیانی مێردەکەی گۆڕییەوە؟59

بێگومان، گلاوکۆن گوتی، ئەوە کارێکی ترسناکە.

ئایا مرۆڤێکی بەرەڵا بەوە تاوانبار ناکرێت، کە ئەو دێوە دڕندەیەی

ناخی زۆر گەورە بووە و دەسەڵاتی زۆری پێدراوە؟
ئاشکرایە وایە.
ئایا ئەوانەی دڵڕەق و ملهوڕن تاوانبار ناکرێن بەوەی دەسەڵاتی زۆریان بە لایەنی شێرەکە داوە؟
وایە.
ئەوانەی دڵیان نەرمە و خەریکی ڕابواردنن، بەوە تاوانبار نەکراون گوێ نادەنە شێرەکە و لەبەرئەوە ترسنۆکن؟
ڕاستە.
ئەوانەی کۆیلەن تاوانبار نەکراون بەوەی سەرچاوەی ئازایەتی دەروونیان لە لاوێتیەوە خستۆتە ژێر دەسەڵاتی دڕندەکە و بۆ تێرکردنی دڕندەکە لە شێرەوە بوون بە مەیمون.
ڕاستە.
بۆچی بە چاوی نزمەوە تەماشای کرێکاری ئیشی دەست دەکرێت؟
ئایا هۆی ئەوە نییە، کە ناتوانێت دەسەڵات بەسەر دێوە دڕندەکەی (دەروونی) بگرێت و خزمەتی دەکات؟
لەوانەیە.
بۆئەوەی ئەم مرۆڤە، وەکو ئەو مرۆڤەی دێوەکەی تێدایە فەرمانڕەوایی بکرێت، دەبێت بچێتە ژێردەستی کەسێکەوە، کە لایەنە پیرۆز و چاکەکە تیایدا بەرقەرا بووە. ئێمە لەوێدا، کە دەڵێین؛ کۆیلە دەبێت فەرمانڕەوایی بکرێت مەبەستمان ئازاردانی کۆیلەکە نییە. هەروەها تراسیماخۆس لەو باوەڕەدا بوو بەم شێوەیە هەموو کەسێک دەبێت فەرمانڕەوایی بکرێت، چونکە پێویستە هۆش دەسەڵاتمەدار بێت.
بەڵێ، تۆ ڕاست دەڵێیت.
ئەمە ئامانجی یاسادانانە. هەروەها، لە فەرمانڕەواییکردنی منداڵەکانمان خواستی ئێمەشە. ئێمە بەبێ دانانی دەستوورێک بۆ ئەوان ڕێگەیان نادەین سەربەست بن. بەهەمان شێوەش لە شاردا وایە. پاش ئەمە سەربەستیەکەیان دەدەینێ.
ئاشکرایە دەبێت وابێت.
کەوابوو، گلاوکۆن چۆن نادادوەریی بەرەڵایی و کاری شەرمەزارانە

سوود و قازانجیان بۆ کەسێک هەیە ئەگەر پارەی زۆر و دەسەڵاتیشیان لێوە پەیدا بێت؟

وایە.

چ سوودێکی هەیە ئەگەر نادادوەرییەکەی هەستی پێ نەکرابێت و لەسەری سزا نەدرابێت؟ ئەوەی هەستی پێ نەکراوە خراپتر دەبێت. ئەوەی هەستی پێ دەکرێت و سزا دەدرێت لایەنە دڕندەکەی هێمن دەبێتەوە و بە مرۆڤ دەکرێت؟ لایەنە چاکەکەی خۆی دەردەخات، بەدوای دادوەری و زانیندا دەگەڕێت. وەکو ئەو لەشە نەخۆشەیە چاک دەبێتەوە و دەبێت بە لەشێکی تەندروست.

بەدڵنیاییەوە.

کەسێکی خاوەن بیر و تێگەیشتن هەموو هەوڵدانێکی بۆ چاککردنەوەی باری دەروونی نییە؟ ڕێز بۆ فێربوون دانانێت؟

دیارە وایە.

دووەم، ئایا ژیانێکی مامناوەندی هەڵنابژێرێت؟ باری دەروونی و لەشی هاوتەراز ناکات؟

بەدڵنیاییەوە ئەوە دەکات ئەگەر بەڕاستی فێری مۆسیقا و هۆنراوە کرابێت.

لە کۆکردنەوەی پارە و سامانیشدا، بەهەمان شێوە، هاوتەرازییەک دروست دەکات. ڕێگە بە خۆی نادات گەمژانە دوای پارە و سامانێکی زۆر بکەوێت.

دروستە.

پەیڕەوی دەستوورەکەی ژیانی دەکات. نایەڵێت زیانی پێ بگات. بە پارەیەکی کەم، یان زۆر دەیپارێزێت و پارەو سامانەکەی لەم پێناوەدا دادەنێت.

پێویستە، ئەو کارە بکات.

بەهەمان شێوە، مامەڵە لەگەڵ ڕێزلێنان دەکات. ئەو کارانە دەکات، کە دەیکەن بە کەسێکی چاکتر. هیچ شتێک ناکات زیان بە دەروونی بگەیەنێت.

ئەگەر ئەوە ئامانجی ئەو مرۆڤە بێت بەشداری کاروباری ڕامیاری ناکات.

نا، بەشداری دەکات، بەتایبەتی لەو شارەدا، کە شێوەی ڕژێمەکەی لەو دەچێت، بەڵام لە وڵاتەکەی خۆیدا تاکو دەنگێکی پیرۆز بانگی نەکات کاری ڕامیاری ناکات.

من تێدەگەم. تۆ مەبەستت ئەوەیە تەنیا لەو شارەدا، کە لە بیری ئێمەدایەو لە هیچ شوێنێکدا هێشتا پەیدا نەبووە بەشداری ڕامیاری دەکات.

منیش گوتم، ئەو شارە لە بەهەشتە. گرنگ نییە لێرە هەبێت یان نا. ئەوەی لە شێوەی ئەو شارەدا دەژی گوێ بە شارێکی دیکە نادات.

منیش لەو باوەڕەدام.



مـن گـوتـم، بـێـگـومـان شـارەكـەمـان گـەلـێـك خـەسڵـەتـی چـاكـی هـەیـە، لـە هـەمـوویـان سـەرنـجڕاكـێشـتـر هـۆنـراوەیـە.
گلاوكۆن وەڵامی دایەوە و گوتی: باسی چ دەكەیت؟
بەو هۆنراوەیە ڕازی نەبووین، كە لاسایی دەكاتەوە. هەروەها پاش دیاریكردنی بەشەكانی دەروون ئاشكرایە، بە بۆچوونی من ئەم جۆرە هۆنراوانە پێویستە ڕەت بكرێنەوە.
مەبەستت چیە؟
من دەڵێم، ئەگەر بیسەر زانیاری لەبارەیانەوە نەبێت، ئەم جۆرە هۆنراوانە بیركردنەوەی دەشێوێنن.
نازانم دەتەوێ چ بڵێیت؟
من دەڵێم هەرچەندە لە منداڵییەوە هۆنراوەكانی هۆمیرۆسم خوێندۆتەوە و ڕێزم بۆی هەیە، چونكە شاعیرێكی تراجیدیای گەورەیە، بەڵام پێویستە زۆرتر ڕاستیمان خۆش بوێت و ڕێزی بۆ دابنێین.
ڕاستە.
گوێ بگرە یان باشترە وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە.
پرسیارەكەت چیە؟
دەتوانیت پێم بڵێیت لاساییكردنەوە بەگشتی چیە؟ چونكە من نازانم.
بۆچی نا؟ هەندێكجار ئەوانەی چاویان كزە لە پێش ئەوانەدا شت دەبینن، كە چاویان چاك دەبینێت.
ئەوە ڕاستە، بەڵام حەز ناكەم لەبەردەم تۆدا باسی ئەو شتە بكەم. داوا لە تۆ دەكەم تەماشای بكەیت.
دەتەوێت لەم لێكۆڵینەوەیەشدا شوێن میتدۆدەكەمان بكەوین؟ وەكو دەزانیت هەر شتە ناوێكی لێ دەنێیت، یان پێویست ناكات، تۆ لە مەبەستم تێدەگەیت؟

من تێدەگەم.
کەوابوو، با لە یەکێک لەو شتانەی دەوروبەرمانەوە دەستپێبکەین. بۆ نموونە جێگەی خەوتن و مێز لەبەردەستتدان.
بەڵێ.
لێرەدا دوو فۆڕمی ئەم کەلوپەلانە هەن: یەکێکیان بۆ جێگەی خەوتن و دووەمیان بۆ مێز.
وایە.
ئایا ئاسایی نییە بڵێین (دارتاشەکە) بەدوای فۆڕمی جێگەی خەوتن و مێزدا (پێش دروستکردنیان) بگەڕێت؟ ئێمە دەزانین هیچ پیشەسازێک فۆرمی ئەو شتە دروست ناکات.
دروستە.
ئەو پیشەسازە چیە؟
کام؟ ئەوەی هەموو شتەکان و پیشەکانی دیکەش دەهێنێتە کایەوە.
ئەو کەسە سەیرە و زیرەکیشە، کە تۆ باسی دەکەیت.
سەبرکە، ئێستا هۆی زۆرترت دەدەمێ، تاکو ئەم پیشەسازە بە زیرەک و سەیر دابنێیت. ئەو دەتوانێت هەموو کەلوپەلەکان و ڕووەک و زیندەوەرەکانی سەرزەوی، زەوی، خۆی و خواکان، ئاسمان و جیهانی بەرزەخیش دروست بکات.
بەڕاستی زیرەکە.
لەوانەیە باوەڕم پێ نەکەیت. تۆ پێم بڵێ، لەو باوەڕەدای پیشەسازێک نەبێت ئەم هەموو شتانە دروست بکات؟ یان لەلایەکەوە ئەو دەتوانێت و لەلایەکی دیکەوە ناتوانێت؟ ئایا ڕێگەیەک نادۆزیتەوە بۆ خۆت، کە بتوانیت هەموو شتەکان دروست بکەیت؟
ئەوە چ ڕێگەیەکە؟
دۆزینەوەی کارێکی سەخت نییە: تۆ دەتوانیت خێرا و لە زۆر شوێندا بیکەیت ئەگەر ئاوێنەیەک لەگەڵ خۆتدا هەڵگریت، لەنێو ئاوێنەکەدا خۆر و تەنەکانی ئاسمان و زەوی، زیندەوەرەکان و ڕووەک، کەلوپەلەکانی بەردەست و خۆت دەبینیت.
بەڵێ، ئەو شتانە لەنێو ئاوێنەکەدا دەبینم، بەڵام شتە ڕاستەکان

نین.

چاک بۆی چوویت! تۆ مەبەستی سەرەکیی گفتوگۆکەمانت دەرخست. لەو باوەڕەدام هونەرمەندی شێوەکاری دێتە ڕیزی ئەم پیشەسازەوە (کە ئاوێنەکەی بەدەستەوەیە). وانیە؟

هەڵبەتە.

لەو باوەڕەدام دەڵێیت، کە ئەو شتانەی هونەرمەند دایاندەهێنێت ڕاست نین، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئەو دەتوانێت (لە بەرهەمێکی هونەرییدا) جێگەی نووستن دروست بکات.

وایە، ئەوەی دروستی دەکات دیاردەکەیە.

ئەی دارتاشەکە؟ تۆ پێشتر نەگەیشتیتە ئەو خاڵەی، کە ناتوانێت فۆڕم دروست بکات، کە بوونی جێگەی خەوتنەکە مسۆگەر دەکات؟ ئایا ئەوەی دروستی دەکات تەنیا جێگەیەکی خەوتن نییە؟

بەڵێ، من ئەوەم گوت.

ئێستا ئەگەر ئەو بوونی جێگەی خەوتنەکە دروست نەکات ئەوەی دەیهێنێتە کایەوە شتە ڕاستەکە نییە، بەڵکو دیاردەکەیەتی.

ئەگەر کەسێک بڵێت ئەوەی دارتاشەکە دروستی دەکات شتە ڕاستەکەیە درۆ ناکات؟

بەلای کەمەوە، ئەگەر شوێن ئەم بۆچوونە بکەون بە درۆزنی دادەنێن.

با لەم نموونەیەوە، بزانین لاساییکەرەوە کێیە؟

باشە.

ئێمە (لەم نموونەیەدا) سێ جۆر جێگەی خەوتنمان هەیە:

یەکەمیان بوونی جێگەی خەوتنە، کە خوا دروستی کردووە. لەو باوەڕەدای کەسێکی دیکە دروستی کردبێت؟

نەخێر.

دووەم، دارتاشەکە دروستی دەکات.

وایە.

سێیەم، هونەرمەندەکە (لە تابلۆیەکدا) دروستی دەکات. وانیە؟

بەڵێ. وایە.

هەر یەکێک لەم سیانە، خوا و دارتاش و هونەرمەندەکە، جۆرێک

جێگەی خەوتنمان بۆ دروست دەکات.
بەڵێ، سێ جۆر دروست دەکەن.
خوا، لەبەرئەوەی خۆی نەیویست، یان بە پێویستی زانی تەنیا یەک بوونی جێگەی خەوتنی لە سروشتدا دروست کردوە،
ئەمەش فۆڕمی جێگەی خەوتنە. لە فۆڕمێک زۆرترمان نییە، خوا دروستی کردبێت و هەرگیز نابێت.
بۆچی ئەمە وایە؟
چونکە ئەگەر دوو جێگەی خەوتن دروست بکات، فۆڕمی سێیەمیش سەرهەڵدەدات، کە لە هەردوو جێگاکەی پێشووتردا هەیە، لەم حاڵەتەدا جێگەی سێیەم نەک دووانەکە دەبێت بە فۆڕمی جێگەی خەوتن.
ڕاستە.
خوا، بە ڕای من، ئەمەی دەزانی، دەیویست ببێت بە دروستکەری فۆڕمی جێگەی خەوتن، نەک جێگەی خەوتن.
هەڵبەتە.
حەزدەکەی ناوی بنێین داهێنەری سروشتی؟
بە ڕای من، ئەو ناوە بۆ خوا دەگونجێت، چونکە بە سروشت ئافەریدکەری هەموو شتەکانە.
ئەی دارتاشەکە؟ دروستکەری جێگەی خەوتن نییە؟
دروستکەرە.
ئەی هونەرمەندەکەش، وەکو ئەم دروستکەرانە شتەکان دروست ناکات؟
نەخێر.
ئەی چی لە جێگەی خەوتنەکە دەکات؟
لاسایی دەکاتەوە. ئەو لاسایی دروستکەرەکان دەکاتەوە. بە ڕای من، ئەم ناونانە لە هونەرمەند لەبارە.
باشە، تۆ ئەو کەسە بە لاساییکەرەوە دانانێیت، کە بەرهەمەکەی دەکەوێتە ڕیزی سێیەمی شتە دروستکراوەکانەوە؟
بەدڵنیاییەوە.
ئایا ئەمە بۆ (نووسەرێکی) تراجیدیش دروست نییە؟
بەدڵنیاییەوە، دەکەوێتە ڕیزی سێیەمەوە و لاساییکەرە؟

وا دەردەکەوێت.

ئێمە لاساییکەرەکانمان دۆزییەوە. ئێستا لەبارەی هونەرمەندی شێوەکارییەوە پێم بڵێ، ئەو لاسایی شتە سروشتیەکان یان کەلوپەلە دروستکراوەکان دەکاتەوە؟

لاسایی کەلوپەلە دروستکراوەکان دەکاتەوە.

پێویستە لەوە دڵنیا بیت.

چ مەبەستێکت هەیە؟ من تێناگەم.

مەبەستم ئەمەیە: کاتێک لەپێشەوە، لە پشتەوە یان لە لاکانەوە تەماشای جێگەی خەوتن دەکەیت هەرجارە جیاواز دەرناکەوێت؟

ئایا ئەمە بۆ هەموو شتێکی دیکە نابێت؟

بەڵێ، وایە جیاواز دەردەکەوێت، بەڵام خۆی هەر یەک شتە.

کەوابوو، بڕوانە ئەم نموونەیەش: هونەری شێوەکاری چ دەکات؟ ئایا ئەو شتەمان نیشان دەدات، کە وەکو خۆیەتی و یەک شتە یان ئەو شتەمان بەو شێوەیە پێ دەناسێنێت، کە دەردەکەوێت وابێت؟ ئایا بەرهەمێکی هونەری ڕاستیناسە، یان لاسایی ڕاستی دەکاتەوە؟

دیاردەکان نیشان دەدات.

لاساییکردنەوە لە ڕاستیەوە دوورە. تەنیا لایەنەکان دەردەخەن، کە ئەوانیش وێنەی (شتە ڕاستەکەن) لەبەرئەمەش دەتوانێت زۆر شت بکات. بۆ نموونە هونەرمەندێک تابلۆی پینەچیەک، دارتاشێک یان شتێکی تر دەکات بەبێئەوەی لەبارەی ئەم پیشانەوە زانیاری هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هونەرمەندێکی چاک بێت منداڵان و کەسانی گەمژە لە دوورەوە تابلۆکەی لەسەر دارتاشێک ببینن، وا دەزانن شتێکی ڕاستە.

هەڵبەتە.

هەر کاتێک یەکێک بڵێت گوایە کەسێکی بینیوە، هەموو جۆرە پیشەیەک دەزانێت و زانیارییەکی تەواوی لەبارەی هەموو شتێکەوە هەیە. لەو باوەڕەدام ساویلکەیە و جادووگەرێک هەڵیخەڵەتاندووە. ئەم کەسە بە زاناترین دادەنێت، چونکە خۆی ناتوانێت زانین و نەزانین و لاساییکردنەوە لە یەکدی جیابکاتەوە.

ئەوە ڕاستە.

ئەنجا دێینەسەر تراجیدیا و ڕابەرەکەشی، کە هۆمیرۆسە. هۆکەشی ئەمەیە: هەندێک دەڵێن شاعیر هەموو شتێک دەزانێت.

هەروەها دەڵێن، ئەگەر شاعیرێکی چاک هۆنراوەیەکی نایاب بنووسێت، دەبێت زانیاری لەبارەی ئەو شتانەوە هەبێت، کە باسیان دەکات، ئەگینا ناتوانێت بنووسێت. پێویستە بزانین، داخۆ ئەوانەی بەم جۆرە بیر لە شاعیر دەکەنەوە لاساییکەرەکانیان بینیوە و هەڵخەڵەتێنراون، ئەو بەرهەمانەش لە ڕیزی سێیەمدا دادەنرێن، یان ڕاستن.

پێویستە ئەوە بزانین.

لەو باوەڕەدای کەسێک بتوانێت شتێکی ڕاست و کۆپیەکەشی دروست بکات، کۆپیەکە بخاتە پێش شتە ڕاستەکەوە؟

نەخێر.

بە دیدی من، ئەگەر ئەو شتە ڕاستەکان بناسێت لاسایی نەدەکردنەوە و هەوڵی دەدا پاش خۆی شتی چاک بەجێ بهێڵێت تاکو ستایش بکرێت.

منیش لەگەڵتام، چونکە ئەو شتانە سوود و بەهای جیاوازیان هەیە. داوا لە هۆمیرۆس و شاعیرەکانی دیکەش ناکەین باسی ئەم پیشانەمان بۆ بکەن. ئەو پرسیارە ناکەین، ئایا یەکێک لەوان پزیشکە یان لاساییکەرەوە، شاعیرێکی کۆن یان نوێ توانیویەتی، وەکو ئەسکلیپیۆس چارەی نەخۆشێک بکات، یان وەکو چۆن ئەسکلیپیۆس کوڕەکەی خۆی فێری پزیشکی کرد، شاعیرەکەش کۆمەڵێک خوێندکاری فێری پزیشکی کردووە. تەنانەت لەبارەی پیشەکانی دیکەشەوە، پرسیاریان لێ ناکەین، بەڵام ئاراستەکردنی پرسیار لە هۆمیرۆس دەربارەی گرنگترین و جوانترین شت، جەنگ و ڕژێمی شارەکان و فێرکردنی خەڵک، کە خۆی باسیان دەکات ڕەوایە بکرێت و بڵێین:

هۆمیرۆس ئەگەر تۆ لە ڕیزی سێیەمی ڕاستیدا لاساییکەرەوە نەبیت و خۆت لە ڕیزی دووەمیش دابنێیت، ئایا دەتوانیت ڕوونی بکەیتەوە چ ڕژێمی شارێک لەبەرئەوەی تۆی تێدایە و پەیڕەوی تۆ دەکات، وەکو سپارتا، لەبەر لیکەرگۆس، چاکە؟ چ شارێک، وەکو ئەوەی لە ئیتاڵیا و سیسیلی بۆ کارنۆداس و ئێمەش بۆ سۆلۆنی دادەنێین، تۆ

بە یاسازو سوودمەند دادەنێت؟ ئایا ئەو دەتوانێت ناوی شارێکمان بداتێ؟ لەو باوەڕەدام ناتوانێت. تەنانەت، هۆمەریدەکانیش ئەو پلەیەی بۆ دانانێن.60

شارێک دەدۆزیتەوە لە سەردەمی هۆمیرۆسدا لە جەنگێکدا سەرکەوتبێت، لەبەرئەوەی هۆمیرۆس پێشەوای بووە، یان ڕاوێژکاری فەرمانڕەواکەی بووبێت؟

نییە.

چ داهێنان و بۆچوونێکی زانستیانە هەیە بەو جۆرەی دەیگەڕێننەوە بۆ تالیسی میلیتس و ئەنەکارسیسی سیتیسن، ناوی هۆمیرۆسی بەسەرەوە بێت؟61

نەخێر.

ئایا هۆمیرۆس فێرکەر بووە و هەوڵی داوە خەڵکی پەروەردە بکات، وەکو پیتاگۆراس بۆچوونەکانی بۆ ئێمە مابێتەوە؟62

تاکو ئەمڕۆ ڕێز بۆ پیتاگۆراس دادەنرێت و خەڵکی شوێن بۆچوونەکانی دەکەون.

ئێمە بەمجۆرە لەبارەی هۆمیرۆسەوە هیچ نابیسین. ئەگەر ئەو چیرۆکانەی لەبارەی هۆمیرۆسەوە بیستوومانە ڕاست بن، تێدەگەین چ جۆرە کەسێک بووە، تەنانەت کریۆفیلۆسی هاوڕێی ئەوەندە بایەخی پێ نەداوە. ئەو چیرۆکانەمان بیستووە، بەڵام گلاوکۆن، ئەگەر هۆمیرۆس توانیبێتی خەڵکی فێر بکات، بیانکات بە کەسانێکی چاکتر و لاساییکەرەوە نەبووبێت، ئایا زۆر کەس خۆشی نەدەویست و ڕێزیان بۆ دانەدەنا؟

پرۆتاگۆراسی ئەبدیرا، پرۆدیسیۆسی سیۆس و زۆری دیکەش دەتوانن کار بکەنە سەر خەڵکی و فێریان بکەن، ڕێز بۆ خۆیان دروست بکەن و خەڵکی بە کۆڵ بیانگێڕن63.

ئەگەر هۆمیرۆس و هزیۆدیش سوودیان هەبووایە، لەم شار بۆ ئەو شار دەسوڕانەوە؟ ئایا بەڕێزەوە لە شارەکەی خۆیان خزمەتیان نەدەکرا؟

بە ڕای من، سوکرات، بۆچوونەکەت دروستە.

کەوابوو، خۆمان بەو ئاکامە بگەیەنین، کە شاعیرە لاساییکەرەوەکان لە هۆمیرۆسەوە کۆپی ڕاستی دەناسن و ئەوەی باسی دەکەن ڕاستی

نییە؟ ئەمەش لەو خاڵە دەچێت لە پێشتر سەبارەت بە هونەرمەندی شێوەکاری باسمان کرد، کە بەبێئەوەی زانیاری لەبارەی پینەچێتیەوە هەبێت تابلۆی پینەچیمان بۆ دروست دەکات.

ڕاستە.

شاعیر وشە و گوتە، وەکو ڕەنگ بۆ وێنە هونەرییەکەی بەکاردەهێنێت. ئەو بەبێئەوەی بزانێت ئەوانە چین بەکاریان دەهێنێت. کەسانی نەزان، وەکو خۆی، وا دەزانن چاک باسی پینەچێتی و جەنگ، یان شتێکی دیکە دەکات. هەروەها شاعیر دەنگی مۆسیقی و هارمۆنی بە وشەکانی دەدات و ڕیزیان دەکات. ئەگەر هۆنراوەکەی لەمانە ڕووت بکەیتەوە دەزانیت چی بەسەردێت.

دەزانم .

ئەمەش لە دەموچاوی ئەو لاوە ناچێت، کە بەرەوپیری دەڕوات، نە چاکە و نە جوانیش؟

بەتەواوی وایە

ئێستا بیر لەم خاڵەش بکەوە، لاساییکەرەوە هیچ لەبارەی بوونەوە نازانێت. تەنیا دیاردەی بوون دەناسێت. وانیە؟

بەڵێ.

کەوابوو باشترە باسەکە بە نیوەچڵی جێنەهێڵین.

بەردەوام بە.

گوتمان هونەرمەندی شێوەکاری تابلۆی جڵەو و لغاوی ئاژەڵمان بۆ دەکات.

بەڵێ.

ئەمانەش پینەچی و ئاسنگەریش دروستیان دەکەن؟

هەڵبەتە.

ئایا هونەرمەندەکە دەزانێت جڵەو و لغاوی ئاژەڵ چۆن دروست دەکرێن؟ یان دەتوانین بڵێین پینەچی و ئاسنگەر نازانن دروستیان بکەن؟ تەنیا کەسێک بزانێت چۆن دروست دەکرێن ئەسپسوارەکەیە؟

لەگەڵتام.

ئایا ئەمە بۆ هەموو شتەکانی دیکە ناگونجێت؟

وەکو چی؟

بۆ هەموو شتێک سێ کەس هەن: یەکەمیان دروستی دەکات، دووەمیان بەکاری دەهێنێت، سێیەمیان لاسایی دەکاتەوە (کۆپی دەکات).

بەڵێ.

ئایا چاکە، جوانی و دروستی هەموو کەلوپەلێک، زیندەوەرێک و کردەوەیەک، پەیوەندی بە شێوەی بەکارهێنانەوە نییە، کە بە سروشت پێیان دراوە؟

وایە.

کەوابوو، پێویستە ئەوەی بەکاریان دەهێنێت خاوەنی ئەزموونێکی زۆر بێت. بە دروستکەرەکەش دەڵێت چ بەرهەمێکی چاکە یان خراپ. شمشاڵژەنێک دەتوانێت چاکە و خراپی شمشاڵەکە بۆ ئەو کەسە باس بکات، کە شمشاڵەکەی دروست کردوە.

ئەویش گوێ لەپێشنیار و باسەکەی دەگرێت.

هەڵبەتە.

ئایا ئەوەی شمشاڵەکە دروست دەکات پشت بە هەڵسەنگاندن و بۆچوونی شمشاڵژەنەکە نابەستێت؟

پێویستە پشتی پێ ببەستێت.

ئایا لاساییکەرەوە دەزانێت ئەوەی دروستی دەکات چاکە یان باش بەکاردێت؟

نەخێر.

کەوابوو لاساییکەرەوە زانیاری و بۆچوونی دروستی لەبارەی ئەو شتەوە نییە دروستی دەکات. نازانێت چاکە یان خراپ.

دروستە.

شاعیرێکیش زۆر چاک بەرهەمەکەی خۆی دەناسێت.

بەپێچەوانەوە، زۆر کەم.

لەگەڵ ئەمەشدا، لە لاساییکردنەوە بەردەوامە. ئەو چاکە و خراپە ناناسێت. لاساییکردنەوەکەش بۆ ئەو کەسانەی هیچ نازانن جوان و چاک دەردەکەوێت.

هەڵبەتە.

دەردەکەوێت لەسەر ئەو خاڵە هاوڕا بین، کە لاساییکەرەوە

زانیارییەکی بەسوودی لەبارەی ئەو شتەوە نییە لاسایی دەکاتەوە و هەمان کات، لاساییکردنەوە جۆرێکە لە یاریکردن و بە جیددی وەری ناگرین. هەموو شاعیرە تراجیدیاکانیش گرنگ نییە کەم یان زۆر بنووسن، لاساییکەرەوەن.

ڕاستە.

ئایا ئەم لاساییکردنەوەیە لە ڕاستیەوە سێ جار دوور نییە؟

بەڵێ، سێ جار دوورە.

چ ئەندامێکی لەش خۆی پێوە ماندوو دەکات؟

مەبەستت چیە؟

مەبەستم ئەمەیە: قەوارەی شتێک، بەگوێرەی دووری و نزیکی، لە ئێمەوە دەگۆڕێت.

وایە.

شتێک لەنێو ئاودا دەچەمێتەوە و لە دەرەوەشدا ڕاست دیارە. هەروەها شتێک، لەبەرئەوەی ڕەنگەکانی بەو شێوەیە دەبینین چەماوە و قوپاو دیارن. زۆر شتی دیکەش هەن بەم شێوانە بە ئێمە دەگەن. لەبەر ئەم لایەنە لاوازە و زوو هەڵخەڵەتێنراوەی دەروونی مرۆڤە ڕووناکی و تاریکی و ڕەنگەکان لە بەرهەمێکی هونەرییدا جادووگەرانە کاردەکەنە سەر دەروونمان.

ڕاستە.

ژماردن، کێشان و پێوانیش، کاری بەشە هۆشەکییەکەی دەروونە.

بەڵێ.

کاتێک ئەم بەشە، شتەکان دەپێوێت و بۆی دەردەکەوێت گەورە، بچووک یان لە قەوارەدا نەگۆڕن، لەهەمانکاتدا لایەنە دژەکەشی بۆ دەردەکەوێت.

بەڵێ.

ئایا لە پێشتر نەگەیشتینە ئەو باوەڕەی لایەنە دژەکان لە یەک بووندا لە یەک کاتدا نابێت هەبن؟ ئێمە بەو باوەڕە گەیشتین، هۆکەشیمان زانی.

ئەو بەشەی لە دەرووندا لەگەڵ پێوانە و ژماردندا ناکۆکە هەمان بەش نییە، کە لەگەڵیدا ناکۆک نییە.

ڕاستە.
چاکترین بەشی دەروونیش ئەوەیە، کە لەگەڵ پێوانە و ژماردندا ناکۆک نییە.
بەدڵنیاییەوە.
من دەمەوێت بەم خاڵە بگەین، کە گوتم هونەری شێوەکاری و لاساییکردنەوە بەگشتی لە ڕاستیەوە دوورن. لاساییکردنەوە پەیوەندی بە بەشێکی دەروونەوە هەیە. ئەو بەشەش هۆش نییە. نزیکبوونەوەش لەم بەشە ئاکامێکی چاکی نییە.
ڕاستە.
کەوابوو لاساییکردنەوە شتێکی نزمە و لەگەڵ شتێکی نزمی دیکەدا جووت دەبێت. شتی نزمتر دەهێنێتە بەرهەم.
وا دەردەکەوێت.
ئایا ئەمە تەنیا بۆ لاساییکردنەوە دروستە؟ ئەی هۆنراوەش ئەم خەسڵەتەی نییە؟
لەوانەیە هۆنراوەش ئەم خەسڵەتەی هەبێت.
بەهەرحاڵ نابێت ئێمە لەم لێکچوونەوە لەنێوان هونەری شێوەکاری و هۆنراوەدا بەڵگەمان بخەینە گەڕ. پێویستە ڕاستەوخۆ لەو بەشەی دەروونمان بدوێین، کە هۆنراوەی تێدا دروست دەبێت. با بزانین بەشێکی نزمە یان نا؟
بەڵێ، پێویستە.
هۆنراوە لاسایی ئەو ڕووداوانە لە ژیانی مرۆڤدا دەکاتەوە، کە بە ئارەزووی مرۆڤەکان، یان لەژێر زەبردا هاتوونەتە کایەوە.
هەروەها مرۆڤەکانیش لە ئاکامی ڕووداوەکاندا ژیانێکی خۆشتر یان خراپتریان هەیە، تووشی ئازار بوون یان نا؟ ئایا بێجگە لەمە، هۆنراوە باسی شتێکی دیکەمان بۆ دەکات؟
نەخێر.
ئایا مرۆڤ دەتوانێت لەنێو ئەم بارودۆخە جیاوازانەدا، وەکو خۆی بمێنێتەوە؟ یان شپرزە دەبێت و تێڕوانینی جیاواز لە ناخیدا سەرهەڵدەدەن و وەکو خۆی نامێنێتەوە؟ هەرچەندە بە ڕای من، ئێمە بەو ئاکامە گەیشتین، کە دەروون لە یەک کاتدا پڕە لە بۆچوون و

تێڕوانینی جۆراوجۆر.
وابوو.
وابوو، بەڵام هەست دەکەم شتێکمان لەبیر چوو باسی بکەین.
وەکو چی؟
لە پێشتر گوتمان، باوکێکی چاک بە بیستنی مردنی کوڕەکەی، یان لەناوچوونیماڵەکەی لە باوکێکی دیکە ئارامترە و بە هێمنی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.
بەدڵنیاییەوە.
ئایا خەمی بۆ ناخوات؟ یان هەوڵ نادات ئازارەکەی خۆی کەم بکاتەوە؟
دووەمیان دەکات.
ئایا ئەو کاتە هەوڵ دەدات لە ئاستی ئازارەکەدا خۆڕاگر بێت، کە لەنێو کەسانی وەکو خۆیەتی یان کە بە تەنیایە؟
کاتێک لەنێو کەسانی وەکو خۆیەتی.
بە تەنیا هەندێک شت دەکات، کە لەڕووی نایەت لەنێو خەڵکدا بیکات.
ڕاستە.
هۆش و یاسا هانی دەدەن لەبەردەم ئازارەکەدا خۆڕاگر بێت. هەستکردن و ئەزموونەکەشی بیری ئازارەکەی دەخەنەوە و لاوازی دەکەن.
ڕاستە.
کاتێک دوو هەڵوێستی جیاواز لە یەک کاتدا لەلای مرۆڤێک هەڵبدەن، دەگەینە ئەو باوەڕەی لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە دەرچوون.
هەڵبەتە.
یەکێک لەو هەڵوێستانەش شوێن یاسا دەکەوێت؟
چۆن؟
یاسا دەڵێت ئەو کارە مەکە، باشتر لە ئاستی خەم و ئازاردا خۆڕاگر و ئارام بە، بەڵام ئەو نازانێت ئەمە ئاکامێکی چاک یان خراپی هەیە. دووەمیش، داهاتووی ئەو کەسە بەم کارە باشتر دەرناکەوێت. سێیەمیش، پێویست ناکات ڕووداوەکانی ژیان بە جیددی وەربگرێت.

دواجاریش، خەم ڕێگری ئەو شتانەیە مرۆڤ دەیانخوازێت.
تۆ باسی چ دەکەیت؟
ژیان، وەکو زار فڕێدانە و دەبێت ڕازی بین بەوەی ڕوودەدات. هەوڵ بدەین بەڕێوەی بەرین و بیخەینە بەر ڕۆشنایی هۆش.
با وەکو منداڵ، لە کەوتندا بە گریان و هاوار دەست بە شوێنی برینەکەمانەوە نەگرین. پێویستە خۆمان فێر بکەین زوو ئازار و خەفەت لەبیر بکەین. تیماری برینەکانمان بکەین.
ئەوە باشترین چارەیە بۆ بەدبەختی لە ژیاندا.
هەروەها ئەو بەشەی لە ئێمەدا شوێن پێوانەی هۆشەکی دەکەوێت چاکترینە.
دیارە.
ئەو بەشەی بەرەو خەم و ئازار پەلکێشمان دەکات، لەوێدا دەمانهێڵێتەوە، تەمەڵ و ترسنۆک نییە؟
بێگومان.
ئێستا ئەم بەشە هەڵچووە و ئۆقرەنەگرە زەمینە بۆ لاساییکردنەوە خۆش دەکات. بەشە هۆشەکییە ئارامەکەش، کە وەکو خۆی دەمێنێتەوە لاساییکردنەوەی ئاسان نییە و کەسانی دیکەش لێی تێناگەن. ئەوەی هۆش هەیەتی بۆ ئەوان شتێکی ئاشنا نییە.
بەدڵنیاییەوە.
لێرەدا دەردەکەوێت شاعیر بە سروشت خۆی بە بەشی هۆشەکی دەروونەوە نابەستێتەوە. ئەگەر زیرەک بێت، بیەوێت جەماوەر بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، نابێت خۆی لە هۆش نزیک بکاتەوە. بۆ ئەو بەشە هەڵچووە ڕەنگینەکە چاکترە، چونکە لاساییکردنەوەی ئاسانە.
ڕاستە.
کەوابوو، شاعیر دەخەینە ڕیزی هونەرمەندی شێوەکارییەوە. بەرهەمەکانی شاعیریش، وەکو تابلۆکانی هونەرمەندی شێوەکاری لە ڕاستیەوە دوورن. پەیوەندییان بە بەشی نزمی دەروونەوە هەیە. لەبەرئەوە پێویستە لە شارەکەماندا دەریکەین. ئەو لایەنی هۆشەکی خۆی لە دەروونیدا دەکوژێت و لایەنە نزمەکە بەهێز دەکات. هەروەها شاعیر دەستوورێکی خراپ بۆ خەڵکی دادەنێت، چونکە ڕاستی

دەرناخات. ئەوەی باسی دەکات سێبەرو وەرگیراوی ڕاستییە. پشت بەو لایەنەی دەروون دەبەستێت، کە بەبێئەوەی بزانێت جیاوازیی نێوان گەورە و بچووک چیە.. لەو باوەڕەدایە شتێک لە حاڵەتێکدا گەورە و حاڵەتێکی دیکەدا بچووکە.

ئەوە ڕاستە.

ئێمە بەتەواوی لاساییکردنەوەمان تاوانبار کردووە. باسی ئەو لایەنەمان نەکردووە، کە چۆن دەتوانێت تەنانەت کەسانی چاکیش بەرەو خراپە بەرێت.

ئەوە دەتوانێت بکات.

بزانە دەتوانێت ئەم کارە بکات یان نا. کاتێک گوێ لە هۆمیرۆس یان شاعیرێکی دیکەی تراجیدیا دەگرین، لاسایی خەم و پەژارەی قارەمانێک دەکاتەوە و گۆرانی دەڵێت، لە سنگی خۆی دەدات، ئێمە چێژی لێ وەردەگرین و خۆمان بە هاودەردی قارەمانەکە دەکەین. هۆنراوەکەش بە جوان و نایاب دادەنێین.

ڕاستە.

بەڵام کاتێک یەکێک لە ئێمە لە ژیاندا تووشی ناخۆشی دەبێت ئەمە ڕوونادات. هەوڵ دەدەین ئارام بین و بەسەر ناخۆشیەکەدا زاڵ بین، چونکە مرۆڤ دەبێت خۆڕاگر بێت.

منیش لەو باوەڕەدام.

کەوابوو، ڕاستە ستایشی بۆ بکەین؟ پێویست دەکات خۆشی لەو ڕووداوە ببینین و ستایشی بۆ بکەین، کە بە ڕووداوێکی نالەبار و پڕ شەرمی دادەنێین؟

نا، بە خوا ئەوە هەڵوێستێکی هۆشمەندانە نییە.

وایە، ئەگەر بەمجۆرە تەماشا بکرێت.

چۆن؟

ئەگەر ئەو بەشەی لە دەروونماندا حەزی لە گریان و لاوانەوەیە بەزۆر ڕاگیرابێت و هەمان ئەو بەشەش بێت، کە خۆشی لە بیستنی هۆنراوەیەکدا دەبینێت. هەروەها هۆش جڵەوی بەشی یەکەم بەردەدات و گوێی پێ نەدات، دەگاتە ئەو خاڵەی ستایشکردنی خەفەت و لاوانەوە و شەرمی تێدا نییە. خۆشی لەو هەڵوێستەدا دەبینێت. بۆئەوەی لەو

خۆشیەش بێبەش نەکرێت بە ڕقەوە تەماشای هۆنراوە ناکات. لەو باوەڕەدام کەم کەس خۆشی بە بیستنی خەم و ئازاری یەکێکی دیکە پێدەگات.

لە ڕێگەیەوە ئەو بەشەی دەروونی خۆی پێ بەهێز دەکات، کە تووشی خەم و پەژارەی دەکات.

ڕاستە.

ئایا هەمان بۆچوون بۆ پێکەنینیش نابێت؟ هەندێک نوکتە هەن تۆ شەرم دەکەیت بیانگێڕیتەوە، بەڵام ئەو کاتەی کەسێکی دیکە دەیانگێڕێتەوە پێت خۆشە و بە خراپیان دانانێیت. ئایا ئەمەش وەکو بەزەییەکە نییە (کە بۆ قارەمانە تراجیدیاکە دەرتبڕی؟).

هۆش ڕێگەی ئەو بەشەی دەروونت دەگرێت، کە حەزی لە گێڕانەوەی نوکتەکانە بۆئەوەی کەسانی دیکە گاڵتەت پێنەکەن.

وایە.

سەبارەت بە سێکس، توڕەبوون، ئارەزووەکان، خۆشی و ناخۆشی هۆنراوە، هەمان کاریان تێدەکات. ئاویان دەدات و بەهێزیان دەکات. ئەوان دەکات بە فەرمانڕەوای ئێمە. لە کاتێکدا ئەمانە دەبێت فەرمانڕەواییان بکرێت و جڵەویان بگیرێت.

ناتوانم دژی بۆچوونەکەت ڕاوەستم.

لەسەروو ئەمەوە، گلاوکۆن، ئەوانەی ستایش بۆ هۆمیرۆس دەکەن، بەو شاعیرەی دادەنێن، کە یۆنانی پەروەردە کردوە، پێویستە نەوەکانمان فێری هۆنراوەکانی بن، لە ژیانماندا پەیڕەوی بۆچوونەکانی بکەین، ڕێزیان بۆ دادەنرێت و بە دۆست دادەنرێن. تۆش دەبێت لەگەڵیاندا هاوڕا بیت، کە هۆمیرۆس گەورەترین شاعیری تراجیدیایە. تۆ دەزانیت گۆرانی گوتن بۆ خواکان و ستایشکردنی مرۆڤە چاکەکان تەنیا هۆنراوەیەکە لە شارەکەی ئێمەدا (لە بەرنامەی پەروەردەکەماندا) ڕێگەی پێ بدرێت. ئەگەر ئەمە نەکرێت، خۆشی و ناخۆشی، نەک یاسا، دەبن بە پاشای شارەکەمان.

ڕاستە.

کەوابوو، با ئەمە بە هێڵی بەرگری دابنێین. ئێستا باسەکەمان لەسەر هۆنراوەیە. لەبەر خەسڵەتەکانی مافی ئەوەمان هەیە قەدەغەی

بکەین. ئەمەش بە بەڵگەکەمانەوە (دژی هۆنراوە) بەستراوە. ئەگەر ڕەخنەشمان لێ بگرن لەسەرئەوەی بەرانبەر هۆنراوە دڵڕەقانە ڕاوەستاوین، ئەوە باس دەکەین چۆن لە کۆنەوە هۆنراوە خۆی بە دوژمنی فەلسەفە داناوە. ئەمەش لەو گوتەیەدا دەردەکەوێت، کە گوایە، "سەگەکە بە خاوەنەکەی وەڕی". یان "گەورەیی لە بێکەڵکی گوتەی مرۆڤە گەمژەکاندایە"، هەروەها "دەستەیەک لە مرۆڤە زاناکان زیۆسیان تەوق دا"، یان "بیریارەکان سواڵکەرن". نموونەی زۆرتریش هەن، کە دوژمنایەتیەکە دەردەخەن. بەهەرحاڵ، ئەگەر هۆنراوە لاساییکردنەوە بێت، بەدوای خۆشیدا بگەڕێت، لە شارە چاکەکەی ئێمەدا جێگەی نابێتەوە. ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، پێشوازی دەکەین و جوانیەکەشی سەرنجمان ڕادەکێشێت. تۆ، گلاوکۆن، چ دەڵێیت؟

جوانیەکەی سەرنجت ڕادەکێشێت؟

بەدڵنیاییەوە، سەرنجم ڕادەکێشێت.

پێویست ناکات ئەو هۆنراوەیەی (پەیڕەوی یاساکەمان دەکات) لە هەندەرانەوە بۆ شارەکەمان بگەڕێتەوە. گرنگ نییە چ جۆرە هۆنراوەیەک بێت؟

بەدڵنیاییەوە.

ئێمەش ڕێگەی ئەوانە دەدەین، کە حەزیان لە هۆنراوەیە، تاکو بە پەخشان سوودی هۆنراوە بۆ دەستوورەکەمان و ژیانی مرۆڤ نیشان بدەن.

ئەمە کارێکی چاکە.

ئەگەر ئەوان سوودی هۆنراوەیان نەسەلماند، ئێمە، وەکو ئەو عاشقانە دەجوڵێینەوە، کە لەبەرئەوەی پەیوەندییە خۆشەویستیەکەیان ئەنجامێکی سوودبەخشی نییە خۆیان لە خۆشەویستەکەیان دووردەخەنەوە. ئێمە لە منداڵییەوە هۆنراوەمان بیستوە و حەزمان لێ کردوە، بەڵام ئێستا دەرکەوتووە، کە چاکترین و ڕاسترین شت نییە. هەر کاتێکیش هۆنراوەیەکمان بیست، بۆئەوەی نەکەوینە ژێر کاریگەرێتیەکەیەوە، ئەو بەڵگەیە بیر خۆمان دەهێنینەوە، کە بێ سوودی هۆنراوەی لەسەر دامەزراوە. دەبێت خەڵکی ئاگادار بکەین، کە ئەو هۆنراوەیە لە ڕاستی نادوێت و نابێت بەجیددی وەربگیرێت.

من لەگەڵتام.
بەڵێ، کێشەکە لەوە گەورەترە خەڵکی بیری لێ دەکەنەوە. نابێت لەپێناوی ڕێز، پارە، دەسەڵات و تەنانەت هۆنراوەشدا، واز لە دادوەری و چاکەکانی دیکە بهێنرێت.
پاش ڕوونکردنەوەکەت، لەگەڵتا هاوڕام. لەو باوەڕەشدام کەس نییە دژی تۆ ڕاوەستێت.
ئەوەی باس نەکراوە خەڵاتەکانە بۆ جۆری چاکەکان.
پێویستە ئەو خەڵاتانە زۆر گەورە بن.
هیچ شتێکی گەورە، لە کاتێکی کورتدا پەیدا دەبێت؟ ئایا تەمەنی مرۆڤ لە منداڵییەوە بۆ پیری ئەگەر لەگەڵ درێژی ژیاندا بەراورد بکرێت کورت نییە؟
زۆر کورتە.
پێویست دەکات کەسێکی نەمر گوێ بە ژیان نەدات، خۆی بەو تەمەنە کورتەوە ماندوو بکات؟
هەست دەکەم نابێت ئەوە بکات، بەڵام مەبەستت چیە؟
تۆ لەو باوەڕەدا نیت، کە دەروونمان نەمرە و هەرگیز لەناوناچێت؟
بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کردم و گوتی: نەخێر، بە خوا من نازانم. تۆ دەتوانیت باسی بکەیت؟
باسکردنەکەی ئاسانە.
حەزدەکەم بزانم چۆن ئاسانە.
کەوابوو، گوێت گرتووە.
تۆ بڵێ، من گوێم گرتووە.
تۆ باسی چاکە و خراپە دەکەیت؟
بەڵێ.
ئایا وەکو من بیریان لێ دەکەیتەوە؟
تۆ چۆن بیریان لێ دەکەیتەوە؟
خراپ ڕووخێنەرە و گەندەڵییە، چاکەش سوودگەیاندن و بەردەوامبوونە.
بەڵێ.

لەو باوەڕەدایت چاک و خراپ بۆ هەموو شتێک هەبێت؟ بۆ نموونە، کوێربوون بۆ چاو، نەخۆشی بۆ لەش، کەڕوو بۆ دانەوێڵە، ڕزین بۆ تەختە و ژەنگ بۆ برۆنز خراپن. مەبەستم ئەوەیە، ئایا خراپە بە سروشت بۆ هەموو شتێک هەیە؟

هەیە.

ئەگەر یەکێک لەم خراپانە بە شتەکە بگات خراپی دەکات؟ ئایا لە کۆتاییدا دەیفەوتێنێت؟

هەڵبەتە.

کەوابوو، ئەو خراپەیەی بە سروشت بە شتێک دەگات بوونی ئەو شتە لەناو دەبات. بێجگە لەو خراپەیە چی دیکە ئەو شتە نارِوخێنێت.

وایە.

ئەگەر شتێک بدۆزینەوە، کە جۆرێک لە خراپە دەیشێوێنێت، بەڵام ناتوانێت لەناوی بەرێت، ئایا بەو باوەڕە ناگەین، کە ئەو شتە بە سروشت توانای بەرگریکردنی هەیە؟

لەوانەیە.

سەبارەت بە دەروونی مرۆڤ چ دەڵێیت؟ هیچ شتێک هەیە خراپی بکات؟

هەموو ئەو شتانە، وەکو نادادوەری، بەرەڵایی، ترسنۆکی و نەزانین، باسمان کردن دەبنە هۆی خراپبوونی دەروون.

ئایا هەر یەکێک لەوانە دەبێتە هۆی شێواندن و لەناوبردنی دەروون؟ من مەبەستم ئەوە نییە، کە کەسێکی نادادوەرو گەمژە دەدۆزینەوە ئەو کەسە لەبەرئەوەی نادادوەری یان ئەو خراپەیە لە دەروونی داوە دەفەوتێت و لەناودەچێت. حەزدەکەم نموونەی لەشت بۆ باس بکەم: نەخۆشی بۆ لەش خراپە، کە توانای لەش کەم دەکاتەوە و لەناوی دەبات.

بەڵێ.

بەمجۆرەش تەماشای دەروون بکە. ئایا نادادوەری یان خراپەکانی دیکە دەروون لەناونابەن؟ ئایا دەروون ناکوژن و لە لەشی جیا ناکەنەوە؟

نا، ئەوە ناکات.

بـەڵام، ناگونجێت شتێک بە ڕێگەی خراپە سروشتیەکەی خۆی لەناونەچێت و خراپەیەکی دیکە کاری تێبکات.

دروستە، ئەوەش ناگونجێت.

گلاوکۆن ئەوە بزانە ئێمە ناڵێین خواردنی خراپ، خواردنێک بۆگەنی کردبێت یان هەر شتێک بێت لەش لەناودەبات، بەڵام ئەگەر خواردنێکی بۆگەن ببێتە هۆی سەرهەڵدانی خراپبوونی لەش، دەڵێین ئەو کەسە بە نەخۆشی مرد. لەبەرئەوەی لەش و خواردن دوو شتی جیاوازن، تاکو خواردنە بۆگەنەکە بە لایەنی خراپی لەش نەگات بە خراپ دانانرێت.

ئەوە ڕاستە.

کەوابوو، دوو ڕێگەمان لەبەرە، یەکەم، ڕەتدانەوەی بەڵگەکەمان و دووەم، پەیڕەویکردنی و گەیشتن بەو باوەڕەی، کە دەروون بە گەرمەتا و نەخۆشی و کوشتن، تەنانەت بە بڕینی لەشیش لەناو ناچێت. هەرشتێکیش، وەکو دەروون، خراپەیەکی سروشتی لەناوی نەبات خراپەیەکی دەرەکی ناتوانێت کاری تێبکات.

بەدڵنیاییەوە، کەس ناتوانێت بیسەلمێنێت دەروونی ئەو مرۆڤانەی دەمرن نادادوەرن.

ئەگەر کەسێک باوەڕ بە نەمری دەروون نەکات و لەو باوەڕەدا بێت مردن مرۆڤ دڕندەتر و نادادوەرتر دەکات، ئێمە وەڵامی دەدەینەوە و دەڵێین، نادادوەری دەبێت بە نەخۆشییەکی کوشندە بۆ نادادوەر.

ئەوەی تووشی دەبێت پێویستە بمرێت. ئەوانەی خراپ تووشی دەبن زوو دەمرن و ئەوانەی بە سوکی نادادوەرن درەنگتر دەمرن، بەڵام ئەوەی ڕوودەدات بەم جۆرە نییە. مرۆڤی نـادادوەر دەمرێت، نەک لەبەرئەوەی تووشی نەخۆشی نادادوەری بووە، بەڵکو نەیارەکانی دەیکوژن.

نا. ئەگەر نادادوەری بۆ نادادوەرەکە نەخۆشیەکی کوشندە بووایە هێندە ترسناک نەدەبوو، چونکە ئەو دەیتوانی خۆی لێ بپارێزێت.

ئێستا ئاشکرایە، مادامەکی هیچ جۆرە خراپەیەک، دەرەکی و ناوەکی، دەروون لەناونابات، ئەوا دەروون بەردەوام دەمێنێتەوە و نەمرە.

پێویستە نەمر بێت.

لەبەرئەوەی نەمرن هەمیشە وەکو خۆیانن، کەم و زیاد ناکەن.

ئەگەر ژمارەیان زۆر بێت دەروونە نوێکان دێنەکایەوە. هەر شتێک بێتەکایەوە سەرەتای هەیە و کاتییە و نەمر نییە.
ڕاستە.
نابێت بەمجۆرە بیر لە بوونی دەروون بکەینەوە، بە هەمەڕەنگی دابنێین، لەو باوەڕەدا بین هەڵگری جیاوازییەکان بێت.
مەبەستت چیە؟
هەر شتێک لە بەشەکان پێکهاتبێت بە جوانی دانەمەزرابێت بەردەوام نامێنێتەوە.
وایە.
لە بەڵگەکانماندا، نەمریی دەروونمان دامەزراند بۆئەوەی ڕاستی دەروون بناسین. پێویستە لە ڕێگەی لەشەوە لە بوونی نەکۆڵینەوە. گرنگە دەروون، وەکو خۆی ببینرێت و بخرێتە بەر لێکۆڵینەوەی هۆشەکییەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت چۆنە و چیە. بە ڕوونیش دادوەری و نادادوەری هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن دەبینین. ئێمە، وەکو ئەوانەی لە دوورەوە و بۆ ساتێک خوای دەریا دەبینن و باسی دەکەن لە بوونی دەروون دواین. هەروەها، ئەوان خوای دەریایان بەشێوەیەکی سەیر بینیوە. لەشی پارچەپارچە بووەو شەپۆلی دەریاکە شێواندوویەتی و گژوگیای نێو دەریاکەی لێوە ئاڵاوە. زیاتر لە دێو، نەک لە خوا دەچێت. دەروونیش بەمجۆرە دەردەکەوێت و خراپەی زۆری لێوە ئاڵاوە. گلاوکۆن، لەبەرئەمەیە دەمانەوێت لە گۆشەیەکی دیکەوە، بڕوانینە دەروون و ڕاستی بوونی بدۆزینەوە.
لەکوێوە؟
لە فەلسەفە یان لە خۆشەویستی زانینەوە. با بزانین دەروون دەیەوێت کار لە چی بکات و لەگەڵ چیدا پەیوەندی ببەستێت، چونکە ئەو بە نەمری و پیرۆزییەوە گرێدراوە. با بزانین مەیلی بۆ چیە و دەیەوێت بە کوێ بگات. چۆن لە ئاکامدا ڕزگاری دەبێت و لەنێو دەریاکەوە، ئەو دەریایەی تیایدا گەورە بووە و فێری ڕابواردنی کردووە دەردەچێت. لەوێوە ڕاستی بوونی دەناسین و بۆمان دەردەکەوێت، کە پێکهاتەیە لە بەشەکان، یان یەک بوونی هەیە و دابەش ناکرێت. بە ڕای من، تاکو ڕادەیەک ڕاستیەکەیمان ناسیوە و لە بەشەکانی دواوین.

ڕاسته.
ئێمه ئەم خاڵانەمان لە گفتوگۆکەماندا ڕوون کردۆتەوە. باسی خەڵاتی دادوەریمان نەکردوە، کە لە هۆنراوەکانی هۆمیرۆس و هزیۆدا دۆزیتەوە، بەڵکو لە خودی دادوەری دواین. لێرەشدا لە خودی دەروون دەدوێین. هەروەها باسی ئەوەشمان نەکرد، کە پێویستە مرۆڤ، تەنانەت ئەگەر مستیلەکەی (گیگس)، یان کڵاوەکەی (هادیس)ی هەبێت دادوەرانە هەڵسوکەوت بکات؟64
باسمان کرد.
ئێستا، گلاوکۆن، گەڕانەوەمان بۆ دادوەری و چاکەکانی دیکە و خەڵات لەلایەن خواکان و کۆمەڵەوە، لەم ژیانە و ژیانی دواییشدا زیانی نییە.
نەخێر، زیانی نییە.
ئایا ئەوەی لەم گفتوگۆیەدا لە منت سەند دەیگەڕێنیتەوە؟
نازانم، مەبەستت چیە؟
ئەوە بوو گوتمان، دادوەری بە نادادوەر و نادادوەریش بە دادوەر دەردەکەوێت: تۆ لەو باوەڕەدا بوویت، کە هەرچەندە کەس ناتوانێت خۆی لە خوا و کۆمەڵ بشارێتەوە، بەڵام بۆ مەبەستی گفتوگۆکەمان لەسەری ڕازی ببووین. دادوەریشمان لەگەڵ نادادەرییدا بەراورد کرد. تۆ لەبیرتە؟
نابێت ئەوەم لەبیر بچێت.
پاش ئەوە حەزدەکەم دادوەری لەم خەسڵەتە بپارێزین و ناوی لەوە زیاتر نەزڕێنین، چونکە دادوەری بۆ دادوەرەکە زیانبەخش نییە و کەس بەفیڕۆ نابات.
ئەو داواکارییە بەجێیە.
لەو باوەڕەدایت، مادامەکی خوا دادوەرە، دادوەریش دەبینێت؟
لەو باوەڕەدام.
ئەگەر دادوەر و نادادوەر نەتوانن خۆیان لە خوا بشارنەوە، دەگەینە ئەو باوەڕەی خوا یەکێکیانی خۆش دەوێت و ڕقی لەوی دیکەشیانە. لە سەرەتاشەوە لەسەر ئەمە ڕێکەوتین.
ڕاسته.
دادوەرێک تووشی هەژاری و ناخۆشی، یان خراپەیەک لە کۆتایی

ژیانیدا ببێت، لەم ژیانە و دوای مردنیش، خواکان بە نیگەرانیەوە ئاگایان لێی دەبێت. هەرکەسێک بیەوێت دادەوەر بێت خۆی لە خوا نزیک بکاتەوە، ڕێگەی چاکەکردنی گرتۆتەبەر.

دیارە، ئەو کەسە نابێت لەبیر بچێت.

ئایا، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، بۆ نادادوەر دروست نییە؟

بێگومان.

ئەمانە خەڵاتن، کەسێکی دادوەر لەلایەن خواکانەوە پێی دەدرێت.

ئەوە بۆچوونی منیشە.

خەڵکی چ خەڵاتێکی دەداتی؟ ئەگەر بەڕاستی بدوێین، خەڵات ناکرێن؟

ئایا نادادوەرەکان، وەکو یاریزانەکەی لە پێشبڕکێی ڕاکردندا لە نیوەی یارییەکەدا نایباتەوە و لە نیوەی دووەمیش نادۆڕێت؟

لە سەرەتاوە باش دەژین، بەڵام دوایی تێدەکەون و بەبێ تاج گوێچکەکانیان بەرەو شانیان شۆڕ دەبنەوە. یاریزانە چاکەکانیش تاکو کۆتایی بە باشی ڕادەکەن. خەڵاتەکە دەبەنەوە. ئایا دادوەریش تاکو کۆتایی ژیانی ستایشی بۆ ناکرێت و خەڵاتی پێ نادرێ؟

هەڵبەتە.

منیش وەکو تۆ چۆن باسی نادادوەرانت کرد، بەو جۆرە باسی دادوەران بکەم؟ بڵێم دادوەران (ئەگەر بیانەوێت) بە پیریش لە شارەکانی خۆیاندا فەرمانڕەوایی دەکەن، هاوسەر بۆ خۆیان و منداڵەکانیان دەدۆزنەوە. هەموو ئەو شتانەی لە ژیانی نادادوەردا باست کردن، ئێستا من بە دادوەرەکانی بدەم. زۆرینەی مرۆڤە نادادوەرەکان، هەرچەندە خەڵکی بە باشی نایانناسن، لە کۆتاییدا گەندەڵییان دەردەکەوێت و دەناسرێن. بە پیری زۆر خراپ دەبن، چونکە یار و نەیارەکانیان بریندار‌یان دەکەن، بە قامچی لێیان دەدەن و سزایان دەدەن. ئایا تۆ ڕێگەم دەدەیت بەم جۆرە باسیان بکەم؟

بەڵێ، ڕێگەت دەدەم. ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە.

ئەمانە خەڵات و مووچە و دیاری خواکان و خەڵکین بۆ دادوەران.

بەڵێ ئەوانە خەڵاتی چاکن.

هێشتا ئەم خەڵاتانە لە چاو ئەوانەی پاش مردن خواکان پێیان

دەبەخشن کەمن. پێویستە باسی ئەوانەش بکەین.
باسیان بکە، حەزدەکەم بزانم خەڵاتی خواکان بۆ ئەوان چین.
ئـەوەی بۆتی دەگـێڕمـەوە داسـتـانـی ئەلکینۆس نییە. چیرۆکی قارەمانێکی پامفیلانە و ناوی (ئێر)ە، کوڕی ئارمیناسە، کە لە جەنگێکدا دەکـوژرێـت65. دە ڕۆژ دوای جەنگەکە، خەڵکی لاشـەی ڕزیـوی کوژراوەکان بۆ ناشتن کۆدەکەنەوە. لەنێویاندا لاشەی ئێر دەدۆزنەوە، کە نەڕزیوە و وەکو خۆی ماوەتەوە. خەڵکی سەریان دەسوڕمێ و ئێر لەگەڵ مردووەکانی دیکە نانێژن و لاشەکەی بۆ ماڵەوە دەبەنەوە و بۆ پرسە و ناشتن دایدەنێن. دوای دوو ڕۆژ ئێر زیندوو دەبێتەوە و بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە. دەڵێت: پاش مردن گیانی لەگەڵ گیانی مردووەکانی دیکەدا چۆتە شوێنێکی خۆش. لەو شوێنەدا چوار کونی کراوەو گەورەی (وەکو دەرگا) هەبوون. لە ناوەڕاستیاندا چەند دادوەرێک دانیشتبوون. پاش دادگاییکردنی گیانەکان، فەرمانیان بە گیانە چاکەکان داوە لیستی کردەوەکانیان لە بەرۆکیان بدەن و بەنێو کونە کراوەکەی دەستی ڕاستدا بچنە ژوورەوە. گیانە خراپەکانیش، پاش هەڵواسینی لیستی کردەوەکانیان بە بەرۆکیانەوە فەرمانیان پێ دراوە بە کونە کراوەکەی دەستی چەپی دادوەرەکاندا بچنە ژوورەوە. کاتێک سەرەی ئێر بۆ دادگاییکردن دێت، دەچێتە بەردەم دادوەرەکان، داوای لێ دەکەن بۆ سەر زەوی بگەڕێتەوە و باسی ژیانی دوای مردن بۆ خەڵکی بکات.
هەروەها، ئێر دەڵێت، لە دوو کونە کراوەکەی دیکەوە گیانەکان لـەنێوان بەهەشت و زەوییـدا هاتوچۆیان دەکـرد. ئـەو گیانانەی یـەکدیـان دەنـاسـی، پێکـەوە دادەنیـشـتـن و بـاسـی خـۆیـان دەکـرد. ئـەوانـەی تـازە مـردبـوون پـرسـیـاریـان لـەبـارەی بـەهـەشـتـەوە، لە گیانە کۆنەکان دەکرد. کۆنەکانیش هەواڵی ژیانی سەر زەوییان لە مردووە تازەکان دەپرسی. ئەو گیانانەی لەژێر زەوییەوە هاتبوون، دەگـریـان و باسی ژیـانـی هــەزار سـاڵـەی نێو دۆزەخـیـان دەکـرد. بەهەشتیەکانیش خۆشی و ڕابواردنی نێو بەهەشتیان دەگێڕایەوە.

گلاوکۆن، زۆر شتی دیکەشی گێڕایەوە، کە بینیبوونی، بەڵام پوختەی باسەکەی لەم خاڵەدا کۆدەبێتەوە: بۆ هەر کارێکی نادادوەرانە و خراپەکردن بەرانبەر کەسانی دیکە نادادوەر (دە) قات زیاتر لەم گەشتەدا لە هەر سەدەیەکدا سزا دەدرێت. ئەگەر دادوەرێک خیانەتی لە شارەکەی کردبێت، لە ئاکامدا خەڵک لەناوچووبن و چەکی بەرانبەریان هەڵگرتبێت، یان ئەوانی بە کۆیلە کردبێت، ئەوا بۆ هەر یەکێک لەوانەی ئازاریان بە دەستی خواردوە دادوەرەکە (دە) قات ئازار دەدرێت. مرۆڤی دادوەریش بەقەدەر چاکەکانی خۆی خەڵات دەکرێت. هەروەها، لەبارەی ئەو منداڵانەی بە مردوویی لەدایک دەبن، یان زوو دەمرن هەندێک شتی گوت، کە من لێرەدا باسیان ناکەم. باسی سزادان و خەڵاتی گەورەتریش بۆ خواناسان، بێ بڕواکەران و ئەوانەش کرد، کە مرۆڤ بە دەستی خۆیان دەکوژن، ڕێز بۆ دایک و باوکیان دانانێن. ئەو گوێی لێ بووە یەکێک لە گیانەکان پرسیاری لەبارەی ئەردیۆسەوە کردوە66. ئەوەی وەڵامی داوەتەوە گوتوێتی: "ئەو هەرگیز ناگاتە ئێرە. ئێمە پاش سزادانەکەمان بینیمان لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا، کە ئەوانیش لە ژیاندا زۆرداریيان کردبوو (هەندێکیشیان زۆردار نەبوون، بەڵام تاوانی گەورەیان کردبوو) دانرابوون. ئەوان وایاندەزانی ڕێگەیان پێ دەدرێت لە کونە کراوەکەوە بۆ سەرەوە بڕۆن، بەڵام نەیاندەتوانی دەرچن. هەر یەکێک لەوان خۆی دەکرد بە کونەکەدا و نەڕەیەکی گەورە لە کونەکەوە دەهات، ئەو کەسە چەندی دەکرد نەیدەتوانی بچێتە ژوورەوە، چونکە سزادانەکەی تەواو نەببوو. چەند کەسێکی دڕندەش بە بیستنی نەڕەکە دەهاتن و لە پشتەوە ملی ئەو کەسەیان دەگرت، دەست و قاچیان دەبەستەوە و بەرەو دۆزەخ فڕێیان دەدایەوە". باسی ئەوەشیان دەکرد ئەو کەسانە چەند لەو نەڕەیە دەترسان، کە لە کونەکەوە دەهات. زۆر دڵخۆشیش دەبوون کاتێک کونەکە نەڕەی نەدەهات".

هەر دەستە و تاقمێک لە گیانەکان حەوت ڕۆژ لە مێرگەکەدا دەمانەوە. لە ڕۆژی هەشتەمدا گەشتەکەیان دەستی پێدەکرد. لەسەرەوە بە ڕێگەی ئەستوونێکی تیشکەوە، کە لە کلاورۆژنەیەکەوە بەهەشت و زەوی ڕووناک دەکردەوە تەماشای خوارەوەیان دەکرد. ئەو تیشکە،

وەکو پەلکەزێڕینە بوو، بەڵام ڕووناکتر و پاکتر بوو. دوای ڕۆژێک بە ڕووناکییەکە دەگەیشتن. لەنێو ڕووناکییەکەوە ئەوپەڕی بەهەشتیان دەبینی، چونکە ئەو ڕووناکییە، وەکو پشتێنی بەهەشت بە چواردەوری هەموو گەردووندا پێچی خواردبوو. لە هەردوو سەرەکانیشەوە پێچکە بۆ سوڕانەوە و گەشتی تەنە ئاسمانیەکان دانرابوو. ئەو پێچکانە لە پۆڵا دروست کرابوون. تەوقەکەی چواردەوریان لە پۆڵا و کانی دیکەی تێکەڵ پێکهاتبوو. تەوقەکەی چواردەوری پێچکەکان، ئێر باسی دەکات بەمجۆرە بووە: هەریەکێک لەم تەوقانە چەند تەوقێکی بازنەیی بچووکتری تێدابووە، کە ژمارەیان هەشت بووە. لە گۆزەی گەورە و بچووک چوون و چوونەتە نێو یەکدییەوە. هەریەکێک لەم تەوقانە لەوی دیکە بچووکتر بووە. هەشتەم لە حەوتەم و حەتەم لە شەشەم و شەشەم لە پێنجەم و پێنچەم لە چوارەم بچووکتر بووە. بەمجۆرە تەوقی یەکەم لە هەموویان گەورەتر بووە. گەورەترین تەوق ئاسمانی ئەستێرە وەستاوەکانە. تەوقی حەوتەم بۆ خۆرە و ڕووناکترینە. تەوقی هەشتەم بۆ مانگە و ڕووناکی لە تەوقی حەوتەمەوە وەردەگرێت. تەوقی پێنجەم ئاسمانی ئەستێرەی ساتێرن و مێرکورییە. لە تەوقەکەی دوای خۆی زەردترە. سێیەم ئاسمانی ڤینۆسە و سپی و ڕووناکە. چوارەم ئاسمانی مەریخە و سووورباوە. شەشەم ئاسمانی جۆپیتەرە و لە ڤینۆس کەمتر سپیە. تەوقە گەورەکە  بە یەک لادا دەسوڕێتەوە، بەڵام حەوت تەوقە بچووکەکە لەسەرخۆ بە لاکەی دیکەدا دەسوڕێنەوە. لەنێویاندا تەوقی هەشتەم لە هەموویان خێراتر دەسوڕێتەوە. دوای هەشتەم بە ڕیز تەوقی حەوتەم و شەشەم و پێنجەم پێکەوە لە یەک پلەی خێراییدا دەسوڕێنەوە. لەگەڵ سوڕانەوەی هەریەکێک لەم تەوقە بازنەییانە دەنگێک دەردەچێت. هەر هەشتیان پێکەوە بە دەنگەکانیان هارمۆنیەک پێکدەهێنن. سێ کەسیش نزیک یەک لە دوورەوە دەبینران، کە لەسەر تەختێکی شاهانە دانیشتبوون. ئەوان چارەنووس و کچەکانی پێداویستی: لاچیسس، کلاتۆ و ئەترۆپۆس بوون. جلی سپیان لەبەردا بوو. ئەڵقەی لە گوڵ دروستکراویان بەسەرەوە بوو. لەسەر دەنگی سوڕانەوەی تەوقەکان گۆرانیان دەوت. لاچیسس گۆرانی بۆ ڕابردوو، کلاتۆ بۆ ئێستا و ئەترۆپۆس بۆ داهاتوو دەوت.

کڵاتۆ بە دەستی ڕاستی تەوقە گەورەکەی دەسوڕانەوە و جارجاریش دەوەستا. ئەترۆپۆس پاڵی بە تەوقە بچووکەکانی ناوەوە دەنا. لاچیسس یارمەتی هەردووکیانی دەدا. ئەو گیانانەی بە ڕووناکییەکە دەگەیشتن بۆ لای لاچیسس دەچوون، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە لای، دەبووایە پێغەمبەرێک ڕیزی بکردنایە؛ پێغەمبەرەکە لەبەر ئەژنۆی لاچیسس نموونەی زۆری ژیانی کۆدەکردەوە و بە گیانەکانی دەگوت: ''گوێ لە گوتەی لاچیسس کچی پێداویستی بگرن. ئەی گیانە کاتیەکان، ئەمە سەرەتای ژیانێکی دیکەیە، کە کۆتایی بە مردن دێت. ژیرانە ژیانتان هەڵبژێرن. ئەوەی ئەم کارە دەکات بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی دەدات. چاکە بێ خاوەنە. ئەوەی کەم یا زۆر چاکەی هەیە دەکەوێتە سەر ئەوەی چەند ڕێزی لێ دەگرێت. ئەوەی بڕیاری هەڵبژاردنی نەدات لێپرسراوە''.

پاش ئەمە ئەو پێغەمبەرە نموونەکانی ژیانی فڕێدایە بەردەم گیانەکان. هەریەکێک لەوان بێجگە لە ئێر، کە نەدەبوو دەستیان لێ بدات، ئەوەی هەڵگرت، کە لە نزیکییەوە کەوتەوە. ژمارەی نموونە و جۆرەکانی ژیان لە ژمارەی گیانەکان زۆرتر بوو. ژیانی جۆراوجۆری هەموو مرۆڤ و زیندەوەرێکی تێدابوو. لەنێویاندا ژیانی زۆردار هەبوون، کە هەندێکیان بەردەوام دەمایەوە و ئەوانی دیکەش لە نیوەدا تووشی هەژاری و سواڵکردن و ژیانی هەندەران دەبوون. ژیانی مرۆڤە ناودارەکان هەبوون، هەندێکیان لەبەر جوانی، هێز و توانا وەرزشکارییەکەیان و بنەچەیان ناودار بوون. ژیانی مرۆڤیشی تێدا بوو، کە ناودار نەبوو.

ئەم گیانانە وەکو یەک ڕیزکرابوون. جیاوازییەکانیان دەکەوتنە سەر جۆری ئەو ژیانەی هەڵیدەبژێرن. هەموو جۆرەکانی ژیان، کە لەگەڵ سامان، هەژاری، نەخۆشی و تەندروستی چاک و مامناوەندێتیدا تێکەڵ کرابوون لەنێو نموونەکاندا بوون.

ئێستا، گلاوکۆن، (لەم هەڵبژاردنەدا) مرۆڤ تووشی گەورەترین مەترسی دەبێت. لەبەرئەوە پێویستە فێر بین ژیانێکی چاک لە خراپ جیا بکەینەوە و بزانین چی هەڵدەبژێرین. پێویستە لەو شتانە تێبگەین باسمان کردن و ژیانی چاک بناسینەوە. ئەوەی ئەمە بکات تێدەگات

چۆن چاکە و خراپە لەگەڵ سامان و هەژارییدا تێکەڵ دەکرێن و چ کارێک دەکەنە سەر جوانی. ئەو دەزانێت لەدایکبوون لە خێزانێکی چاک، یان خراپەوە، فەرمانبەری، یان ژیانی تایبەتی چۆنە. دەسەڵات و بێ دەسەڵاتی چۆن ژیان دەگۆڕن. بەگوێرەی گوتەکانی (ئێر) پێغەمبەرەکە دەیگوت، ئەوەی زوو گەیشتە ئێرە ژیانی گەورەترین نادادوەرانەی هەڵبژارد لەبەرئەوەی تەماعی زۆر بوو، بیری لە ئاکامەکەی نەکردەوە. ئەو نازانێت لەنێو هەموو شتە خراپەکاندا ئەوەی هەڵبژاردوە، کە لە چارەی دەنووسێت منداڵەکانی خۆی بکوژێت. کاتێک بەئاگا دێتەوە، سنگی خۆی دەکوتێ و پەشیمانی دەردەبڕێت، بێئەوەی گوێ بداتە ئامۆژگاری پێغەمبەرەکە، گلەیی لە بەختی خۆی دەکات. تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی چارەنووس و هێزێکی نادیار. ئەم جۆرە کەسانە لەو شارەوە هاتوون، ڕژێمێکی تێدا سەقامگیر بووە، کە چاکەکردنەکەیان تەنیا شتێکی باو بووە و فەلسەفەشیان نەخوێندوە.

بەگشتی ئەم گیانانە لە بەهەشتەوە گەڕابوونەوە و ئازار و ناخۆشیان نەبینیبوو. ئەوانەی لە زەوییەوە هاتبوون، ئازاری خۆیان و خەڵکییان زۆر بینیبوو. بەپەلە دەیانویست یەکێک لە نموونەی ژیانەکان هەڵبگرنەوە. لەبەرئەوەی هەڵگرتنەوەی نموونەی ژیانەکان بە بەختیانەوە گرێ درابوو. زۆریان چاکە و خراپەکانیان لەگەڵ یەکدیدا دەگۆڕییەوە. ئەگەر یەکێک لەو گیانانە لە نموونەی ژیانەکەی هەڵیدەگرێتەوە فەلسەفەی تێدا نەبێت، بەڵام، کە بۆ زەوی دەگەڕێتەوە فەلسەفە بخوێنێت، بەگوێرەی ڕاپۆرتەکەی ئێر، ژیانی لەسەر زەوی و گەشتەکەشی دوای مردن بەرەو بەهەشت سەخت و درێژخایەن نابێت.

ئێر دەڵێت، بەو جۆرەی گیانەکان نموونەکانیان هەڵدەگرتەوە. سەیر بوو، بەزەییت پیایاندا دەهاتەوە و شایەنی سەیرکردنیش بوو! هەڵبژاردنەکەیان گەلێک پەیوەندی بە چۆنیەتی ژیانی پێشوویانەوە هەبوو. بۆ نموونە، ئێر دەیگێڕێتەوە، کە یەکێک لە شوێنکەوتووانی ئایینی ئۆرفیۆسی بینیوە، ژیانی مراوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. لەبەرئەوەی بە دەستی ژن کوژرابوو، ڕقی لە ژن بوو. هەروەها حەزی نەدەکرد لە ژنەوە پەیدا بێت. تامیرسی بینیبوو ژیانی بولبولی هەڵبژاردوە67.گیانی

ئاجاکسی کوڕی تیلامۆن، ژیانی شێری هەڵگرتبوو68. ئاجاکس لەبەر چەکەکەی (ئەخیلس) نەیویست لە شێوەی مرۆڤدا بۆ ژیان بگەڕێتەوە. گیانێکی دیکە، ئاگامەمنون بوو، کە لەبەر ئازار و ئەشکەنجەکانی ژیانی ڕقی لە ڕەگەزی مرۆڤ بوو. لەبەرئەوە ژیانی هەڵۆی هەڵبژارد. ئەتەلەنتا ژیانێکی مامناوەندی بەرکەوتبوو69. دوای ئەو ئێر گیانی ئێپێوسی کوڕی پانۆپیوسی بینیوە، کە ژیانی خاتوونێکی خاوەن پیشە و بەهرەی هەڵگرتووە70. دواجاریش تێرستیسی بینیوە، کە حەزی کردووە ببێت بە مەیمون71. هەروەها ئۆدیساش هاتبوو تاکو جۆرێک لە نموونەی ژیانەکان هەڵبژێرێت، بەڵام خەم و ئازاری ژیانی پێشووی ڕێگەی نەدابوو زوو بڕیار بدات. بەدوای ژیانی سادەی یەکێکدا گەڕابوو، کە خۆی کارەکانی خۆی دەکات. لە سووچێکدا ئەو ژیانەی دۆزیبۆوە و هەڵیگرتبۆوە، چونکە کەس پێی ڕازی نەبوو.

گیانەکان بە ڕیز و بەگوێرەی هەڵبژاردنەکانیان چوونە بەردەم لاچیسس. ئەویش بۆ هەر یەکێک لەو گیانانە فریشتەیەکی کرد بە پاسەوان. فریشتەکە ئەو گیانەی بۆ لای کلۆتۆ دەبرد. کلۆتۆش دەیخستە نێو تەوقە سوڕاوەکەوە و ڕەوانەی ئەترۆپۆسی دەکردن. ئەویش ژیانەکەی بۆ دواجار بە بێ گەڕانەوە و گۆڕان دادەنا و دەیناردنە ژێر تەختی پێداویستییەوە.

پاش ئەمە بەنێو گەرمیەکی سەخت و ئازارێکی لەبیرنەچوو، بە بیابانێکی وشکدا تێدەپەڕین، تاکو دەگەیشتنە کەناری ڕووباری (بێ چارەسەری)، کە هیچ گۆزەیەک ئاوەکەی هەڵنەدەگرت. بۆ شەوێک لەوێ دەمانەوە. هەریەکێک لە ئەوان دەبووایە بەگوێرەی خۆی ئاو لەو ڕووبارە بخواتەوە.

ئەوانەی کەمژیر بوون زۆریان لە ئاوەکە خواردەوە، هەموو شتێکیان لەبیر چووەوە و خەوتن. لە نیوەشەودا هەورەبرووسکەیەکی زۆر لە ئاسماندا و بوومەلەرزەیەکی سەختیش ڕوویدا. لەوێوە بەخێرایی کشانی ئەستێرەیەک بردیاننە بەردەم ئەو ساتەی لەدایک دەبن. ئێر لەو ئاوەی نەخواردەوەو نەیزانی چۆن گیانی بۆ نێو لاشەکەی گەڕاوەتەوە. کە چاوی کردەوە خۆی لەنێو تابووتە دانراوەکەدا بینی.

گلاوکۆن، چیرۆکەکەی ئێر، تاکو ئەمڕۆ ماوەتەوە. ئێمەش لە زۆر شت ڕزگار دەکات ئەگەر بەوردی گوێی لێبگرین، بەئاسانی لە ڕووباری لێبوردن دەپەڕینەوەو گیانمان تووشی گەندەڵی نابێت. ئەگەر بە بۆچوونەکەم ڕازی بیت دەگەیتە ئەو باوەڕەی گیان نەمرە و بەرگەی هەموو چاکە و خراپەیەک دەگرێت. دادوەرانە دەژی و ژیرانە ڕوو لە سەرەوە دەکات. بەم شێوەیە، لەم ژیانە و ژیانی دوای مردنیش دەبین بە هاوڕێی یەکدی و خواکان، وەکو براوە و سەرکەوتووەکان خەڵاتەکانمان وەردەگرین. لەم ژیانە و لەو گەشتە هەزار ساڵەی باسمان کرد چاک و بەختەوەرانە دەژین.



# پەراوێز: – (Footnotes)

1 – ئەمە گوتەیەکی هایدیگەرە لە نووسراوەکەی هایدیگەرەوە بەناوی (پێشەکییەک بۆ مێتافیزیک) دەرم هێناوە. (وەرگێڕ)

A . E. Taylor. Plato: the Man and his Work, London: Methuen, 1960. pp. 1– 2

2 – ئەم دوو برایەی ئەفلاتوون لە دایەلۆگی کۆماردا بەرانبەر سوکرات دانیشتوون و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەن

Frederick Copleston. A History of Philosophy, vol.1, New York: Image Books, 1993. Pp. 128– 29, and see: Richard Kraut. "Iutroduction to Study of Plato'', in The Cambridge Companion to Plato, (ed.) Richard Kraut, Cambridge: Cambridge University Press, 1999. P. 38.

3 – A . E. Taylor. Plato:The Man and His Work, p.7

4 – A . E. Taylor. Plato:The Man and His Work, p.8, and see: Frederic Copleston. A History of Philosophy, vol. 1, p. 132 .

5 – مەبەست لەم خاتوو خوایە (بێندس)ە، کە باوەڕکەرەکانی تازە لەو شارۆچکەیەدا (پیرایۆس) سەریان هەڵدابوو. پیرایۆس شارۆچکەیەکی سەر دەریای نزیک ئەسینا بووە. (وەرگێڕ)

6 – مەبەست لەو شاعیرانە تەنیا (هۆمیرۆس)ە، کە ئەم گوتەیەی لە هەردوو بەرهەمەکەیدا ئیلیادە و ئۆدیسەدا هەیە. (وەرگێڕ)

7 – ئەوانەی لە یەکدی دەچن خوا کۆیان دەکاتەوە، گوتەیەکی هۆمیرۆسە. بڕوانە (وەرگێڕ) Odyssey. xvii. 218

8 – سۆفۆکلس (406 – 496 پ ز) نووسەری شانۆگەری یۆنانیە. لە شانۆگەرییە بەناوبانگەکانی ئەمانەن: ئۆدیبی پاشا، ئەنتیگۆن و ئۆدیب لە کۆلۆنس. (وەرگێڕ)

9 – هادیس وشەیەکی یۆنانییە، بۆ ئەو شوێنە بەکاردێت، کە گوایە گیانی مردووەکان تیایدا دادەنرێن، تاکو دادگاییان دەکرێت. لە هەندێک ئـەدەب و بیروباوەڕی سۆفیگەریدا بە دونیای بەرزەخ ناوزەد کراوە. (وەرگێڕ)
10 – پیندار شاعیر و مۆسیقازانی یۆنانییە، لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا لە خێزانێکی ئەرستۆکراتی سەر بە شاری سپارتا هاتۆتە دنیاوە و ژیاوە. زۆربەی هۆنراوەکانی ون بوون. (وەرگێڕ)
11 – سیمۆندیس (468-548 پ ز) شاعیرێکی یۆنانیە، لە دوورگەی (ئەیگیان) لە سیمۆس لەدایک بووە.
12 – ئەم یارییە کۆنەی یۆنانیەکان ناوی (chechers) لەسەر تەختەیە دەکرێت و هەر یەکێک لە دوو یاریزانەکە دوانزە پارچە بەرد دادەنێت. من وشەی (دامە)م بۆ داناوە، چونکە لە یاری (دامە)وە نزیکەو هاوکات ناوەڕۆکی نووسینەکەی ئەفلاتوون ناگۆڕێت. (وەرگێڕ)
13 – هۆمەر، یان هۆمیرۆسی شاعیری یۆنانی لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا ژیاوە. ئەم شاعیرە، هەردوو چاوی کوێر بووە. لە ڕێگەی هۆنراوەکانیەوە زۆربەی داستان و چیرۆکە ئەفسانەییەکان و مێژووی کۆنی یۆنانمان پێگەیشتوون. دوو بەرهەمە شاکارەکەی، ئەلیادو ئۆدیسە، تاکو ئەمڕۆ ماونەتەوە. (وەرگێڕ).
14 – پێریاندەر و پێردیکاس و زێرزێکس. سێ دیکتاتۆری بێ بەزەیی یۆنان بوون و ئیسمیناسیش دەوڵەمەندێکی گەورە بووە. (وەرگێڕ)
15 – هیراکلیس، پاڵەوانێکی نێو ئەفسانەی یۆنانییە. کوڕی زیۆس و ئازاترین پاڵەوان بووە. دواجار ڕۆمانەکان ناوەکەیان بۆ هەرکلیس گۆڕیوە. (وەرگێڕ)
16 – لێرەدا ئەفلاتوون لە جێگەی وڵات، یان داگیرکردنی وڵاتێک لەلایەن وڵاتێکی دیکەوە "شـار" ی بەکارهێناوە، چونکە لە یۆنان شارێک دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووە. (وەرگێڕ)
17 – ئەفلاتوون باسی دامەزرێنەری دەوڵەتی لیدیا دەکات، کە بەشێک بووە لە یۆنانی کۆن و دەکەوێتە ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆوە. ئەم دەوڵەتە لە ساڵی (678 پ ز) لەلایەن چەند خێڵێکی کۆچەری جەنگاوەرەوە ڕووخێنراوە. هیرۆدۆتسی هالیکارناسۆس لە پەرتووکەکەیدا (مێژووەکان) بەدرێژی باسی کردوە. (وەرگێ ڕ)
18 – ئەسخیلۆس (400-524 پ ز) نووسەرێکی شانۆگەری یۆنانی کۆنە، بە دامەزرێنەری شانۆگەری تراجیدی ناسراوە. جەنگی نێوان فارسەکان و یۆنانیەکان، کە لە سەردەمی ئەسخیلۆسدا دەستی پێکردوە، کاریکردۆتە سەر نووسینەکانی. (وەرگێڕ)
19 – موسایۆس خواناس و داهاتووبینێکی نێو ئەفسانەی یۆنانییە. گوایە کوڕی ئۆرفیۆس بووە. هۆنراوەی ئایینی نووسیوە. (وەرگێڕ)
20 – پارچەیەک هـۆنـراوەی هۆمیرۆسە لە پەرتووکی ئیلیاد وەرگیراوە.

(وەرگێڕ)
21 – ئۆرفیۆس یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی یۆنانی کۆن و دامەزرێنەری نەریتی ئایینی ئۆرفیۆسی. هەروەها بە باشترین شاعیر و مۆسیقازانی سەردەمی کلاسیکی یۆنان ناسراوە و توانیویەتی داهاتوو ببینێت و جادووش بکات. (وەرگێڕ)
22 – لێرەدا ئەو زانایەی گلاوکۆن باسی دەکات سیمۆندیسی شاعیرە.
23 – ئەرخیلۆخۆس (716–756 پ ز)، شاعیرێکی یۆنانییە و لە هۆنراوەکانیدا بە زمانی ئاژەڵەکان دەدوێت. (وەرگێڕ)
24 – هیرا یەکێکە لە دوانزە خواکانی نێو چیای ئۆڵەمپیک و هاوسەری زیۆس. یۆنانیەکان بە خوای هاوسەربوون و منداڵبوون دایانناوە. (وەرگێڕ)
25 – هیفاستۆس یەکێکە لە دوانزە خواکانی نێو چیای ئۆڵەمپیک. یۆنانیەکان بە خوای ئاگر و ئاسنگەرییان داناوە. کوڕی هیرایە، بەڵام دڵنیا نین لەوەی کوڕی زیۆس بووبێت. لەبەرئەوەی بە ئیفلیجی لەدایک بووە، هیرای دایکی فڕاندویەتی و شاردویەتیەوە. (وەرگێڕ)
26 – "شار" لەم بەستێنەوە تەنیا واتای "شوێن" بۆ جێنشین بوون نابەخشێت و دەوڵەتیش دەگرێتەوە. لە هەندێک وەرگێڕاوی تردا بە زمانی ئینگلیزی وشەی (دەوڵەت) لەبری (شار) دانراوە. ئەمەش بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە، کە لە سەردەمی کۆنی یۆناندا هەر یەکێک لە شارەکان دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووە. (وەرگێڕ)
27 – لە ئەفسانەی یۆنانیدا کۆکیتوس و ستیکس ناوی دوو ڕووبارن لە دونیای ژێرەوەدا، یان نێو دۆزەخن. کۆکیتوس ڕووباری خەم و خەفەتە. ستیکسیش ڕووباری ڕق و کینەیە. (وەرگێڕ)
28 – ئەم پارچە هۆنراوانەی ئەفلاتوون لەم بەشەدا ئاماژەیان بۆ دەکات لە دوو پەرتووکەکەی هۆمیرۆسەوە (ئیلیاد و ئۆدیسەوە) وەرگیراون. من بۆیە ژمارەی لاپەرەکانی ئەم دوو سەرچاوەیەم دانەناوە، چونکە مەبەستی ئەفلاتوون ڕوونکردنەوەی شێوازی ناوەڕۆکی ئەو هۆنراوانەیە، یان بیروباوەڕەکەیەتی، کە دەیەوێت لە کۆمارەکەدا سانسۆری بکات. گرنگ نییە هۆنراوەکان یان جۆری شیعر و نووسینەکان بەرهەمی چ نووسەرێک بن. ئەو دژی ناوەڕۆکی ئەو ئەدەبە ڕادەوەستێت. (وەرگێڕ)
29 – بڕوانە ئیلیادی هۆمیرۆس (15–16).
30 – ئەسکلیپیادس خواوەندی پزیشکی گوایە کوڕی ئەپۆلۆ بووە. زیۆسی گەورە خواوەند لەوە ترساوە ئەسکلیپیادس بە دەرمان ژیانی هەمیشەیی بۆ مرۆڤ دروست بکات. لەبەرئەوە بە هەورەبرووسکە کوشتویەتی. هۆمیرۆس لە ئیلیادەدا وەکو پزیشکێکی بلیمەت ناوی هێناوە. یۆنانییەکان پلەی خوایەتییان لە ئەفسانەکانیاندا داوەتێ. (وەرگێڕ)
31 – فۆسیلیدس لە ناوەڕاستی سەدەی شەشی پێش زایینداژیاوە. شاعیری لاوانەوەی یۆنانە و بەو شاعیرەش ناسراوە، کە هۆنراوەی گاڵتەی هۆنیوەتەوە.

(وەرگێڕ)
32 – ئەفلاتوون لە بەشی هەشتەمی ئەم دایەلۆگەدا باسی خەسڵەتەکانی شاری خراپ دەکات. لێرەدا تەنیا ئاماژەی بۆ کردووە. (وەرگێڕ)
33 – لە سەردەمی کۆنی یۆناندا بە بۆچوونی یۆنانییەکان ئەوەی یۆنانی نەبووبێت خاوەنی شارستانیەت نەبووە و بە نەزان و بەربەری دانراوە. (وەرگێڕ)
34 – ئەمە دێڕی هۆنراوەیەکی هۆمیرۆسە، ئەفلاتوون لە ئۆدیسەوە وەریگرتووە.
35 – هیدرا دێوێکی نێو ئەفسانەی یۆنانییە. گوایە، کە سەری ببڕی، دوو سێ سەری دیکە لە جێگەی دەڕوێنەوە. (وەرگێڕ)
36 – ئەفلاتوون مەبەستی ئەپۆلۆیە، کە لەنێو پەرستگای دێلفیدا پەیکەرێکی بۆ کراوە لەسەر تاشەبەردێک دانیشتووە. هەروەها یۆنانیەکان لەو باوەڕەدا بوون ئەو پەرستگایە لە ناوەڕاستی جیهاندایە. (وەرگێڕ)
37 – ئەفلاتوون سێ چینی کۆمەڵی بەگوێرەی دابەشکردنی کارکردن و پیشەکان بەسەریاندا داناوە: فەرمانڕەواکان، پاسەوانەکان و کارکەران. چینی سێیەم لە دوو چینەکەی دیکە بە ژمارە گەورەترە، چونکە هەموو دەستە و تاقمی بازرگان و کرێکاران و جووتیاران دەگرێتەوە. (وەگێڕ)
38 – حەزدەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەم لێرەدا ئەفلاتوون جۆرێک لە سەلماندنی لۆجیکمەندانەی بەکارهێناوە، کە لەدواییدا ئەریستۆ بە سیلۆجیزم ناوزەدی کردووە. ئەم سەلماندنانە لە سێ دەستەواژە پێکهاتووە: پێشەکی یەکەم، دەستەواژەیەکی هەمەکییە و پێشەکی دووەم و ئاکامەکەیان. (وەرگێڕ)
39 – پیتیا، ژنە سەرۆکی ئایینی سەر بە خوداوەندی ئەپۆلۆیە، لە پەرستگای دێلفی ژیاوە. (وەرگێڕ)
40 – حەزدەکەم جارێکی دیکە خوێنەر بزانێت ئەفلاتوون زاراوەی شار بۆ دەوڵەتیش بەکاردەهێنێت، چونکە لە یۆنانی کۆندا شار دەوڵەت بووە. (وەرگێڕ)
41 – مۆموس کەسێکی گلەییکەر و سەرزەنشتکەرە. (وەرگێڕ)
42 – دایۆمیدس کوڕی (ئارس)ی خوداوەندی جەنگ و پاشای تراسیان بووە. لە ئەفسانەی یۆنانییدا ئەم قارەمانە گوایە چەند ماینێکی هەبووە، کە لەسەر گۆشتی مرۆڤ ژیاون. (وەرگێڕ)
43 – ئەفلاتوون فەیلەسووفە سۆفیستەکان، وەکو پرۆتاگۆراس و جۆرجیاس بەم شێوەیە پێناس دەکات. سۆفیستەکان بە فەیلەسووفی ناڕەسەن دادەنێت، کە شیاوی ئەوە نین بە فەیلەسووف ناوزەد بکرێن و لاوانیش فێری فەلسەفە بکەن. ئەمەش پەیوەندی بە بۆچوونی ئەفلاتوون بۆ فەلسەفە و پێناسەی فەلسەفە و بابەتی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەوە هەیە، کە لە بۆچوونی سۆفیستەکانەوە جیاوازە. (وەرگێڕ)

44 – ئەفلاتوون لە دایەلۆگی ستایشدا (ئەپۆلۆجی 31–32) باسی ئەوە دەکات، کە دێو، یان هێزێکی نادیار سوکراتی لە ڕامیـاری دوورخستۆتەوە. (وەرگێڕ)

45 – ئەفلاتوون چەند زاراوەیەکی، وەکو بیرکردنەوە، تێگەیشتن و هۆش لەم بەشەدا بەکارهێناوە. ئەم زاراوانە یەک واتایان هەیە. بۆ ئەفلاتوون لایەنی هۆشەکی دەروونە، کە لە هەستکردنەوە جیاوازە. (وەرگێڕ)

46 – حـەزدەکـەم ئـەو خاڵە ڕوون بکەمەوە، کە پاش مردنی ئەفلاتوون خوێندکارەکانی ئەکادیمیا بایەخی زۆریان بە زانستەکانی ژمێریاری و ئەندازیاری دا. بەجۆرێک کە کێشە فەلسەفیەکانی دیکە خرانە پەراوێزەوە. ئەمە یەکێک بوو لەو هۆیانەی وای لە ئەرستۆ کرد ئەکادیمیا جێبهێڵێت و بیر لە دامەزراندنی فێرگەیەکی نوێ بۆ فەلسەفە بکاتەوە. (وەرگێڕ)

47 – پیتاگۆراسییەکان شوێنکەوتووانی پیتاگۆراسی فەیلەسووفی یۆنانین لە (500 – 570 پ ز) ژیاون. ئەم فەیلەسووفە هەوڵی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی لەسەر بنەماکانی فەلسەفە، زانست، هونەر و ڕەوشت داوە. لە شاری کرۆتۆن بۆ ساڵێک فەرمانڕەوایی کردووە. (وەرگێڕ)

48 – لێرەدا ئەفلاتوون ڕەخنە لە پیتاگۆراسییەکان دەگرێت. لەو باوەڕەدایە ئەوانیش وەکو ئەستێرەناسەکان مامەڵە لەگەڵ ژمارەدا دەکەن، بەڵام نەیانتوانیوە ئەم زانستە بە دروستی بۆ ژوورخستنی دەروون بەرەو جیهانی بەرز بەکاربهێنن و ئەو جیهانە لە ڕێگەی ئەو زانستەوە بە دەروون ئاشنا بکەن. (وەرگێڕ)

49 – ئەفلاتوون زاراوەی (منداڵی زۆڵ)ی بۆ ئەو کەسە بەکارهێناوە، کە بە سروشت توانای بیرکردنەوەی هۆشەکی نییە، بێ بەهرەیە و پەلاماری خوێندنی فەلسەفە دەدات. (وەرگێڕ)

50 – سۆلۆن (560 – 640 پ ز) زانایەکی ڕامیاری و یاساسازکەر و شاعیرێکی یۆنانییە لە شاری ئەسینا ژیاوە. (وەرگێڕ)

51 – مەبەستی ئەفلاتوون دەستووری سپارتایە. لە هەندێک وەرگێڕاندا ئەم دوو شارە بە کریت و سپارتا دانراون. (وەرگێڕ)

52 – لە هەندێک وەرگێڕاندا ئەم فۆرمە بە تیمۆکراسی(Timocracy) ناوزەد کراوە.

ئـەم جـۆرە ڕژێـمـە لـەلایـەن کـەسـانی دەوڵـەمـەنـدەوە دامـەزرێـنـراوە، کە ئارەزوومەندی ڕیزلێنانن. زاراوەی (تیمۆ) لە زمانی یۆنانیدا واتای ڕێز، یان بەها دەبەخشێت. ئەم جۆرە ڕژێمە لە ئەرستۆکراتیەوە (دەسەڵاتی ئەوانەی بە موڵک و خێزان بە چاکترین دادەنرێن) و ئۆلیگارکی (ڕژێمی کەمایەتی)یەوە نزیکە. (وە رگێڕ)

53 – (موساس)ەکان لە ئەفسانەی یۆنانیدا دەستەیەک خاتوو خواوەند بوون، کە ژمارەیان دەگاتە نۆ. هزیۆدی شاعیر ناوی هەموویانی داوە. گوایە ئەم خاتوو خوایانە هەمیشە بە کچی ماونەتەوە و شوویان نەکردوە، بەڵام هەندێکجار

ئۆرفیۆس بە منداڵی یەکێک لەم موساسانە دادەنرێت. (وەرگێڕ)
54 – مەبەست لە باوکی نەوەکەی پێشووترە، کە فەرمانڕەوایی دەکات، چونکە ئەفلاتوون باوەڕی بە چەمکی باوکایەتی  بەو جۆرەی لە خێزاندا بەکاردێت نییە. (وەرگێڕ)
55 – لە ئەفسانەی یۆنانیدا پلوتۆس، کە خوای موڵک و پارەیە، کوێرە. ئەفلاتوون ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ئەم خوایە دەکات. (وەرگێڕ)
56 – ئەسخیلۆس (525 – 456 پ ز) نووسەرێکی شانۆگەری تراجیدی یۆنانییە، نزیکەی نەوەد شانۆگەری نووسیوە، بەڵام تەنیا حەوت دانەیان ماونەتەوە. لە شاری ئیلیوسیس لەدایک بووە و لە سیسلی مردوە. لە جەنگی نێوان یۆنانییەکان و فارسەکاندا بەشداری کردووە. (وەرگێڕ)
57   – ئیورپیپدس (406 – 484   پ ز) شانۆگەرنووسێکی یۆنانییە. گوایە نەوەدو دوو شانۆگەری نووسیوە، بەڵام تەنیا هەڤدە دانەیان ماونەتەوە. بەپێچەوانەی ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیسەوە بۆچوونەکانی ئەم نووسەرە پڕن لە گومان و ڕەخنە بەرانبەر کەلتوور و  ئەفسانە یۆنانییەکان. (وەرگێڕ)
58 – مەبەست لە (کوڕی ئەریستون) گلاوکۆنی برای ئەفلاتوونە و ئەریستون باوکی ئەفلاتوونیشە. گفتوگۆی سوکرات لەسەر ئەم کێشەیە لەم قۆناغی دایەلۆگەدا لەگەڵ گلاوکۆندایە. (وەرگێڕ)
59 – ئێریفیل بە ملوانکەیەک مێردەکەی ڕازی کرد لەگەڵ حەوت کەسەکەدا دژی شاری (تیبس) ڕاوەستێت و لەو جەنگەدا کوژرا. بڕوانە: چیرۆکی ئۆدیسای هۆمیرۆس –326 26. (وەرگێڕ)
60  – هۆمەریدەکان ئەو کەسانە بوون بە شارەکانی یۆناندا گەڕاون و هۆنراوەکانی هۆمیرۆسیان بۆ خەڵک خوێندۆتەوە. (وەرگێڕ)
61 – تالیس لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا ژیاوە و بە یەکەم فەیلەسووفی یۆنانی و دانەری فەلسەفەی ڕۆژئاوا دادەنرێت. گوایە یەکێک بووە لە حەوت زاناکانی یۆنان. ئاوی بە بنەڕەتی بوون و گۆڕان داناوە. ئەنەکارسیس، کە هاوسەردەمی تالیسە، بە دامەزرێنەری زانستی ئەندازیای یۆنانیەکان دادەنرێت. (وەرگێڕ)
62 – پیتاگۆرس (495 – 570 پ ز) بە ناودارترین فەیلەسووفی یۆنانی پێش سەردەمی سوکرات دادەنرێت. لە تەمەنی بیستساڵیدا لە دوورگەی سامۆسەوە ڕوویکردۆتە شاری کرۆتۆن. لەوێ کۆمەڵێکی فەلسەفی و ڕەوشتی دامەزراندوە. ژمارەیەکی زۆر لە لاوان شوێنی کەوتوون.  (وەرگێڕ)
63 –  پرۆتاگۆراسی ئەبدیرا (420 – 490 پ ز) ناودارترین فەیلەسووفی سەفسەتییە و بەو گوتەیە ناسراوە، کە "مرۆڤ پێوەری هەموو شتەکانە." و لەو باوەڕەشدا بووە مرۆڤ لەبەرئەوەی دەسەڵاتی زانینی سنووردارە، هیچ لەبارەی بوونی خواوە نازانێت.

پرۆدیسیۆسی سیۆس، فەیلەسووفێکی دیکەی سەر بە فێرگەی سەفسەتەیە، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینیدا ژیاوە. ماوەیەک کاری دیبلۆماسی پێ دراوە. باوەڕی بە بوونی سروشت هەبووە و هەموو شتێکی سوودبەخشی بە خواوەند داناوە. (وەرگێڕ)

64 – لە ئەفسانەی یۆنانییدا مستیلەکەی گیگس و کڵاوەکەی هادیس باس کراون. هەرکەسێک ئەم مستیلەیەی لە پەنجە کردبێت، یان کڵاوەکەی لەسەر کردبێت، نەبینراوەو توانیویەتی هەموو شتێک بکات. (وەرگێڕ)

65 – ئەم ڕووداوە هۆمیرۆس لە (ئۆدیسا)دا باسی کردووە، بە داستانی ئەلکینۆس ناسراوە. ئەفلاتوون لەم چیرۆکەوە دەیەوێت باسی خەڵات و سزادانی خواکان پاش مردن بکات. ئەم بیروباوەڕە لە ئایینی سامییەکاندا بووە بە یەکێک لە بنەڕەتەکانی بڕوا. (وەرگێڕ)

66 – ئەردیۆس فەرمانڕەوایەکی زۆرداری یۆنانی بووە. باوک و براکەی خۆی بۆ دەسەڵات کوشتووە. (وەرگێڕ)

67 – تامیرس لە ئەفسانەی یۆنانییدا شاعیر و گۆرانیبێژێکی دەنگخۆش بووە. لەو باوەڕەدا بووە لە گۆرانیگوتندا دەتوانێت لە میسۆسەکان بەرێتەوە. لەبەرئەمە میسۆسەکان دەنگیان لێ سەند و چاویشیان کوێر کرد. (وەرگێڕ)

68 – ئاجاکسی کوڕی تیلامۆن قارەمانێکی ئەفسانەی یۆنانییە. کاتێک ئەخیلس کوژرا، ویستی چەکەکەی بۆ خۆی بەرێت، بەڵام بەپێچەوانەی حەز و ئارەزووی ئەوەوە، چەکەکە بە خەڵات بە ئۆدیسا درا. دوای ئەمە ئاجاکس شێت دەبێت و خۆی دەکوژێت. (وەرگێڕ)

69 – ئەتەلەنتا لە ئەفسانەی یۆنانییدا خاتوو ڕاوکەرە. بڕیاری داوە هاوسەری ئەو پیاوە بکات، کە دەتوانێت لە پێشبڕکێی ڕاکردندا لێی بباتەوە. ئەوەی نەتوانێت دەیکوژێت. (وەرگێڕ)

70 – ئێپیۆس کوڕی پانۆپیۆس لە ئۆدیسەی هۆمیرۆسدا باس کراوە. گوایە ئەو یارمەتی ئەسینای داوە ئەسپەکەی ترۆجان لە تەختە و دار دروست بکەن. (وەرگێڕ)

71 – تێرستیس یەکێکە لەو سەربازانەی لە ئیلیادی هۆمیرۆسدا ڕەخنە لە ئاگامەمنون دەگرێت. (وەرگێڕ)



